وَمَا يَنطِقُ عَنِ ٱلْهَوَىٰٓ ﴿٣﴾ إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْىٌ يُوحَىٰ ﴿٤﴾

# موعجیزە بەناوبانگەکانی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم







ئامادەکردنی
عەبدولڕەزاق ڕەزاق ئەحمەد

چاپی دووەم

٢٠١٦ز ١٤٣٧ك

# موعجيزە

## بەناو بانگەکانی پێغەمبەر (ﷺ)

(٣٠٠)موعجیزە لە موعجیزە گەورە و

بەناوبانگەکانی پێغەمبەر (ﷺ)

ئامادەکردنی :

عەبدولڕەزاق ڕەزاق ئەحمد

چاپی دووەم

١٤٣٧ك ٢٠١٦ زاینی

بسم الله الرحمن الرحيم

* ناوی کتێب : موعجیزه بەناوبانگەکانی پێغەمبەر( ﷺ )
* ئامادەکردنی : عەبدولڕەزاق ڕەزاق ئەحمەد
* ساڵی چاپ : ١٤٣٧- ٢٠١٦
* نۆرەی چاپ : دووەم
* شوێنی چاپ : هەولێر ـ هەرێمی کوردستان
* چاپخانە : هیڤی
* نووسینی کۆمپیوتەر : حمید رسول حمدامین ( سینا کۆمپیوتەر-رانیە)
* هەڵەچن : ڕێبوار علی همزه.
* ژمارەی سپاردن : ٦٩٢
* تیراژ : ١٠٠٠ دانە

## لە تایبەتمەندیەکانی ئەم کتێبە :

یەکەم : پێکهاتووە لە ٣٠٠ موعجیزە لە موعجیزە گەورە و بەناوبانگەکانی پێغەمبەر( ﷺ ).

دووەم هەر یەکێك لەو موعجیزانە خۆی لەخۆیدا گەورەترین بەڵگەو نیشانەیە لەسەر ڕاستی و درووستی پێغەمبەرایەتی ئەم پێغەمبەرە پایەدارە ( ﷺ ).

سێیەم : مژدەدەر و دڵنیایی بەخشە بە دڵ و دەروونی بڕواداران.

چوارەم : بەڵگەیەکی ئێجگار گەورە و پتەوە بۆ ئەوانەی کە لە ڕێبازی ئەم پێغەمبەرە( ﷺ ) دوورن ڕەوێنەرەوەی گومان و دوو دڵی ناو دڵەکانیانە .

## لە بەرهەمە جوانەکانی موعجیزە:-

**یەکەم : بۆ ئەوەی بڕوای بڕواداران زیاد بکا**
**دووەم : یارمەتیدان و سەرخستنی پێغەمبەر( ﷺ )**
**سێیەم : بۆ ئەوەی هەموو خەڵك ئەوە بزانێ کە موحەممەد پێغەمبەری خوایە بە هەق و ڕاستی**
**چوارەم : وە بۆ بانگکردنی غەیری موسڵمانان تا بڕوا بێنن بە پێغەمبەرایەتی پێغەمبەرمان( ﷺ ) ئەوەش بۆ وەڵام دانەوەی ووتەی خوای گەورە کە لە قورئانە پیرۆزەکەیدا فەرموویەتی**

﴿إِنَّآ أَرۡسَلۡنَٰكَ شَٰهِدٗا وَمُبَشِّرٗا وَنَذِيرٗا ۝٨ لِّتُؤۡمِنُواْ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَتُعَزِّرُوهُ وَتُوَقِّرُوهُ وَتُسَبِّحُوهُ بُكۡرَةٗ وَأَصِيلًا ۝٩﴾ الفتح ( ٨ – ٩ )

**واتە: بەڕاستی ئەی موحەممەد ( ﷺ ) تۆمان ناردووە بەشایەت و مۆژدەدەر و ترسێنەر بۆ ئەوەی باوەڕ بە خواو پێغەمبەرەکەی بێنن و وەپشتیوانی لێ بکەن و ڕێزی لێ بگرن وەتەسبیحاتی خوا بکەن بەبەیانیان و ئێوارانداا**

# خوێنەری بەڕێز :

لەم کتێبەدا ۳۰۰ موعجیزە لە موعجیزە گەورەو بەناوبانگەکانی پێغەمبەری ئیسلام موحەممەد (ﷺ) خراونەتە ڕوو لە چەندین بواری جۆراوجۆردا کەهەر یەکێك لەو موعجیزانە خۆی لەخۆیدا گەورەترین بەڵگەو نیشانەیە لەسەر ڕاستی و درووستی پێغەمبەرایەتی ئەم پێغەمبەرە پایەدارە (ﷺ) جا هیوادارم ئەم موعجیزانە زیاتر ببنە مایەی دڵخۆش بوون و پتەوبوونی بڕوای بڕواداران وەبەڵگەیەکی زۆر گەورەش بن بۆ ئەو کەسانەی کەلە ڕێبازی ئەم پێغەمبەرە دوورن ببنە هۆی ڕەواندنەوەی گومانی ناو دڵەکانیان و ئاشنابوونیان بە ڕێبازی سەرفرازی و بەختەوەری ئایینی پاکی ئیسلام

# بەناوی خوای گەورەو میهرەبان

درووود بۆگیانی پێغەمبەرمان موحەممەد (ﷺ) وەشوێن کەوتووانی بەگشتی تا ڕۆژی دوایی، پێغەمبەران کە خوای گەورە ناردوونی بۆ بەرەی مرۆڤایەتی بۆ ئەوەی ئاشنایان بکەن بەڕێبازی سەرفرازی و بەختەوەری. خوای گەورە بەڵگەو نیشانەو موعجیزەی گەورەشی پێ بەخشیوون تاوەکو ببنە مایەی دڵنیایی بۆ خەڵك و گەورەترین بەڵگەشن بۆ ڕاستی و دروستی ئەو پەیام و بەرنامەیەی کەئەو پێغەمبەرانە ڕای دەگەیەنن، جا پێغەمبەری ئیسلامیش (ﷺ) کە کۆتا پێغەمبەرە کە خوای گەورە ناردوویەتی بۆ هەموو مرۆڤایەتی بەگشتی وە لەدوای ئەو هیچ پێغەمبەری تر نایەن جا بۆیە خوای گەورە چەندەها موعجیزەی گەورەو ناوداری بەخشیوە بەو پێغەمبەرە هەموو یەکێك لەو موعجیزانە خۆی لەخۆیدا گەورەترین بەڵگەو نیشانەن لەسەر ڕاست و دروستی پەیامی ئەو پێغەمبەرە پایەدارە، وە خوای گەورە گەورەترین کتێبی خۆشی کە قورئانی پیرۆزە ناردوویەتی بۆ ئەو پێغەمبەرە (ﷺ) کە پڕە لەموعجیزەی گەورە و پایەدار، وە هەموو ووشەو ئایەت و سوڕەتێکی ئەو قورئانە موعجیزەیەو سەلمێنەری ئەو ڕاستی یە گەورەیە کە خاوەنی ئەو قورئانە خوای زاناو کاربەجێ یە ئەم قورئانە هەواڵ دەدات لەچەندەها ڕووداوی گەورە کەوەك ڕۆ ژی ڕووناك ڕاست و دروستی قورئان دەسەلمێنن کە خوا خاوەنیەتی و ناردوویەتی بۆ پێغەمبەری ئیسلام تاکو

ببێتە گەورەترین موعجیزە بۆ ئەو پەیامەی کەئەو پێغەمبەرە رای دەگەیەنێت،بە پشتیوانی خوای گەورە چەند نموونەیەك لەو بارەوە باس دەکەین:

قورئان دەفەرمووێ: ﴿ وَمَا تَأْتِيهِم مِّنْ ءَايَةٍ مِّنْ ءَايَٰتِ رَبِّهِمْ إِلَّا كَانُوا۟ عَنْهَا مُعْرِضِينَ ۝٤ فَقَدْ كَذَّبُوا۟ بِٱلْحَقِّ لَمَّا جَآءَهُمْ ۖ فَسَوْفَ يَأْتِيهِمْ أَنۢبَٰٓؤُا۟ مَا كَانُوا۟ بِهِۦ يَسْتَهْزِءُونَ ۝٥ أَلَمْ يَرَوْا۟ كَمْ أَهْلَكْنَا مِن قَبْلِهِم مِّن قَرْنٍ مَّكَّنَّٰهُمْ فِى ٱلْأَرْضِ مَا لَمْ نُمَكِّن لَّكُمْ وَأَرْسَلْنَا ٱلسَّمَآءَ عَلَيْهِم مِّدْرَارًا وَجَعَلْنَا ٱلْأَنْهَٰرَ تَجْرِى مِن تَحْتِهِمْ فَأَهْلَكْنَٰهُم بِذُنُوبِهِمْ وَأَنشَأْنَا مِنۢ بَعْدِهِمْ قَرْنًا ءَاخَرِينَ ۝٦ ﴾

الأنعام ( ٥- ٦ )

واتە: وەهەر بەڵگەو نیشانەیەك لەبەڵگەو نیشانکانی پەروەردگاریان بۆ بێت ئەوان رووی لێوەردەگێڕن بەراستی کاتێك قورئانیان بۆهات بەدرۆیان دانا جا لەمەو پاش بۆیان دێت هەواڵی ئەو شتانەی کەئەوان گاڵتەیان پێوەدەکرد ئایا نەیان دیومو نەیان زانیوە لە پێش ئەوانەوە چەند گەل و نەوەمان لەناوبردووە دەسەلآتمان پێدابوون لەزەوی داو بەشێوەیەك کەبە ئێوەمان نەدابوو و بارانی پەیتا پەیتامان بەسەرا باراندن وە جۆگەو رووبارەکانمان والێ کردبوو کەبەبن باغ و کۆشکەکانیاندا دەڕویشت لەناومان بردن بەهۆی گوناهەکانیانەوە وەلەدوای ئەوان دروستمان کرد گەل و نەوەیەکی تر ، سورەتی ( الانعام ) لەمەککە هاتۆتەخوارەوە بۆ پێغەمبەر (ﷺ) ،باسی بیرو باوەڕو تاك و تەنهایی خوای گەورە دەکات ،ئەم سورەتە لەکاتێکدا هاتە خوارەوە کە بانگەوازی ئیسلام تووشی ناخۆشی و حاڵەتێکی زۆر ناهەموار هاتبوولەکاتی ئابلوقەدانی موسڵمانان لەلایەن قورەیشیە بت پەرستەکانەوە لە شیوی ئەبوتالیب دا کڕین و فرۆشتنیان لەگەڵ نەدەکردن و لەدووای ئەوەش ساڵی خەم و خەفەت هات کەئەبو تالیب و خەدیجەی خێزانی پێغەمبەر (ﷺ) وەفاتیان

کرد هەر لەو ماوەیەدا پێغەمبەر (ﷺ) ڕوومو تایف ڕۆیی سا بەشکو ببنە یارمەتی دەری لەسەر ڕاگەیاندنی پەیامە پیرۆزەکەی کەچی لەوێدا پێغەمبەریان بەرد باران کرد لەو بارودۆخە ناهەموارەدا قورئان دڵنیایی ئەوە بەئیمانداران دەدات کە بێ باوەڕان تێك دەشکێن مژدەی سەرکەوتن و سەرفرازی دەدات بەبڕواداران کە هەر وەك چۆن قورئان فەرمووی دەقاو دەق وەك ڕۆژی ڕووناك وادەرچوو.

وە هەروەها لە سورەتی ( القمر ) دا لەمەککە دەفەرموێ :﴿ أَكُفَّارُكُمْ خَيْرٌ مِّنْ أُوْلَٰٓئِكُمْ أَمْ لَكُم بَرَآءَةٌ فِي ٱلزُّبُرِ ۝ أَمْ يَقُولُونَ نَحْنُ جَمِيعٌ مُّنتَصِرٌ ۝ سَيُهْزَمُ ٱلْجَمْعُ وَيُوَلُّونَ ٱلدُّبُرَ ۝ بَلِ ٱلسَّاعَةُ مَوْعِدُهُمْ وَٱلسَّاعَةُ أَدْهَىٰ وَأَمَرُّ ۝ ﴾ القمر ( ٤٢ — ٤٥ )

واتە :ئایا کافرەکانی ئێوە ئەی خەڵکی مەککە باشترن لەو گەلانەی کەباس کران یان ئێوە ئەمان نامەتان هەیە لە کتێبە ئاسمانیەکان دا کە سزا نادرێن یان دەڵێن کە ئێمە کۆمەڵێکی سەرکەوتووین و نابەزین بێگومان کۆمەڵەکەیان دەشکێنرێ و هەڵدێن بەڵکو بەڵێنیان ڕۆژی دوایی یە وە سزای ئەو ڕۆژە زۆر سەخت ترو تاڵ ترە ، کاتێك ئەو ئایەتە هاتە خوارەوە عومەری کوڕی خەتتاب – ڕەزای خوای لێبێت وتی:ئەی پێغەمبەری خوا چ کۆمەڵێك تێك دەشکێن و شکست دەخۆن ؟ جا عومەر دەڵێ : لە جەنگی بەدردا پێغەمبەرم (ﷺ) بینی ئەم ئایەتەی دەخوێند جا ئەو جار لەمانای ئەو ئایەتەحاڵی بووم ،کەلەو جەنگی بەدرەدا ئیمانداران خوای گەورە سەری خستن و کافرە قوڕەیشی یەکانی بە شکانێکی زۆر خراپ تێك شکاند و بەڵێنی قورئان ڕاست دەرچوو . وەهەروەها قورئانی پیرۆز باس لەسەرنجام و چارەنووسی خراپی چەند کەسێك دەکات و ئەم هەواڵ دانانە هەموویان دێنە دی ، چەند نموونەیەك لەو بارەوە قورئان باسی ئەبو لەهەب دەکات و دەفەرموێ : ﴿تَبَّتْ يَدَآ أَبِي

لَهَبٍ وَتَبَّ ﴿١﴾ مَآ أَغْنَىٰ عَنْهُ مَالُهُۥ وَمَا كَسَبَ ﴿٢﴾ سَيَصْلَىٰ نَارًا ذَاتَ لَهَبٍ ﴿٣﴾ وَٱمْرَأَتُهُۥ
حَمَّالَةَ ٱلْحَطَبِ ﴿٤﴾ فِى جِيدِهَا حَبْلٌ مِّن مَّسَدٍ ﴿٥﴾ ﴾ **المسد ( ١ -٥ )**

**واتە: لەناوچێ هەردوو دەستی ئەبو لەهەب وەلەناویش چوو، سوودی پێ نەگەیاند دارایی یەکەی و ئەوەی کەکردی لە دوژمنایەتی پێغەمبەر (ﷺ) بێگومان لەمەودوا دەچێتە ناوئاگری بلێسەدار لەگەڵ ژنەکەیدا کەهەڵگری دارو چاووگە بۆ نانەوەی ئاژاوە هەمیشە گوریسێکی بادراو لە پەلی خورمایی ئاگرین وا لەگەردنیدا .بوخاری و موسلیم لە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسەوە گێڕاویانەتەوە دەڵێ : پێغەمبەر (ﷺ) ڕۆژێکیان چووە سەر کێوی عەرەفەو هاواری کرد، پاشان قورەیش هەموو لێی کۆبوونەوەو ووتیان ئەوە چیتە ؟ چی ڕوویداوە ؟ فەرمووی پێم بڵێن ئەگەر هەواڵتان بدەمێ دوژمن ئێوارە یا بەیانی دەدەت بەسەرتانا ئایا باوەڕم پێ دەکەن ؟ ووتیان بەڵێ . فەرمووی دەمن ئاگادارکەرەوەی ئێوەم لە سزای سەختی قیامەت، پێغەمبەرم بۆسەر ئێوە، ئەبو لەهەب وتی: تیاچوون بۆتۆ بۆ ئائەمە ئێمەت کۆکردەوە ؟ جا خوای گەورە ئەو ئایەتەی دابەزاند بەڕاستی ئائەوە موعجیزەیەکی گەورەیە .ئەبو لەهەب سەرسەختترین دوژمنی پێغەمبەری خوا بوو و بەهەموو شێوەیەك هەوڵی دەدا بەربەست لەبەردەم بانگەوازی خوا دروست بکات و وەلەهەلێکی هەرە بچووك دەگەڕا بۆ ئەوەی بیکات بەبەڵگە بۆ ئەوەی دژایەتی پێغەمبەرو بانگەوازەکەی پێ بکات کەچی قورئان لەبارەیەوە دادەبەزێ و هەواڵ دەدات کەئەبو لەهەب جێگای دۆزەخەو باوەڕ ناهێنێ کە قورئان لەمەککە هەواڵی تیاچوون و چوونە دۆزەخی پێ دەدات کەچی ئەبو لەهەب ماوەیەکی زۆر دوای دابەزینی قورئان لەبارەیەوە ،دەژی ئەبو لەهەب تا دوای جەنگی بەدریش هەر لەژیاندا مابوو،جا ئەگەر هاتباو ئەبو لەهەب ساتێك لەساتەکان وتبای خەڵکینە ئەها**

موحەممەد دەڵێ خوا قورئانی لەبارەی تۆوە ناردوومو هەواڵ دەدات کەتۆ چارەنووست دۆزەخە، بەلاّم ئەوە من ڕای دەگەیەنم کە ئیمان دەهێنم دێمە ناو ئایینی موحەممەد .

خوێنەری بەڕێز دەزانی ئەگەر وای وتبا خەڵکی دەکەوتنە گومان لەبارەی قورئان و بانگەوازی پێغەمبەر (ﷺ) بەلاّم چونکە خوای گەورە قورئانی دابەزاندووە هەر خۆی خاوەنیەتی بەهیچ شێوەیەك ئەبو لەهەب هەرگیزاو هەرگیز قسەی وای نەکردو هەرگیز ئیمانی نەهێنا وە هەمیشە زیاتر سوورتر و بەردەوام تر دەبوو لەسەردژایەتی کردنی بەرنامەی خوا تا سەرەنجام بەکافری مردوو بەرەو دۆزەخ ڕۆیی وەهەروەها وەلیدی کوڕی موغیرە دێتە لای پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەویش قورئانی بۆ دەخوێنێ بەشێوەیەك وەك دڵی نەرم ببێ ، ئەوە بە ئەبو جەهل گەیشتەوە کە برازای وەلید بوو ،بە پەلە خۆی گەیاندە لای و ووتی مامە خزمەکانت دەیانەوێ ماڵ و سامانت بۆ کۆبکەنەوە ووتی بۆچی ؟ ووتی تابت دەنێ چونکە تۆ چوویتە لای موحەممەد تا شتێکی لێ داوا بکەیت، وەلید ووتی :
خۆ قوڕەیش دەزانێ من سامانم لەهەموویان زیاترە وتی : دەی شتێك دەربارەی موحەممەد بڵێ تا بەخزمەکانت بگاتەوە کەتۆ ئەوت ناوێ وتی: جا چی پێ بڵێم؟ دەبەخوا پیاوێکتان لەناودا نی یە کە لە شیعردا لەمن زاناتر بێ لەمن زیاتر لە ڕەجەزو لە قەصیدەی شیعرو لە شیعرەکانی جینن
شارەزاتر بێ دەی بەخوا ئەوەی ئەو دەیڵێ لەهیچی لەمانە ناچێ دەبەخوا ئەو قسانەی شیرینی یەکیان تێدایەو گەشاوەیی و جوانی یەکیان بەسەرەوەیە سەرەتاو کۆتایی یەکەشی پڕ لەخێرو کەڵکی زۆرەو ئەو بەسەر هەموو شتێکدا بەرزترەو هیچ شتێك لەو بەرزتر نی یە هەر چیش لەژێری دابێت تێکی دەشکێنێت ،ئەبو جەهل وەك شەیتانێکی فێڵ باز وازی لێ نەهێنا تا ناچاری کرد ڕەخنە لە قورئان بگرێ قورئان دەربارەی دابەزی و هەواڵی دا کەڕەنجەڕۆ دەبێ و دەچێتە دۆزەخ ئەویش ئیمانی نەهێناو بەکافری مردوو بەڵێنی قورئان ڕاست

دەرچوو.ئەو ئایەتانەی لەبارەی وەلیدەوە هاتن ئەمانەن: ﴿ ذَرْنِي وَمَنْ خَلَقْتُ وَحِيدًا* وَجَعَلْتُ لَهُ مَالا مَّمْدُودًا*وَبَنِينَ شُهُودًا*وَمَهَّدتُّ لَهُ تَمْهِيدًا*ثُمَّ يَطْمَعُ أَنْ أَزِيدَ*كَلاَّ إِنَّهُ كَانَ لآيَاتِنَا عَنِيدًا*سَأُرْهِقُهُ صَعُودًا*إِنَّهُ فَكَّرَ وَقَدَّرَ*فَقُتِلَ كَيْفَ قَدَّرَ*ثُمَّ قُتِلَ كَيْفَ قَدَّرَ*ثُمَّ نَظَرَ*ثُمَّ عَبَسَ وَبَسَرَ*ثُمَّ أَدْبَرَ وَاسْتَكْبَرَ*فَقَالَ إِنْ هَذَا إِلاَّ سِحْرٌ يُؤْثَرُ*إِنْ هَذَا إِلاَّ قَوْلُ الْبَشَرِ*سَأُصْلِيهِ سَقَرَ*وَمَا أَدْرَاكَ مَا سَقَرُ*لا تُبْقِي وَلاتَذَرُ*لَوَّاحَةٌ لِّلْبَشَرِ*عَلَيْهَا تِسْعَةَ عَشَرَ﴾ المدثر ( ١٠ – ٣٠)

واتە : واز لەمن وئەوکەسە بێنە کەدروستم کردووە بەتەنها وەدارایی زۆرو زەبەندم پێ داوە وەکوڕانی ئامادەو وە هۆی ژیانم بۆ ڕاخستووە بەچۆن ڕاخستنێك وە دوای ئەمانەش هێشتا بەتەمایە زیاتری بدەمێ نە چاوەڕوان نەبێ بەڕاستی ئەو دەربارەی ئایەتەکانی ئێمە بێ باوەڕێکی کەلە ڕەقە بەم زووانە سزای سەختی پێ دەچەژم چونکە بیری کردەوەو هەڵی سەنگاند قسەکەی خۆی ،دەك بەکوشت چێ چۆنی هەڵیسەنگاند و دووبارە بەکوشت چێ چۆنی لێکداوەتەوە لەپاشان تەماشایەکی کردو ئەوسا ناوچەوانی گرژو ڕووی ترش کرد ئینجا بەفیزێکەوە پشتی هەڵکرد جا وتی: ئەم قورئانە هیچی تر نی یە جادوویەك نەبێ کەوەرگیراوە ئەم قورئانە هەر گوفتاری مرۆڤە ئەو کەسە زوو دەیخەمە دۆزەخەوە تۆ چووزانیت کە دۆزەخ چی یە ؟ئاگرێکە هیچ ناهێڵێتەوە ووازناهێنێ و بەیەکەم هاڵاو پێست ڕەش دەکاتەوە و دە یبرژ ێنێ نۆزدە فریشتە ئەوەتان بەسەریەوە،وە ئەگەر سەرنجی ژیانی پێغەمبەر ی خوا بدەین چەندەها کەسایەتی زاناو پێگەیشتوو کەبەخزمەت پێغەمبەر (ﷺ) گەیشتوون یان لەدوورەوە وەسفی ئەویان بۆ کراوە دانیان ناوە بەڕاستگۆیی ئەو پێغەمبەرە ئازیزەو بە بینینی چەند موعجیزەیەکی پێغەمبەر موسڵمان بوو ون ،بە پشتیوانی خوای گەورە چەند نموونەیەك لەو بارەوەش باس دەکەین.

پێغەمبەر (ﷺ) نامەیەکی نووسی بۆ هەرقل پاشای ڕۆم بە ﴿ دحیة الکلبي ﴾ دا ناردی، دەقی نامەکەی پێغەمبەر (ﷺ) ئەوە بوو:

بسم الله الرحمن الرحيم ﴿ مِن محمد عبدالله ورسوله الى هرقل عظيم الروم سلام على من التبع الهدى ....اما بعد فأني أدعوك بدعا ية الإسلام ،اسلم تسليم، أسلم يؤتيك اللة أجرك مرتين،فأن توليت فأنك عليك اثم الاريسيين ﴿ يا اهل الكتاب تعالوا الى كلمة سوا ء بيننا وبينكم أن لا نعبد إلا الله ولا نشريك به شيئاً ولايتخذ بعضنا بعضاً أرباباً من دون الله فأن تولوا فقولوا أشهدوا بأنا مسلمون﴾.

واتە: بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان:لە موحەممەدەوە بەندەو نێردراوی خوا بۆ هەرقل گەورەی ڕۆم ،سەلام لەسەر ئەو کەسەی کەدوای هیدایەت و ڕاستی دەکەوێت لەدواییدا :من بانگت دەکەم بەبانگەوازی ئیسلام،موسڵمان بە سەلامەت دەبیومەسلمان بە خوا دوو پاداشتت دەداتێ ئەگەر وانەکەیت و پشت هەڵکەیت ئەوا بەڕاستی گوناهی ئەو ڕەعیەتەش لە گەردنی تۆدایە.

دحیەی کەلبی دەگاتە بیت المقدس و نامەکەی دەداتە دەست هەرقل،دحیە دەڵێ کەنامەکەم دایە فەرمانی کرد بۆم بخوێننەوە کەبۆیان خوێندەوە برازایەکی سورو سپی چاوشینی هەرقل لایەوە دانیشتبوو تووڕەبوو ووتی :مەیخوێنەوە خاوەن نامەکە ناوی خۆی پێش خستووە و ئەشی ووتوە هەرقل پاشای ڕۆم بەڵکو ووتوویەتی گەورەی ڕۆم هەرقل ووتی: بابیخوێنێتەوە قەیناکات ئینجا هەمووی خوێندرایەوە بەسەر ئامادە بووان دا پاش ئەوە هەرقل هەموو ئامادەبووانی نارده دەرەوەو تەنها (دحیە ) و ( ابن ناطور) ی هێشتەوە ،هەرقل چەند پرسیارێکی لە دحیە کردو ئەویش بەچاکی وەڵامی دایەوە دوای ئەوە لە ( ابن ناطور) ی پرسی تۆ ڕات چی یە بەرامبەر ئەو قسانە؟ ئەویش ووتی :موحەممەدی کوڕی عەبدوللا بەخوا ئەو پێغەمبەرەیە کە ﴿ موسا ﴾ و ﴿ عیسا ﴾ مژدەیان داوە بەهاتنی ،وە ئەو پێغەمبەرەیە کە

چاوەڕێی دەکەین هەرقل ووتی:جا تۆ دەڵێی چی بکەین باشە؟ (ابن ناطور) ووتی: من وای بەباش دەزانم کەبڕوای پێ بهێنین و شوێنی بکەوین،هەرقل بەبەڕێوەبەری خۆی ووت :هەموو شام بگەڕێ بەڵکو یەکێکم بۆ بدۆزیتەوە کە لەهۆزی ئەو پێغەمبەرە بێت بیهێنە بۆم ، پاش گەڕانێکی زۆر ئەبوو سوفیان و سی بازرگانیان لەشاری غەززە دۆزیەوەو بردیانن بۆلا هەرقل لە (بیت المقدس) هەرقلیش هەموو گەورە پیاوان و قەشەکانی بانگ کردو تاجەکەی کردە سەری و لەسەر تەختەکەی دانیشت،ئینجا ئەبو سوفیان و بازرگانەکانیان هێنایە بەردەمی هەرقل و لێی پرسین:ئێوە لەهۆزی ئەو پیاوەن کەخۆی بە پێغەمبەر دادەنێت؟ ووتیان بەڵێ ،هەرقل ووتی: کامتان خزمایەتی نزیکی هەیە لەگەڵیدا ؟ئەبوو سوفیان ووتی من خزمی نزیکی ئەوم،هەرقل ووتی خزمایەتیەکەت چی یە؟ئەبو سوفیان ووتی :ئامۆزامە ،چونکە ئەبو سوفیان و پێغەمبەر (ﷺ) لە باوکی چوارەم عەبدول مەناف بەیەك دەگەنەوە ئینجا هەرقل بە ئەبووسوفیانی ووت:کەبێتە پێشەوەو دانیشێ ئەوانی تریش لە پشتی یەوە دابنیشن ،ئینجا ووتی:من پرسیار دەکەم لەئەبوو سوفیان لەبارەی ئەو پێغەمبەرەوە ،ئێوە سەیری وەڵامەکانی بکەن،ئەگەر درۆی کرد لەگەڵم پێم بڵێن و درۆکەی بۆڕاست بکەنەوە ،ئەبووسوفیان لەحاڵێکی شلۆقدا بوو ئەگەر بەڕاستی وەڵامی بداتەوە پڕوپاگەندەیەکی چاکە بۆ موحەممەد کەچەند ساڵە ئەجەنگێت لەگەڵیدا وە ئەگەر درۆش بکات سی کەس بەرپەرچی ئەدەنەوە لەدوایەوە و دوایی بەدرۆزن ناو دەردەکات،هەرقل ووتی هەواڵی ئەو پیاوەم بدەنێ کەلەناوتاندا پەیدا بووەو دەڵێ پێغەمبەرە،

ئەبوو سوفیان ووتی:کەواتە بپرسە با وەڵامت بدەمەوە ،هەرقل ووتی:نەسەبی موحەممەد چۆنە لەناوتاندا ئایا لەئەشرافتانە؟ ئەبوو سوفیان :بەڵێ : ئەو خاوەن نەسەبە و لەئەشرافمانە،هەرقل ووتی:کەس پێشتر قسەی وای کردووە ئەم چاوی لێ بکات؟ ئەبو سوفیان ووتی :نەخێر،هەرقل ووتی:ئایا یەکێ لەباب و باپیرانی پادشا بووە لێتان زەوت

كردبێ ئێستا بیەوێ بەو قسانەی دەستی بكەوێتەوە؟ ئەبو سوفیان ووتی :نەخێر هەرقل ووتی: پێم بڵێ ئایا شوێن كەوتووانی چۆنن ئایا ئەشراف و گەورە پیاوان دوای دەكەون یان هەژارو بێ نەوایان؟ئەبو سوفیان ووتی:هەژارو بێ نەوایان شوێنی دەكەون لەگەڵ گەنجان و ژنان بەلأم گەورە پیاوان و سەركردەكان كەس شوێنی نەكەوتووە ،هەرقل ووتی:ئایا شوێن كەوتووانی زیاد دەبن یان كەم؟ ئەبو سوفیان ووتی شوێن كەوتووانی زیاد دەبن ،هەرقل ووتی: ئایا كەس لەشوێن كەوتووانی لەداخی خراپی دینەكە وازی هێناوە؟ ئەبو سوفیان ووتی نەخێر ، هەرقل ووتی:ئایا درۆتان لێ بینیوە پێش ئەوەی ئەو قسانە بكات ؟ ئەبو سوفیان ووتی نەخێر ، هەرقل ووتی: ئایا غەدر دەكات و پەیمان دەشكێنێ ؟ ئەبو سوفیان ووتی نەخێر،هەرقل ووتی: ئایا شەڕتان لەگەڵ كردووە ؟ ئەبو سوفیان ووتی بەڵێ ،هەرقل ووتی:شەڕەكەتان چۆن بووە لەگەڵی ؟ ئەبو سوفیان ووتی :جەنگ لەنێوان ئێمەو ئەودا بەنۆبە بووە ،ئەو سەركەوتووە بەسەرمانداو جاریش بووە ئێمە سەركەوتووین بەسەریدا ،هەرقل ووتی :فەرمانتان بەچی پێ دەدات؟ ئەبو سوفیان ووتی :پێمان دەڵێ تەنها خوا بپەرستن و هاوەڵی بۆ بڕیارمەدەن،واز لە قسەو ڕێبازی باب و باپیرانتان بهێنن وە دەڵێ نوێژ بكەن و ڕاستگۆ بن و داوێن پاك بن و خزم دۆست بن، پاش ئەو یازدە پرسیارە ئینجا هەرقل بە ئەبو سوفیانی ووت:

**یەكەم:** پێت ووتم كە مەحەممەد نەسەبی هەیە تیاتاندا پێغەمبەرانیش هەروان چونكە لەنەسەبێكی شەریفی قەومەكەی هەڵدەبژێردرێت.

**دووەم:** پێت ووتم كەس لە پێش ئەودا شتی وای نەووتوە جا ئەگەر یەكێ پێش ئەو باسی پێغەمبەرایەتی بكردایە لەناوتاندا ئەم ووت موحەممەد چاو لێكەری كەسێكە پێش خۆتان بووە.

**سێ یەم:** پێت ووتم کەس لەباب و باپیرانی پادشا نەبوون ئێوە لێی زەوت بکەن،ئەگەر وابوایە دەم ووت موحەممەد داوای موڵکی باوکی دەکات لەڕێی پێغەمبەرایەتی یەوە.

**چوارەم:** پێت ووتم ئێوە درۆتان لێ نەدیوە پێش ئەوەی باسی پێغەمبەرایەتی بکات وە من دەزانم ناگونجێ موحەممەد واز لەدرۆکردن بهێنێ لەگەڵ خەڵکداو درۆ بەدەم خواوە بکات بڵێ من پێغەمبەرم.

**پێنجەم:** پێت ووتم هەژارو بێ نەوایان شوێنی دەکەون ،جا شوێن کەوتووانی پێغەمبەران هەروان.

**شەشەم:** پێت ووتم کە شوێن کەوتووانی زیاد دەکەن وکەم ناکەن بەهەمان شێوە شوێنکەوتوانی پێغەمبەران زیاد دەکەن و کەم ناکەن و ڕوو لەزیادیین هەتا کاری ئیمان دەگاتە جێ .

**حەوتەم:** پێت ووتم کەس لەشوێن کەوتووانی لەئاین وەرناگەڕێن پاش ئەوەی دێنە ناوی ئیمانیش ئاوەهایە ئەگەر تێکەڵ بەدڵ و دەروون بوو دەستی لێ هەڵناگیرێ .

**هەشتەم:** پێت ووتم غەدر ناکات و پەیمان ناشکێنێت ، پێغەمبەرانیش پەیمانشکێن نین .

**نۆیەم:** پێت ووتم کە فەرمانتان پێ دەکات بە خوا پەرست و هاوبەشی پەیدا نەکردن بۆی،وە جڵەو گیریتان دەکات لە پەرستنی بتەکان و داواتان لێ دەکات ڕاستگۆ بن و داوێن پاك بن، پاش ئەو گفتو گۆیە هەرقل گەیشتە ئەو ئەنجامە حاشا هەڵنەگرە کە (موحەممەد پێغەمبەری خوایە ) و وە ئەو پێغەمبەرەیە کە مژدە دراوە بەهاتنی لەلایەن پێغەمبەرانی پێش خۆیەوە.

بۆیە هەرقل بە ئەبو سوفیانی ووت :ئەگەر ڕاست بکەی لەوانەی کە پێت ووتم ئەوا ئەو ژێر پێیەی منیش دەگرێت ئەوانەی باست کرد سیفاتی پێغەمبەرن وەمن دەمزانی کە دوا پێغەمبەر دێت وبەلاّم گومانم نەدەبرد کەلەئێوە بێت و لای ئێوە دەربکەوێت وە ئەگەر بزانم دەتوانم

بگەمە لای بەسەلامەتی ئەوە دەچووم بۆ مەدینە بۆلایی و بەدیداری شاد دەبووم و گوێم نەدەدایە زەحمەت ونارەحەتی گەیشتن پێی و وە ئەگەر لەلای بوومایە لەخزمەتیا دەبووم و قاچیشم بۆ دەشووشت بۆ زیاتر خزمەت لەبەردەمیدا ئەوقسانەی هەرقل زۆر سەیر بوو بەلای ئەبو سوفیان و گەورە پیاوانی دەوڵەت و قەشەکانەوە چۆن پاشای گەورەترین ئیمپراتۆریەتی جیهان بڵێ من دەبمە خزمەت کاری ئەو پێغەمبەرەو قاچی بۆ دەشۆم،ئەبو سوفیان بەبرادەرە بازرگانەکانی ووت :بەڕاستی مەسەلەی موحەممەد گەورە بووە ،ئەوەتا پاشای ڕۆم لێی دەترسێ ،ئینجا ووتی: لەو ساتە وەختەوە دڵنیابووم کە موحەممەد سەردەکەوێ و ئایینەکەی بلاو دەبێتەوە.

خوێنەری بەڕێز سەرنج بدە کەسێکی وەك هەرقل کەپادشای ئیمپراتۆریەتی ڕۆمە بە بیستنی وەسفی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾دان دەنێ بەو ڕاستی یە کە موحەممەد پێغەمبەری خوایە....وە هەروەها لەسەرەتای مێژووی ئیسلامەوە تاقیامەتیش کەسانی خاوەن وویژدان کە بەدوای ڕاستیدا دەگەڕێن ڕوودەکەنە ئایینی پاکی ئیسلام و بەدنیادا ڕای دەگەیەنن، موحەممەد ﴿ﷺ﴾ ئەو پێغەمبەرەیە کەپێغەمبەرانی پێش خۆی مژدەی هاتنیان داوە بەخەڵکی،لە ساڵی ٩٢ زاینیدا ( پاپا جلاسیوس) فەرمانی دەرکرد بەیاساغ کردنی خوێندنەوەی چەندەها پەڕاو، یەکێك لەو پەڕاوانە ( ئینجلی بەرنابا ) بوو بۆیە گشت نووسخەکانی کۆکرایەوەو سووتێنرا تەنها نوسخەیەك مایەوە لە کتێبخانەی پاپاداو بەزمانی ئیتاڵی نووسرابۆوە، کاتێك ( فرامینۆ ) کە ڕاهیبێکی لاتینی بوو چەند نامەیەکی ( ئەرینایوس ) ی دەست دەکەوێ ،سەیر دەکات باسی ئینجیلی بەرنابا دەکات ، بۆیە دەبێتە خولیای سەری کەبەدوای ئەو ئینجیلەدا بگەڕێ سەرەنجام لەکتێبخانەی پاپا ( سکتش) ی پێنجەمدا کەهاوەڵی دەبێت ئەو ئینجیلە بەدەست دەهێنێت دەکەوێتەلێکۆڵینەوەی پاشان زۆر سەرسام دەبێت لەوەی کەلەو ئینجیلەدا ئاماژەی تێدایە

دەربارەی پێغەمبەری پایە بەرزی ئیسلام موحەممەد ﴿ﷺ﴾ هەروەك دەڵێ ( وسيبقى هذا الى ان يأتي محمد رسول الله الذي متى جاء كشف الخداع للذين يؤمنون بشريعة الله ) ئینجیلی بەرنابا / الباب / ٢٢٠ .

ئەوەش وای كرد كە فرامینۆ موسڵمان ببێت و هەوڵی زۆر بدات بۆ بڵاوكردنەوەی ئەو ئینجیلە لە پاشدا نووسخویەكی تری ئیسپانی دۆزرایەوە لەسەرەتای سەدەی هەژدەی زایینی دا كەئەوەش بووە بەڵگەی تری نـوێ .

قورئـان دەفەرمووێ ﴿ وَإِنَّهُۥ لَتَنزِيلُ رَبِّ ٱلۡعَـٰلَمِينَ* نَزَلَ بِهِ ٱلرُّوحُ ٱلۡأَمِينُ*عَلَىٰ قَلۡبِكَ لِتَكُونَ مِنَ ٱلۡمُنذِرِينَ*بِلِسَانٍ عَرَبِيّٖ مُّبِينٖ*وَإِنَّهُۥ لَفِي زُبُرِ ٱلۡأَوَّلِينَ*أَوَلَمۡ يَكُن لَّهُمۡ ءَايَةً أَن يَعۡلَمَهُۥ عُلَمَـٰٓؤُاْ بَنِيٓ إِسۡرَـٰٓءِيلَ﴾ الشعراء ١٩٧ .

واتە: بەڕاستی ئەو قورئـانە پەروەردگاری هەموو جیهان ناردوویەتی یە خوارەوە،جبرائیلی ئەمین بەسروش لەخواوە هێناوەیەتی یە ناو دڵتەوە تاكو یەكێك بیت لەترسێنەرانی خەڵكی لە سزای خوا بەزمانێكی عەرەبی ڕوون و ڕەوان وە بەڕاستی ئەو قورئانە لە پەڕاوی گەلە پێشوەكاندا ئاماژەی پێكراوە وە ئایانە بووە بەبەڵگەو دڵنیایی بۆیان ، كەزاناكانی نەوەی ئیسرائیل ئەم ڕاستی یە دەزانن و دڵنیان كە قورئـان و سیفاتی پێغەمبەر (ﷺ) لە پەڕاوەكانی بەردەستیاندا ئاماژەی بۆكراوەو هەندێكیشیان لێی موسڵمان دەبێت ،وەهەروەها كە پێغەمبەر (ﷺ) لەمەككەوە كۆچی كرد بۆ مەدینە یەكێك لەزانایانی ئەهلی كتاب دێتە خزمەتی و بەتەواوی لەوە دڵنیادەبێت كە ئەوە پێغەمبەری خوایەو لەبەردەمیدا موسڵمان بوونی خۆی ڕادەگەیەنێ، ئەنەس – خوا لێی ڕازی بێ دەڵێت :

عەبدەللای كوڕی سەلام لەناوباخدا باخ دەڕنێ ، لەو كاتەدا دەبیستێ كە پێغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم ) كۆچی كردووه بۆ مەدینه،جادێ بۆ خزمەتی و دەڵێ : من سێ شتت لێ دەپرسم هەر كەسێ پێغەمبەر نەبێ نایانزانێ .

یەكەم نیشانەی گەورەی قیامەت چی یە؟ وەیەكەم خۆراكێ كە بەهەشتی دەیخوا لەبەهەشتا چی یە؟ وەهۆی چی یە مندالْ شێوەی لە باوكی دەچێ؟ یا لەدایكی دەچێ و شێوەی دەچێتە وە سەر خالْوانی ؟

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی ﴿ ئائێستا كەزۆر نی یە كە جوبرائیل – سلاْوی خوای لێ بێ – ئەم سێ شتەی پێ فەرمووم.عەبدوللاْ ووتی: جولەكە لەناوخۆیاندا لەناو هەموو فریشتەكاندا جوبڕائیل بە دوژمنی خۆیان دادەنێن كەوا دەڵێ پێغەمبەر (ﷺ) ئەم ئایەتەی خوێندەوە كە دەفەرموێ :﴿ مَن كانَ عدواً لجبريلَ فإنَّهُ نَزَلَهُ علَىَ قَلبك ﴾

ئینجا پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی : یەكەم نیشانەی هاتنی گەورەی قیامەت ئاگرێكە خەڵك لە خۆرهەلاْتەوە دەداتە بەرودەیانبات بۆ خۆر ئاوا ، وە یەكەم خۆراكی بەهەشتی یەكانیش پارچە زیادەكەی گۆشتەكەی جگەری نەهەنگە.

ئاوی پیاویش ئەگەر وەپێش ئاوی ژن كەوت مندالْەكە دەكێشێتە سەرخۆی ،بەلاْم ئەگەر ئاوی ژن وەپێش ئاوی پیاو كەوت ،ئەوا مندالْەكە دەكێشێتە سەرخۆی.

عەبدوللای كوڕی سەلام كە ئەو وەلاْمە ڕاست و دروستانەی لە پێغەمبەری خواوە بیست بڕوای پێكردو ئیسلام بوو وتی: شایەتی دەدەم كە تۆ پێغەمبەری ڕاست ونێردراوی خوای لەبەر ئەوە شایەدی دەدەم كە بێجگە لەخوای گەورە هیچ خوایەكی تر نی یە،وە شایەدیش دەدەم كەتۆ پێغەمبەری ڕەوانەكراوی خوای ، ئەی پێغەمبەری خوا بێگومان جولەكە هۆزێكی بوختانكەرو هەلاْتبازن، لە پێش ئەوەدا كە بزانن من موسڵمان بووم پرسیاریان لێ بكە لەبارەی منەوە ، ئەگینا لەڕقاندا بوختانم بۆ دەكەن، جاكاتێك جولەكەكان هاتن عەبدوللاْ لە ژوورەوەخۆی

شاردەوە ، پێغەمبەر ( ﷺ ) فەرمووی :عەبدوللأی کوڕی سەلام چۆن پیاوێکە لەناوتاندا؟ وتیان چاکترینی ئێمەیەو زاناترینی ئێمەیە، پێغەمبەر ( ﷺ ) فەرمووی :باشە پێم بڵێن، ئەگەر عەبدوللأ موسڵمان ببێت ئێوە دەڵێن چی؟ وتیان خوا نەوە نەکا خوا پەنای بدا لەشتی وا، پێغەمبەر ( ﷺ ) ئەم پرسیارەی چەند جارێك دووبارەکردەوە بۆیان، بەلأم ئەوان لەگەڵی شەیتان نەهاتنە خوارەوە هەر ئەو وەلأمەیان دایەوە،لەو کاتەدا یەکسەر عەبدوللأی کوڕی سەلام لە ژوور هاتە دەرەوەو بەدەنگی بەرز ئیسلام بوونی خۆی ڕاگەیاند و ووتی: شایەدی دەدەم کە خوا تاك و تەنهایە هیچ هاوبەشی نی یە،موحەممەدی کوڕی عەبدوللأ پێغەمبەری خوایە،لەو کاتەدا جولەکەکان ووتیان عەبدوللأ خراپترینی ئێمەیەو کوڕی خراپترینی ئێمەیە،ئیتر بەوەشەوە نەوەستان بەقسەی ناشیرین دایان شۆرد، عەبدوللأ ووتی ئەی پێغەمبەری خوا خۆ بینیت ئەمانە چ لەخوا نەترسێکن من پێم نەووتی؟

دەی من لەم زمانە پیسەیان دەترسام. وەهەروەها پێغەمبەر ( ﷺ ) بانگی جولەکەکانی دەکرد بۆ سەر ئایینی ئیسلام بۆ ئەمەش یەك یەك یان بەکۆمەڵ قسەی لەگەڵ دەکردن و وەلأمی پرسیارەکانیانی ئەدایەوە جا نەك هەر بەقسە بەڵکو کردارو ڕەفتاری جوانیش کاریگەری هەبوو لەسەریان وەك لەم ڕووداوەدا باسی دەکەین، حاکم ڕیوایەتی کردووە لە عەبدوللأ ی کوڕی سەلامەوە کەدەڵێت:

کاتێك خوا ویستی ڕێنمایی زەیدی کوڕی سەعنە بکات بۆلای ئایینی پیرۆزی ئیسلام زەید ووتی: هیچ نەماوە لە نیشانەکانی پێغەمبەرایەتی لە موحەممەددا نەیبینم، تەنها دووشت نەبێت کە حیلمەکەی پێش هەڵچوونەکەی دەکەوێت،وەهەرچەندە زیاتر تووڕە بکرێ زیاتر ئارام دەگرێ ،بۆیە دەم ویست خۆمی لێ نزیك بکەمەوەو خۆم تاقی بکەمەوە، ڕۆژێك پێغەمبەر ( ﷺ ) لەماڵەوە هاتە دەرێ و عەلی لەگەڵ دابوو، پیاوێکی دەشتەکی بەسواری ولأخێکەوە هات و ووتی: ئەی پێغەمبەری خوا خەڵکی فلأن دێ موسڵمان بوون، وەمن پێم

ووتوون ئەگەر موسلمان ببن ڕزق و ڕۆزیتان زۆر دەبێت ، وائێستاش تووشی ووشکە سالی بوون، دەترسم وەك چۆن بە خۆشی و مالْ و حالی چاکەوە موسلمان بوون، ئاوا لێی دەرچن لەو باروو زرووفەدا ، ئەگەر دەتوانی بەلکو هەندێك یارمەتیان بۆ بنێری

پێغەمبەر (ﷺ) بە ئیمامی عەلی فەرموو:هیچمان لەبەردەست دایە بۆیان بنێری ؟ ووتی: نەخێر هیچمان لانەماوە، زەید دەلێ:منیش بەفرسەتم زانی و ووتم : ئەی موحەممەد هەندێك خورمام بدەنێ لە فلان باخ و بێستان لە پێشەوە پارەکەیت دەدەمێ ،ئەویش فەرمووی : نا ئەی جولەکە، خورمات دەدەینێ هەقی ئەو پارەیە بەلام مەرج نی یە هی فلان باخ بێت، منیش ووتم: باشەو هەشتا مسقالْ ئالتونم دایە،کەدوایی خورمام بدەنێ ،ئەویش دای بەکابراو فەرمووی برۆ بەدادگەری دابەشی بکە بەناویاندا،زەید دەلێ: پێش ئەوەی کاتی دانەوەی قەرزەکە بێت بەئەنقەست هاتم و یەخەیم گرت و بەتووڕەیی ووتم :هەقەکەم بدەرێ ئەی موحەممەد،بەخوا ئێوەی ( بەنی عبدالمطلیب ) هەروا قەرز کوێرن خۆم هەردەم زانی وان، زەید دەلێ لەم قسانەی من عومەر ڕقی هەستاو سەیری کردم و پێی ووتم:ئەی دوژمنی خوا، چۆن ئاوا بە پێغەمبەر (ﷺ) دەلێی، بەو خوایەی کەبەهەق ناردوویەتی ئەگەر لەبەر ئەو نەبوایە لەگەردنم دەدایت، پێغەمبەر (ﷺ) بەهێمنی و زەردە خەنەوە سەیری عومەری کردو فەرمووی: ئەی عومەر ئێمە هەردووکمان شتێکی ترمان لەتۆ دەویست، کەبەمن بلێی بەچاکی قەرزەکەم بدەمەوەو بەویش بلێی بەجوانی داوای بکاتەوە وە ئینجا برۆ هەقەکەی بدەرەوەو بیست ( صاع ) یشی بۆ زیاد بکە، جاکەعومەر زیادەکەی دامێ ،ووتم :ئەمەیان بۆچی یە؟

ووتی:ئەوە لەبەر ئەوەیە کەتۆم ترساندووە ، پێم ووت:دەمناسی ؟ وتی: نەخێر،تۆ کێیت؟ وتم:زەیدی کوڕی سەعنە، ووتی :تۆ نازانی جولەکەیت؟ وتم: بەلێ، وتم: باشە چی وای لێکردووی ئاوا بکەی بە پێغەمبەر (ﷺ) ئاوای پێ بلێی؟ وتم: ئەی عومەر من هەموو

نیشانەکانی پێغەمبەرایەتی ئەوم لا ئاشکرا بوو تەنها دوان نەبێت کە حیلمەکەی پێش توورەیی دەکەوێ و چەندەش زیاتر توورەی بکەی ئەوەندەزیاتر ئارام دەگرێ و هەڵناچێ و منیش ئێستا ئەوەم لێ بینی.....ئەی عومەر: تۆ بەشایەد بە ئەوە من ڕازیم کە خوا پەروەردگارم بێ و ئیسلام ئایینم بێ و موحەممەدیش (ﷺ) پێغەمبەرم بێ، وە من دەوڵەمەند ترینی جولەکەکانم ، بەشایەدبە کە نیوەی ماڵەکەم خێربێت بۆ ئوممەتی موحەممەد (ﷺ) ،عومەر ووتی: بەشی هەمووی ناکات بڵێ هەندێکیان، منیش ووتم: هەندێکیان، ئینجا زەید لەبەردەم پێغەمبەرو هاوەڵانی دا ووتی:﴿أشهدوا أن لا اله إلاّ الله واشهد أن محمداً عبده ورسوله﴾ وەهەروەها لەفەرموودەیەکدا موسلیم ڕیوایەتی کردووە ئاواهاتووە،سەوبان ( خوا لێی ڕازی بێت) وتی : لە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) وەستابووم،مالوومێکی جوولەکە هات و ووتی: سڵاو لەتۆ ئەی موحەممەد ،سەوبان دەڵێ: منیش پاڵێکی وا تووندم پێوەنا خەریك بوو پێی بکەوێ : وتی: بۆچی پاڵم پێوە دەنێی ؟ وتم: ئەی بۆچی ناڵێی ئەی پێغەمبەری خوا، وتی: بەوناوەوە بانگی دەکەین کەکەسوکاری لێی ناوە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی:

بەڵێ من ناوم موحەممەدە و کەسوکارم بەم ناوە منیان ناوناوە ، جولەکەکە ووتی: هاتووم پرسیارت لێ بکەم پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ئەگەر قسەی هەقت بۆ بکەم موسڵمان دەبیت؟ وتی: بەگوێی خۆم دەبیستم ، پێغەمبەر (ﷺ) دارێکی بەدەستەوە بوو دەیژەند لەزەویەکەوە و فەرمووی: ئادەی پرسیارت چی یە بپرسە، وتی: ئەو ڕۆژەی ئەو زەوی و ئاسمانە دەگۆڕێت بەزەوی و ئاسمانێکی تر ئەو خەڵکە لەکوێ دەبن ؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: لەسەر پردی سیرات دەبن ، وتی: ئەی کێ یەکەم کەس دەبێت کە لێی دەپەڕێتەوە ؟ ووتی: هەژارانی کۆچکاران ئەو هەژارانەی کە لە مەککەوە لەچەنگی کافران کۆچیان بۆ مەدینە کردووە، وتی: کاتێك دەچنە بەهەشت یەکەم خواردنیان چی یە ؟ فەرمووی : پارچە زیادە گۆشتەکەی

جەرگی نەهەنگە، وتی: ئەی گەرما و گەرم لەدوای ئەو چی تردەخۆن ؟ فەرمووی : جوانەگاکەی بەهەشتیان بۆ سەردەبڕن کەلەدەورو بەری بەهەشتدا بۆخۆی دەلەوەڕا، وتی: ئەی چی بەسەردا دەخۆنەوە ؟ فەرمووی : لەئاوی ئەوسەر چەشمەیەی بەهەشت کەناوی سەلسەبیلە،وتی: ڕاست دەکەی هاتووشم شتێکی ترت لێ دەپرسم کە کەس نایزانێ جگە لە پێغەمبەران مەگەر پیاوێك یان دوانی تریش بیزانن، فەرمووی : ئەگەر من پێت بڵێم و بیزانم تۆ ئیسلام دەبی و لەئیسلام بوونت قازانج بەخۆت دەگەیەنی ؟ وتی: جارێك با گوێم لە قسەکانت بێ ، مالومە جولەکەکە وتی : هاتووم لەبارەی منداڵەوە لێت دەپرسم ، فەرمووی: ئاوی پیاو سپی یەو ئاوی ئافرەت زەردە کەلەگەڵ یەکدا دروست بوون و ئاوی پیاو سەر ئاوی ژن کەوت بەفەرمانی خوا نێرینەیان دەبێت ، بەلام ئەگەر ئاوی ژن سەر ئاوی پیاو کەوت ئەوا بەفەرمانی خوا مێ بینەیان دەبێت، مالوومەکە وتی: ڕاستت فەرموو: بەڕاستی تۆ بەهەق پێغەمبەری خوایت،ئەوجار گەڕایەوەو ڕۆیشت ، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: کاتێك ئەو پرسیارانەی لێ دەکردم تا ئەو چرکەیە ئاگام لە وەلامی هیچیان نەبوو بەلام خوای گەورە بەوەحی یەك بەیەك وەلامەکانی بۆم نارد. وەهەروەها پزیشکێکی ناوداری خەڵکی نەجرانیش دوای ووتوو وێژکردنی لەگەڵ پێغەمبەری خوادا بۆی دەردەکەوێت کەئەوەی ئەو پێغەمبەرە دەیڵێ لە خواوە فێرکراوە ، بڕوا دەهێنێ و موسڵمان دەبێت .

پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەواڵی بەهەندێك شتی پزیشکی داوە کەلەو زەمانەی خۆیدا کەس نەیزانیوە و زانستی تازەش ڕاستی یەکەی دەسەلمێنێت ،عەبدوڵلای کوڕی عەمری کوڕی عاص لاوێکی وریاو زیرەك بوو،لەماوەیەکی کەمدا فێری سریانی و قبطی و ڕۆمانی بوو، پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕێی پێدا کە فەرموودە بنوسێتەوەو ئەوەی کە نووسیەوە پێی دەووترا (**الصحيفة الصادقة**) کەزۆر فەرموودەی ڕاست و درووستی پێغەمبەری تیادا

تۆمارکردووەو نوسخەی ئەسڵیشی لەشاری (ستۆکهۆڵم ) ە لە سوید کەلەسەر ڕووبەرێکی فراوان ڕانوێنراوە لەو صحیفەیەدا هاتووە کە پزیشکێکی ناودار کە خەڵکی نەجرانەو ناوی ( شەمەردەل کوڕی قەباس کە عبی ) بوو لە شارەزا یی و داناییدا ڕۆم و فارسەکان دە یانبرد و چا رەسەری نەخۆشی بۆ دە کردن

کا تێك بیستی کە پێغەمبەر (ﷺ) خوای گەورە هەڵی بژاردووە تا دوا پەیامی خۆی کە قورئانی پیرۆزە بۆی بنێرێ، چوو بۆلای و لە نیوەڕۆوە تا عەسر لەخزمەتیدا مایەوە و پرسیاری زۆری لێکردو پێغەمبەر (ﷺ) وەلامی هەموو پرسیارەکانی دایەوە ،پاشان پێغەمبەر (ﷺ) کەوتە پرسیار کردن لێی، هەرچی لێی دەپرسی لە وەلامدا دەی ووت: نازانم ، ئینجا ( شەمەردەل ) دڵنیا بوو ئەوەی پێغەمبەر (ﷺ) دەیزانی لە خواوەیەو بەوەحی بۆی هاتووە و بڕوای پێهێنا،وەهەروەها کافرەکانی قوڕەیشیش کەزۆر سەر سەختانە دژایەتی پێغەمبەری خوایان دەکرد بەلام زۆر سەرسام بوون بەناوازەیی قورئانی پیرۆز و زۆر چاك دەیانزانی کە پێغەمبەر کەسایەتیەکی ئەوەندە ڕاست گۆو پاکەو هەرچی خەسڵەتی بەرزو پایەدار هەیە لەو کەسایەتیە گەورەیەدا کۆبۆتەوە جا هەندێکیان دەهاتنە ناو بازنەی ئیمان و ئیسلام و ڕێگای بەختەوەریان دەگرتە بەر وە هەندێکی تریشیان کەوەك ڕۆژی ڕووناك دەیانزانی هەرچی پێغەمبەر (ﷺ) دەیفەرمووێ ڕاست و تەواوەو کەچی حەسادەت و کوفرو گومڕایی زاڵ بوو بوو بەسەریانداو ڕێگای بەختەوەرییان نەدەگرتەبەر بەڵێ لەهەر کات و سەردەمێکدا ئەگەر خەلکی خۆیان نەخەڵتێن و ووردببنەوە لە قورئان ئاوا زۆر بەجوانی و وەك ڕۆژی ڕووناك بۆیان دەرئەکەوێ کە قورئان کەلامی خوایە و بەرنامەیەکی ڕاست و پاك و تێرو تەواوە باس لەهەموو بابەتەکانی پەیوەست بەژیانی مرۆڤ دەکات سەرەڕای چەندەها هەوڵ و تێکۆشانی ناحەزانی قورئان بەلام نەیان توانیوە تاقە یەك ئایەتیش بەوێنەی قورئان بێنن وەهەرگیزاو هەرگیزیش ناتوانن خوای گەورە لەبارەی

**پاراستنی قورئانەکەی دەفەرمووێ :** ﴿ إِنَّا نَحۡنُ نَزَّلۡنَا ٱلذِّكۡرَ وَإِنَّا لَهُۥ لَحَٰفِظُونَ﴾ الحجر ( ٩ ) **واتە: بێگومان هەر ئێمە قورئانمان ناردۆتە خوارەوە و هەر ئێمەش دەیپارێزین ومهەروەها دەفەرمووێ:**﴿ وَإِن كُنتُمۡ فِي رَيۡبٖ مِّمَّا نَزَّلۡنَا عَلَىٰ عَبۡدِنَا فَأۡتُواْ بِسُورَةٖ مِّن مِّثۡلِهِۦ وَٱدۡعُواْ شُهَدَآءَكُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ* فَإِن لَّمۡ تَفۡعَلُواْ وَلَن تَفۡعَلُواْ فَٱتَّقُواْ ٱلنَّارَ ٱلَّتِي وَقُودُهَا ٱلنَّاسُ وَٱلۡحِجَارَةُۖ أُعِدَّتۡ لِلۡكَٰفِرِينَ﴾ **البقرة ( ٢٣ – ٢٤ ) .**

**واتە : وە ئەگەر ئێوە لەگوماندان لەو قورئانەی کە ئێمە ناردوومانەتە خوارەوە بۆ بەندەی خۆمان موحەممەد ( صلى الله عليه وسلم ) دە سورەتێك بێنن بە وێنەی ئەو ومبانگی هاوکارەکانتان بکەن لە ڕەوانبێژان و شاعیران بێجگە لەخوا ئەگەر ڕاست دەکەن بەفەرموودەی خوای نازانن ئینجا ئەگەر ئەمەتان نەکرد ؟ وەهەرگیز نایشی کەن ئیتر بێ بڕوامەبن دەی خۆتان بپارێزن لەو ئاگرەی کە سوتەمەنی یەکەی خەڵکی بەدکارو بەردە بۆ بێ بڕوایان سازکراوە و ئامادەکراوە وەهەروەها خوای گەورە دە فەرمووێ** ﴿قُل لَّئِنِ ٱجۡتَمَعَتِ ٱلۡإِنسُ وَٱلۡجِنُّ عَلَىٰٓ أَن يَأۡتُواْ بِمِثۡلِ هَٰذَا ٱلۡقُرۡءَانِ لَا يَأۡتُونَ بِمِثۡلِهِۦ وَلَوۡ كَانَ بَعۡضُهُمۡ لِبَعۡضٖ ظَهِيرٗا] **الاسرء ( ٨٧ )**

**واتە : ئەی موحەممەد ( ﷺ ) بڵێ سوێند بەخوا ئەگەر ئادەمی و پەری هەموو کۆببنەوە بۆ ئەوەی وێنەی ئەم قورئانە بهێنن ناتوانن وێنەی ئەو بێنن هەرچەندە پشتیوانی یەکتریش بن**

**خوای گەورە شایەدی بۆ گەورەیی و تێرو تەواوی و قورئانەکەی دەدات ودەفەرمووێ :**﴿ قُلۡ أَيُّ شَيۡءٍ أَكۡبَرُ شَهَٰدَةٗۖ قُلِ ٱللَّهُۖ شَهِيدُۢ بَيۡنِي وَبَيۡنَكُمۡۚ وَأُوحِيَ إِلَيَّ هَٰذَا ٱلۡقُرۡءَانُ لِأُنذِرَكُم بِهِۦ وَمَنۢ بَلَغَۚ أَئِنَّكُمۡ لَتَشۡهَدُونَ أَنَّ مَعَ ٱللَّهِ ءَالِهَةً أُخۡرَىٰۚ قُل لَّآ أَشۡهَدُۚ قُلۡ إِنَّمَا هُوَ إِلَٰهٞ وَٰحِدٞ

وَإِنَّنِي بَرِيٓءٌ مِّمَّا تُشۡرِكُونَ * ٱلَّذِينَ ءَاتَيۡنَٰهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ يَعۡرِفُونَهُۥ كَمَا يَعۡرِفُونَ أَبۡنَآءَهُمُ ٱلَّذِينَ خَسِرُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ فَهُمۡ لَا يُؤۡمِنُونَ﴾ **الأنعام ( ١٩-٢٠ )**

**واتە: ئەی پێغەمبەر (ﷺ) بەوانە بڵێ کەشایەتیان دەوێت لەسەر پێغەمبەرایەتی تۆ کێ هەیە گەورەترین و ڕاستترین شایەدی بدات ؟ هەرخۆت بڵێ : خوای گەورە شایەتە لەنێوان من و ئێوەدا وە ئەو قورئانەشم لە وەحی و نیگا بۆ هاتووە تا ئێوەو هەموو ئەوانەی کە پێیان دەگات ئاگادارو بێدار بکەم لەگەڵ ئەو هەموو ڕوونکردنەوانەدا ئایا بڕواتان وایە کەلەگەڵ خوادا پەرستراوی هەیە؟**

**بڵێ من بەش بەحاڵی خۆم شایەتی ناهەق و ناڕەوای وا نادەم،وە بەڕاستی ئەو خوایە تاك و تەنهایە،وە من بەڕاستی بەریم لەهەموو ئەو شتانەی کەئێوە دەیانکەنە هاوەڵ و شەریکی ئەو زاتە،ئەوانەی کە پەڕاوی ئاسمانیمان پێ بەخشیون لەگاورو جولەکە پێغەمبەر (ﷺ) دەناسن،هەروەك چۆن مناڵەکانی خۆیان دەناسن بەڵام ئەوانەی کەخۆیان لەدەست داوەو خۆیان ڕیسوا کردووەو باوەڕناهێنن. هەروەها دەفەرمووێت:** ﴿لَّٰكِنِ ٱللَّهُ يَشۡهَدُ بِمَآ أَنزَلَ إِلَيۡكَۖ أَنزَلَهُۥ بِعِلۡمِهِۦۖ وَٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ يَشۡهَدُونَۚ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ شَهِيدًا﴾**النسا ( ١٦٦ )**

**واتە: ئەگەر ئەو خەڵکە باوەڕت پێ ناکەن،خوا خۆی شایەتە لەسەر ئەوانەی کە ڕوانەی کردووە بۆت ،دڵنیابە کەلەسەر بنچینەی زانستی خۆی ڕەوانەی کردووە . فریشتەکانیش شایەتی ئەوە دەدەن لەسەر ئەوە هەرچەندە خوا خۆی بەسە بۆ ئەو شایەتیە.**

**بەڵێ خوێنەری بەڕێز: قورئان ئەوەندە کاریگەری هەیە بۆ سەر دڵ و دەروونی خەڵکی هەتا کافەرکانی قوڕەیشیش کاریگەری قورئان لەسەریان هەبووە ،زۆر سەرسام بوون بە بابەتە ناوازەکانی قورئانی پیرۆز ، چەند نموونەیەك لەو بارەوە.**

( ئیبن ئیسحاق ) وتوویەتی: یەزیدی کوڕی زیاد لە موحەممەدی کوڕی کەعبی ئەلقەرەزی یەوە بۆی گێڕامەوە،ووتوویەتی:کە عوتبەی کوڕی ڕەبیعە کە گەورەیەکی قوڕەیش بووە ڕۆژێکیان لەناو قوڕەیشیەکان دانیشتبوو، عوتبە ووتی: ئەی قوڕەیشیەکان ئایا نەچم بۆلای موحەممەدو دووقسەی لەگەڵد ا بکەم و هەندێك فەرمانی بخەمە بەردەست بەو هیوایەی هەندێکیان قبوڵ بکات و ئێمە هەرچی یەکی بیەوێت بیدەینێ ؟ ئەویش وازمان لێ بهێنێت ئەوەش لەکاتێکدا کە حەمزە موسڵمان بووبوو .

بینیان کە هاوڕێکانی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) زیاددەکەن و ژمارەیان زۆر دەبێت ئەوانیش ووتیان :بەڵێ ئەی باوکی وەلید هەستە بڕۆ بۆ لایی و قسەی لەگەڵدا بکە،

عوتبەش هەستایەومو ڕۆیشت بۆلای پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) لەلای دانیشت و ووتی: ئەی برازای خۆم :بۆخۆت دەزانی کە کەسێکی لەئێمەو لەناو عەشیرەتدا ڕێزداریت ئەوەتا شتێکی زۆر گەورەت بۆ تیرەو هۆزەکەت هێناوە، بەهۆیەوە کۆمەڵەکەیانت پەرتەوازە کردووە ، هیواو ئاوات و خەونەکانیانت بەنەفامی داوەتە قەڵەم وخواکان و ئایینەکانیانت عەیبدار کردووە ،باب و باپیری ئەمانت بەهۆی ئەم دینەوە بەکافر داناوە گوێ بۆ من بگرە : من هەندێك شت دەخەمە بەردەستت،تۆش بیریان لێبکەرەوە،بەڵکو هەندێکیان قبوڵ بکەیت، پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) پێی فەرموو :ئەی باوکی وەلید بڵێ منیش گوێ دەگرم، عوتبە ووتی: ئەی برازای خۆم ئەگەر تۆ بەم کارو فەرمانەی کەهێناوتە مەبەستت بەدەست هێنانی پارەو پولە ئەوا لە پارەو پولی خۆمان هێندەت بۆ کۆدەکەینەوە تا لەهەمووومان دەوڵەمەندتر بیت،ئەگەر مەبەستت پێی ڕێزە ئەوا دەتکەینە سەرۆك و گەورە بەسەرخۆمانەوە تەنانەت هیچ فەرمانێك بەبێ تۆ دەرناکەین،ئەگەر مەبەستت موڵکە ئەوا بەسەر خۆمانەوە دەتکەینە موڵکدار، ئەگەر ئەوەی بۆت دێت خەومو دەیبینیت و ناتوانی لەخۆتی دوورخەیتەوە ،ئەوا پزیشکت بۆبانگ دەکەین و هەموو سەروەت وسامانی خۆمانت بۆ خەرج دەکەین، تالێی ڕزگارت دەکەین،چونکە هەندێك

جار دەگونجێت ڕەفتارێك بەسەر پیاودا زاڵ دەبێت تائەو کاتەی خۆی چارەسەر دەکات و لێی ڕزگار دەبێت، پێغەمبەری خوا (ﷺ) گوێی لەعوتبە گرت تا بەتەواوی قسەکانی کرد، پاشان فەرمووی : ئەی باوکی وەلید ئایا بەتەواوی لێبوویتەوە ؟ ووتی: بەڵێ. پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی:دەی گوێم لێ بگرە.وتی: بەڵێ . فەرمووی : ﴿ بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ﴾ ﴿حمٓ * تَنزِيلٌ مِّنَ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ * كِتَٰبٌ فُصِّلَتۡ ءَايَٰتُهُۥ قُرۡءَانًا عَرَبِيًّا لِّقَوۡمٍ يَعۡلَمُونَ * بَشِيرًا وَنَذِيرًا فَأَعۡرَضَ أَكۡثَرُهُمۡ فَهُمۡ لَا يَسۡمَعُونَ * وَقَالُواْ قُلُوبُنَا فِيٓ أَكِنَّةٍ مِّمَّا تَدۡعُونَآ إِلَيۡهِ﴾ الفصلت(١- ٤ ) .

پاشان پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەخوێندنی قورئان بەسەریدا بەردەوام بوو ، کاتێك کە عوتبە گوێی لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەگرت کە قورئانی دەخوێند بێدەنگ بوو دەستەکانی خستە پشتیەوەو خۆیدا بەسەریاندا،گوێی لێدەگرت، پاشان پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە قورئان خوێندنەکەیدا بەگەشتنە سوجدە کۆتایی هێنا.سوجدەکەی بردو پاشان فەرمووی : ئەی باوکی وەلید بەڕاستی ئەوەی بیستت ئەو شتەی کە بۆمن هاتووەو ئێستاش تۆو ئەوە،عوتبە هەستایەوەو ڕۆشتەوە بۆلای هاوڕێکانی ،هەندێکیان بەهەندێکی تریان دەووت سوێند بەخوا دەخۆین ئەبو وەلید بەدەم و چاوێکەوە هاتۆتەوە بۆلاتان جیایە لەو دەم و چاوەی کە پێوەی ڕۆیشت ، کاتێك هاتەوە لایان و لەلایان دانیشت و ووتیان ئەی باوکی وەلید چیت لەژێر سەردایە؟ وتی: ئەوەم لەژێر سەردایە کەمن گوێم لەقسەیەك بوو سوێند بەخۆ هەرگیز قسەی وام نەبیستووە،سوێند بەخوا ئەو شیعر نی یەو سیحر نی یە،فالگرەوەو نهێنی زان نی یە،ئەی هۆزی قوڕەیش گوێڕایەڵیم بکەن و کێشەی موحەممەد بدەنە دەستی من،ڕێگە چۆڵکەن لەنێوان ئەو پیاوەو لەنێوان ئەوەی کەلە بانگەوازەکەیدایە وازی لێ بهێنن،

سوێند بەخوا ئەو قسانەی کەمن لەوەوە بیستم هەواڵێکی زۆر گەورە بەڕێوەیە، جا ئەگەر عەرەب بەشیان بەرکەوت لەبانگەوازەکەی ئەوا بەکەسانی جگە لەخۆتان پاڵپشتی دەکەن، ئەگەر سەرکەوت بەسەر عەرەبدا ئەوا موڵکی ئەو دەبێتە موڵکی ئێوە، سەربەرزی ئەو دەبێتە سەربەرزی ئێوە ،ئێوە دەبنە بەختەوەرترین مرۆڤ بەهۆی ئەوەوە، ئەوانیش ووتیان :سوێند بەخوا ئەی باوکی وەلید بەزمانەکەی سیحری لێکردوی، وتی: ئەمە بیرو باوەڕی منە سەبارەت بەو، ئێوەش چی بەباش دەزانن وابکەن. وەهەروەها شەوێکیان ئەبو جەهل و ئەبو سوفیان وئەخنەسی کوڕی شەریق ،هەریەکە بەجیاو بۆخۆی لەماڵ دەردەچن و تاکە پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەماڵەوە شەو نوێژ دەکات گوێ لە قورئان خوێندنەکەی بگرن، هەریەکەیان شوێنێکی بۆخۆی گرت تاگوێ بگرێ و هیچ کامیشیان بە شوێنەکەی دوانەکەی تر نازانێت، ئەو شەوە گوێیان گرت، تاکە ڕۆژیان لێ بوویەوەو بەرەبەیان هات هەریەکەیان لە شوێنەکەی خۆی هەستاو لەڕێگا یەکیان گرتەوە کەبەیەکتریان زانی، لۆمەی خۆیان کردو بەیەکتریان ووت: نەگەڕێنەوە ئەگەر سەفیهێکیان بتان بینێ ئەوا ئەبنەهۆی ئەوەی کە شتێك بکەوێتە دڵیەوە پاشان ڕۆیشتن .

بۆ شەوی دووەم هەرپیاوێکیان بەبێ ئاگاداری لەهاتنی دوانەکەی تر لەشوێنەکەی خۆی دانیشتەوەو شەو هەتا بەیانی گوێی گرت، تاکەبەرەبەیان دەرکەوت هەریەك لەشوێنی خۆی هەستاو لەڕێگا یەکیان گرتەوە، ئەم جارەش وەك جاری پێشوو ئامۆژگاری یەکتریان کردەوە و پاشان ڕۆیشتن، بۆ شەوی سێ یەم دیسان هەر پیاوێکیان چوونەوە بۆ شوێنەکەی خۆی و دانیشتن و هەتا بەیانی گوێیان لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) گرت و تا کە بەرەبەیان دەرکەوت هەریەکەیان لەشوێنی خۆی هەستاو لەڕێگا یەکیان گرتەوەو ووتیان:هەتا پەیمان نەدەین کە جارێکی تر نەگەڕێینەوە ،ئەم شوێنەبەجێ ناهێڵین ئەوەبوو پەیمانیان لەسەر

ئەگەڕانەوە داو ، پاشان لێك جوودا بوونەوە ،کەڕۆژ بوویەوە ئەخنەسی کوڕی شەریق داردەستەکەی هەلگرت و خۆی گەیاندە ماڵی ئەبو سوفیان و ووتی: ئە بوو

حە نظلە لە دەربارەی ئەوەی کەلە موحەممەدت بیست ڕات چی یە؟ ووتی: ئەبو پە علە بە بەخوا هەندێك شتم بیست کەئەم زانی چین و مەبەستەکەشیانم ئەزانی و،هەندێك شتیشم بیست کەنەمانام زانین نەمەبەستیان، ئەخنەس ووتی: بەو خوایەی کەسوێندت پێ خوارد منیش هەروابووم، لای ئەو دەرچوو وخۆی گەیاندەلای ئەبو جەهل و چووە ژوورەوە لای و ووتی: دەربارەی ئەوەی کەلە موحەممەدت بیست ڕات چی یە ؟ وتی: جا چیم بیستووە؟ ئێمەو ئەوەی عەبدول مەناف لەسەر شەرەف و پایەداری ناکۆکی کەوتە نێوا نمان:نانیان دا ئێمەش نا نمان دا ،کۆڵیان هەلگرت ئێمەش کۆڵمان هەلگرت،شتیان بەخشی ئێمەش شتمان بەخشی،تا کە بەرامبەر یەك بەیەکسانی وەستاین،ووتیان :ئێمە پێغەمبەرێکمان تیادا هەلکەوتووە کەلە ئاسمانەوە وەحی بۆ دێت، جا ئێمە کەی بەوە دەگەینەوە ؟ دەبەخوا هەرگیز ئیمانی پێ ناهێنین و تەصدیقیشی ناکەین

بەڕاستی خوێنەری بەڕێز : بەڵگەی هەرە گەورەی پێغەمبەری ئیسلام کەدەیسەلمێنێ بەڕاستی ودڵنیایی پێغەمبەری خوایە،نەخوێندەواریەکەیەتی شتێکی بەڵگە نەویستە کە پێغەمبەرمان ( ﷺ ) نەخوێندەوار بووە ئەی باشەچۆن زانی باس لەو هەموو شتانەی کە پەیوەستن بەژیانی مرۆڤ و بوونەوەرو هەموو پێداویستیەکانی تر بکات هەرچیش فەرموویەتی وەك ڕۆژی ڕووناك هاتوونەتە دی نەخوێندەواری پێغەمبەر ( ﷺ ) خوای گەورە لەقورئانە کەیدا زۆر بەڕاشکاوی باسی کردووە وەك دەفەرمووێ:﴿ ٱلَّذِينَ يَتَّبِعُونَ ٱلرَّسُولَ ٱلنَّبِيَّ ٱلۡأُمِّيَّ ٱلَّذِي يَجِدُونَهُۥ مَكۡتُوبًا عِندَهُمۡ فِي ٱلتَّوۡرَىٰةِ وَٱلۡإِنجِيلِ يَأۡمُرُهُم بِٱلۡمَعۡرُوفِ وَيَنۡهَىٰهُمۡ عَنِ ٱلۡمُنكَرِ وَيُحِلُّ لَهُمُ ٱلطَّيِّبَٰتِ وَيُحَرِّمُ عَلَيۡهِمُ ٱلۡخَبَٰٓئِثَ وَيَضَعُ عَنۡهُمۡ إِصۡرَهُمۡ وَٱلۡأَغۡلَٰلَ ٱلَّتِي كَانَتۡ عَلَيۡهِمۡۚ

فَالَّذِينَ ءَامَنُواْ بِهِۦ وَعَزَّرُوهُ وَنَصَرُوهُ وَاتَّبَعُواْ النُّورَ الَّذِيٓ أُنزِلَ مَعَهُۥٓ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ * قُلْ يَٰٓأَيُّهَا النَّاسُ إِنِّي رَسُولُ اللَّهِ إِلَيْكُمْ جَمِيعًا الَّذِي لَهُۥ مُلْكُ السَّمَٰوَٰتِ وَالْأَرْضِ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ يُحْيِۦ وَيُمِيتُ فَـَٔامِنُواْ بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ النَّبِيِّ الْأُمِّيِّ الَّذِي يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَكَلِمَٰتِهِۦ وَاتَّبِعُوهُ لَعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ﴾**الاعراف ( ١٥٧-١٥٨ )، واتە :ئەوانەی شوێن پێغەمبەرو نێردراوی نەخوێندەوار دەكەون لەلایەن پەروەردگارەوە هاتووە ئەوكەسەی كەنامەدارەكان دەیبینن بەنووسراوی لایانە لەتەورات و ئینجیلدا كە فەرمانیان پێدەكات بەچاكەو ڕێگریان لێدەكات لەخراپە،شتە خاوێن وپاكەكانیان بۆ حەڵاڵ دەكات و شتە پیسەكانیان لێ قەدەغە دەكات وبارە قورس و گرانەكانیان لەسەر لادەبات و ئەو كۆت و زنجیرانەش كەبەسەریانەوە بوون ، ئینجا ئەو كەسانەی كە باوەڕیان بەو پێغەمبەرە هێنابێت و ڕێزو قەدریان بۆدانابێت یارمەتیان دابێت و پشتیوانیان لێ كردبێت و پەیڕەوی ئەو نوورەیان كردبێت كەقورئانە كەلەگەڵیدا نێردراوەتە خوارەوە .**

**ئەمانە هەمووی كەباس كران لەڕزگار بوانن ئەی موحەممەد ( صلی الله علیه وسلم ) بڵێ ئەی خەڵكینە بەڕاستی من پێغەمبەری خوام بۆ ئێوە هەمووتان ئەوخوایەی كە تەنها بۆ ئەوە موڵكایەتی هەموو ئاسمانەكان و زەوی بەهیچ پەرستراوێكی ڕاست نی یە جگە لەو ،ئەو دەژیێنێت و دەمرێنێت كەواتە بڕوا بەخواو پێغەمبەرەكەی بهێنن كە نێردراوێكی نەخوێندەوارە ئەویش بڕوای بەخواو ووتەكانی هەیە ئێوەش شوێنی بكەون و پەیڕەوی بكەن تابكەونە سەر ڕێگای ڕاست ...**

**بەڵی خوێنەری بەڕێز:خوای گەورە لەو چەند ئایەتی قورئانە پیرۆزەكەیدا دووجار ئەو ڕاستی یە دووبارە دەكاتەوە كە پێغەمبەرمان ( ﷺ ) نەخوێندەوار بووە هەروەها خوای گەورە**

دەفەرمووێ: ﴿هُوَ ٱلَّذِى بَعَثَ فِى ٱلْأُمِّيِّۦنَ رَسُولاً مِّنْهُمْ يَتْلُواْ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتِهِۦ وَيُزَكِّيهِمْ وَيُعَلِّمُهُمُ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ وَإِن كَانُواْ مِن قَبْلُ لَفِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ﴾ الجمعه (٢)

واتە: خوا ئەو زاتەیە کەناردوویەتی لەناو نەخوێندەواران پێغەمبەرێکی نەخوێندەوار لەخۆیان کەئایەتەکانی خوا ئەخوێنێتەوە بەسەریانداو پاکیان دەکاتەوە وەنامەی قورئان و فەرموودەی پڕسوودیان فێردەکات هەرچەندە ئەوان لەمەو پێش لەگومڕاییەکی ئاشکرا دابوون،

خوای پەروەردگار بەڵێن بە پێغەمبەرەکەی دەدات کەقورئان لەسنگیدا کۆبکاتەوە، وەك دەفەرمووێ: ﴿لَا تُحَرِّكْ بِهِۦ لِسَانَكَ لِتَعْجَلَ بِهِۦٓ * إِنَّ عَلَيْنَا جَمْعَهُۥ وَقُرْءَانَهُۥ * فَإِذَا قَرَأْنَٰهُ فَٱتَّبِعْ قُرْءَانَهُۥ * ثُمَّ إِنَّ عَلَيْنَا بَيَانَهُۥ﴾ القيامة (١٦- ١٩) واتە: زمانت مەجوڵێنە بەخوێندنەوەی سروش تا پەلەی تیادا بکەیت ،بەڕاستی بەپێی بەڵێنێك کەداومانە لەسەر ئێمەیە کۆکردنەوەی لەسنگتاو خوێندنەوەی ئینجا کەقورئانمان بۆ خوێندیتەوە بەهۆی جبرائیلەوە پەیڕەوی خوێندنەوەی ئەو بکە پاشان هەرچیت ویست بۆت ڕوون دەکەینەوە و بۆت ڕاڤە دەکەین وە خوای گەورە بەپێغەمبەرەکەی دەفەرمووێ: ﴿ سَنُقْرِئُكَ فَلَا تَنسَىٰٓ ﴾ الاعلى (٦)

واتە: ئەی موحەممەد (ﷺ) قورئانت بەسەردا دەخوێنینەوەو هەرگیز بیرت ناچێتەوە، دوای ئەم بەڵێنانەی خوای گەورە پێغەمبەر (ﷺ) کەسرووشی بۆ دەهات ،سەری دادەخست و گوێ ی بۆ دەگرت تا لێ دەبۆوە، ئینجا لەبەر خۆیەوە دەوری دەکردەوەو هەمووی لەدڵیا دەچەسپی .

بەڵێ خوێنەری بەڕێز: ئەو بەڵگەو بەسەر هاتانەی کەباسمان کردن هەموویان وەك ڕۆژی ڕووناك سەلمێنەری ئەو ڕاستی یە گەورەیەن کە

پێغەمبەر (ﷺ) خوای گەورە هەڵی بژاردووە تا دوا پەیامی خۆی بەهۆی ئەوەوە بە مرۆڤایەتی بگەیەنێت...

## خوێنەری بەڕێز :

لەم کتێبەدا کۆمەڵێکی ئێجگار زۆر لەموعجیزە گەورەو ناودارەکانی پێغەمبەری پایە بەرزی ئیسلام موحەممەد (ﷺ) خراونەتە ڕوو لەژێر تیشکی فەرمووده صەحیحەکانی دا لە چەندین بواری جۆراوجۆردا کەهەر یەکێك لەو موعجیزانە خۆی لەخۆیدا گەورەترین بەڵگەونیشانەیە لەسەر ڕاست و دروستی پێغەمبەرایەتی ئەم پێغەمبەرە پایەدارە جا هیوادارم ئەم موعجیزانە زیاتر ببنە مایەی دڵخۆش بوون و پتەوبونی بڕوای بڕوا داران وەبەڵگەیەکی زۆر گەورەش بن بۆ ئەو کەسانەی کە لە ڕێبازی ئەو پێغەمبەرە (ﷺ) دوورن ببنە هۆی ڕەواندنەوەی گومان و دوودڵی ناو دڵەکانیان و ئاشنابوونیان بەڕێبازی سەرفرازی و بەختەوەری ئیسلام .

وەداوا لەخوای پەروەردگار دەکەم کە ئەم نووسراوەم بۆ بکات بە زەخیرە و توێشووی ڕۆژی قیامەت وەخوای گەورە وامان لێ بکات هەرچی کە دەیڵێین و دەینوسین تەنها مەبەستمان ڕەزامەندی خوای پەروەردگار بێت .

عەبدولڕەزاق ڕەزاق ئەحمەد / ڕانیة

## موعجیزەی (١) ڕووداوی گەورەی ئیسرا و میعراج و دەرکەوتنی سێ موعجیزەی پایەدار :

لەدوای ئەوەی کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) بانگەوازە پیرۆزەکەی بەرنامەی خوای گەورەی ئاشکرا کردکافرە بتپەرستەکانی قوڕەیش بەهەموو توانایەکیانەوە کەوتنە ئازاردانی پێغەمبەرو هاوەڵانی شەوو ڕۆژ لەبۆسەدا بوون بۆئەوەی نەهێڵن ئەو بانگەوازە پیرۆزە بڵاوبێتەوە پێغەمبەری خواش (ﷺ) زۆر لێبڕاوانە بێ ووچان هەوڵی دەدا تا خەڵکی بەرەو بەرنامەکەی خوا بانگ بکات وە بنکەیەکیشی بۆ ئەم بانگەوازە پیرۆزە دیاری کردبوو کە ماڵی ( ئەرقەم ) بوو وە ئەبووتاڵیبی مامیشی پشتگیری لێدەکرد،کافرەکان چەندین جار سەردانی ئەبوتاڵیبیان کرد بۆ ئەوەی پێغەمبەریان تەسلیم بکات و واز لە پشتگیری ئەو بهێنێ بەڵام ئەبو تالیب هەموو جارێك ئەو داوایەی ئەوانی دەدایەوە دواوەو ڕازی نەبوو بەو پێشنیارەیان،ئەوجار کافرەکان بینیان ئەو بانگەوازە پیرۆزە وا ڕۆژ لەدوای ڕۆژ دەچێتە ناو دڵی خەڵکی و بەرەو ئیمان و ئیسلام دەیانهێنێ بڕیارێکی ستەمکارانەیان دەرکرد کەنابێ کەس ژن و ژن خوازی و کڕین و فرۆشتنیان لەگەڵدا بکات،بۆماوەی سێ ساڵ پێغەمبەرو یارانی لەشیوی ئەبو تالیب بەبرسیەتی و فەقیری ژیانیان بردە سەر وەلەدوای هەڵوەشاندنەوەی ئەم بڕیارە ستەمکارانەیە خەم ومەینەتی و برسیەتی لەکۆڵ ئەوەی هاشم و ئەوەی موطە لیب کەوتن ، پێغەمبەری خواش (ﷺ) باری سەرشانی سووك بوو ،وە کاروباری مەککە وەك جاران ئاسایی بۆوە ،بەڵام ئەوە بوو دووڕووداو ڕوویاندا ،ئەوانیش بریتی بوون لەکۆچی دوایی خەدیجەی خێزانی پێغەمبەرو ئەبو تالیبی مامی ،کافرەکان دوای مردنی ئەبو تالیب زیاتر

بوونە مایەی ئازاردانی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) جا پێغەمبەر بۆ دووركەوتنەوە لەوهەموو خەفەت و ناڕەحەتی یە بەرەو تایف ڕۆیی سا بەشكو لەوێ ببنە پاڵپشت و یارمەتی دەری تا بانگەوازەكەی بلاو بكاتەوە بەلام نەفامەكانی تایفیش نەك هەر نەبوونە پاڵپشتی و یارمەتی دەری ، منداڵە ووردەو نەفامەكانیان لێهانداو كەوتنە بەرباران كردنی پێغەمبەرو ئەو هاوەڵەی كەلەخزمەتیدا بوو ،زەیدی كوڕی حاریسە جا لەدوای گەڕانەوەی بۆ مەككە خوای گەورە بۆ دڵدانەوەی پێغەمبەرو سووك كردنی ئەو بارە قورس و گرانەی سەرشانی ئەو ئازیزەی گرتبوو موعجیزەیەكی زۆر گەورەو بایەخداری پیشانی پێغەمبەرەكەیدا، كەئەویش موعجیزەی ئیسراو میعراج بوو ، جابابزانین موعجیزەی ئیسراو میعراج چی یەو چۆنە ؟

ئیسرا : بردنی پێغەمبەر ( ﷺ ) بوو لەلایەن خوای گەورەو بەدەسەلاتەوە لەمزگەوتی حەرامەوە لەمەككە بۆ مزگەوتی ئەقصا لە قودس ،ئەویش لەبەشێكی شەوداو گەڕانەوەی بۆ شوێنی خۆی هەر لەوشەوەدا ...

میعراجیش : بەرزكردنەوەی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) بوو لەبەیت و المەقدیسەوە بۆ حەوت ئاسمانەكەو زۆرتریش ،كەئەوە بوو پێنج فەرزەی نوێژ فەڕزكران و گەڕانەوەشی بۆ بەیتولەقدیس ،خوای گەورە لەقورئانەكەیدا باسی ڕووداوی ئیسرای كردووەو فەرموویەتی:

﴿ سُبۡحَٰنَ ٱلَّذِيٓ أَسۡرَىٰ بِعَبۡدِهِۦ لَيۡلٗا مِّنَ ٱلۡمَسۡجِدِ ٱلۡحَرَامِ إِلَى ٱلۡمَسۡجِدِ ٱلۡأَقۡصَا ٱلَّذِي بَٰرَكۡنَا حَوۡلَهُۥ لِنُرِيَهُۥ مِنۡ ءَايَٰتِنَآۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡبَصِيرُ﴾ **الإسراء** ( ١ )

واتە : پاك و بێگەردی بۆ ئەو زاتەی كەشەو ڕەوی كرد بەبەندەی خۆی لەشەوێكدا لەمزگەوتی بەرێزو پیرۆزەوە ( مەككە ) بۆ مزگەوتی ( الاقصی ) لە ﴿ بیت المقدس﴾ كە دەورو بەریمان پیرۆزو فەڕدار كردووە بۆ ئەوەی هەندێك بەڵگەو نیشانە ڕوونەكانی خۆمانی نیشان بدەین بەڕاستی هەر ئەو بیسەری بینایە . وەلەسوڕەتی ﴿النجم ﴾ دا ئاماژە كراوە بۆ میعراج

.قورئـان دەفـەرمووێ :﴿ وَلَقَدۡ رَءَاهُ نَزۡلَةً أُخۡرَىٰ * عِندَ سِدۡرَةِ ٱلۡمُنتَهَىٰ * عِندَهَا جَنَّةُ ٱلۡمَأۡوَىٰٓ *إِذۡ يَغۡشَى ٱلسِّدۡرَةَ مَا يَغۡشَىٰ *مَا زَاغَ ٱلۡبَصَرُ وَمَا طَغَىٰ *لَقَدۡ رَأَىٰ مِنۡ ءَايَٰتِ رَبِّهِ ٱلۡكُبۡرَىٰٓ ﴾النجم (١٣- ١٨ ) . واتە : سوێند بەخوا بێگومان جارێکی تر جوبرەئیلی بینیـوە لای درەختی ( سیدرەتو لـمونتەها ) کەلای ئەوەوەیە بەهەشتی نیشتەجێ بوون کاتێ کە سیدرەی دا پۆشی ئەوی کە داپۆشی چاوی ئەو موحەممەد (ﷺ) بەم لاو لادا نەی دەنـواڕی لەمەبەست تێ نەدەپەڕی سوێند بەخوا بێگومـان بینـی گـەورەترین بەڵگـەو نیشـانەی پـەروەردگاری ...

عەبدوڵلای کوڕی مەسعودو عائیشەی دایکی بـڕواداران – خـوا لێیـان ڕازی بێـت ،ئـەوەیان لێ ڕیوایەت کراوە کەئەوەی کەلەئایەتی سیازدەهەمدا کە لێیـان دەفـەرمووێ : بینـراوە جبرائیـل بووە ، کە پێغەمبەری خوا بەو شێوەی خوا دروستی کـردووە و بینیویـەتی و تـەنها دووجـاریش بەو شێوەیەی بینیویەتی: یەکەمیان ئەوکاتەی کەلە ئەشکەوتی حـەڕا دەهاتـە خـوارەوە و دووەمـیش شـەوی میعـراج ،ئـیبن کـەثـیر لەتەفسـیرەکەیدا ئـەوەمان بـۆ ڕووندەکاتـەوە کـە پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) دووجـار جبریلـی سـەلامی لێ بـێ بـەو شـێوەیە دیـوە کـەخوای گـەورە دروستی کردووە.

**یەکەم**: دوای وەستانی وەحـی کـە پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) لەئەشـکەوتی حـەڕا دەهاتـە خوارەوە بەشێوەی خـۆی کـە شـەش سـەد بـاڵی هـەبوون ولەبەرگـەورەیی ئاسـۆی دا پۆشـی بـوو ،چاوی پێکەوت ئەوەبوو لێی نزیك کەوتەوەو ئەو وەحیەشی پێ گەیاند کە خوای گـەورە بـۆی ناردبوو ،خوای گەورە لەو بارەیەوە فەرموویەتی :

﴿ عَلَّمَهُۥ شَدِيدُ ٱلۡقُوَىٰ *ذُو مِرَّةٖ فَٱسۡتَوَىٰ *وَهُوَ بِٱلۡأُفُقِ ٱلۡأَعۡلَىٰ *ثُمَّ دَنَا فَتَدَلَّىٰ *فَكَانَ قَابَ قَوۡسَيۡنِ أَوۡ أَدۡنَىٰ *فَأَوۡحَىٰٓ إِلَىٰ عَبۡدِهِۦ مَآ أَوۡحَىٰ ﴾ النجم (٥-١٠ )

**واتە :جوبرەئیلی زۆر بەتوانا فێری کردووە خاوەنی بیرو هۆشی بەهێزە، جا لەسەرشێوەی ڕاستەقینەی خۆی ڕاوەستاوە کەبەئاسۆی هەرە بەرزی ئاسمانەوە بووپاشان نزیك بوویەوە لە موحەممەد (ﷺ ) ئینجا هاتەخوارەوە تابەئەندازەی دووکەوان یان کەمتری ماوە مابوو لەگەڵ موحەممەددا (ﷺ ) ئینجا ﴿خوا ﴾ سروشی کرد بۆ بەندەکەی خۆی ئەوەی کە بۆی کرد.**

**دووەمیش : لەشەوی ئیسراو میعراجدا لە لای ﴿ سدرة المنتهى ﴾ وەك لەسورەتی ﴿ النجم ﴾ دا ئاماژەی بۆ کراوە وەك قورئان دەفەرمووێ:﴿** وَلَقَدۡ رَءَاهُ نَزۡلَةً أُخۡرَىٰ*عِندَ سِدۡرَةِ ٱلۡمُنتَهَىٰ **﴾ النجم (١٣-١٤ ) واتە : سوێند بەخوا بێگومان جارێکی تر جبرەئیلی بینیوە لای درەختی ( سیدرەتو لمونتەها ) ، دەربارەی ئایەتی ﴿**ثُمَّ دَنَا فَتَدَلَّىٰ**﴾ النجم (٨ ) مەبەستی لەنزیك بوونەوەی جبریلە، وەك عائیشەی دایکی ئیمانداران و عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود ( خوا لێیان ڕازی بێ ) دەریان بڕیوە، بەلاّم نزیك بوونەوە لەچیرۆکی ئیسرادا نزیگ بوونەوەی خوای گەورەیە وکۆڕای زانایان ڕایان لەسەر ئەوەیە کەگەشتی ئیسراو میعراج لەیەك شەودا بووەو لەکاتی بێداری پێغەمبەر (ﷺ ) بووەو بەلاشەو بەڕۆحیش بووەو ، فەرموودەی صەحیحی زۆر لەو بارەوە هاتوون هەروەها فەرموودەی صەحیحیش هەن کەسنگی پیرۆزی لەت کراوەو سواری بوڕاق بووەو پێنج فەرزەی نوێژ فەرز کراون و فەرمایشی لەگەڵ خوادا کردووە ،وهاتوچۆی نێوان خوای گەورەو مووسا پێغەمبەری کردووە بۆ کەم کردنەوەی ژمارەی نوێژەکان 'ئەمانەهەر هەموویان دەی سەلمێنن کە پێغەمبەری خوا (ﷺ ) گەشتی ئیسراو میعراجی بە لاشەو بە ڕۆح ئەنجام داوە، هەردوو ئیمامی فەرموودە لەصەحیحەکەیاندا بەسەنەدی خۆیان [1] لەقەتادەوە لەئەنەسی کوڕی مالیکەوە لە لەمالیکی کوڕی صەعصەعەوە لەفزەکەش هی**

---

[1] صحيح البخاري باب المعراج ٥/ ٦٦ ، صحيح مسلم بشرح النووي ٢/ ٢٢٣ - ٢٢٥

بوخاری یە ڕیوایەتیان کردووە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) باسی ئەو شەوەی بۆ کردوون کەشەو ڕەوی پێ کراوە و فەرموویەتی: لەکاتێکدا کە حیجر دا بووم و ڕاکشابووم ،یەکێك هات بۆلام قەتادەباسەکەی بڕی و ووتی: گوێم لێی بوو دەیفەرموو: هەرلێرەوە تائەوێی هەڵدری وتم بەجارود مەبەستی چی یە پێی ؟ وتی : لەقوڕگی یەوە هەتا خوار ناوکی ،ئەوە بوو دڵمی دەرهێنا پاشان تەشتێکی زێڕینیان بۆهێنام کە پڕبوو لەشتێك کەشۆرین پێی ئیمان و ژیری و لێزانی تێری تەواو دەکات،دڵم شۆری پاشان پڕکرایەوە و خرایەوە شوێنی خۆی ، پاشان وولاغێکی سپیم بۆ هێنرا کەلە ئێستر بچووکترو لەگوێ درێژیش گەورەتر بوو، جاروود لێی پرسی:بوراقە ئەی ئەنەس؟ ئەنەس ووتی: بەڵێ تاکوێ چاوی بڕ بکات بەیەك هەنگاو دەیگاتێ ، پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرمووێ: سواری کرام و جبریل کەوتە گەڵم تا گەیشتە ئاسمانی دونیاو داوای کرد دەرگای بۆبکەنەوە،فریشتە ووتیان ئەوە کێ یە ؟فەرمووی :جبریلم،ووتیان ئەی کێت لەگەڵە ؟فەرمووی :موحەممەد ،وتیان نێردراوە بەدوای دا ؟ فەرمووی :بەڵێ،وتیان :بەخێربێت هاتنێکی چاکە ئیتر دەرگا کرایەوە کەچوومە ژوورەوە دەبینم وائادەم سەلامی خوای لێ بێ لەوێ یە فەرمووی:ئەوە ئادەمی باوکتە سەلامی لێ بکە،سەلامم لێ کردو ئەویش وەلامی سەلامەکەی دایەوەو پاشان فەرمووی :کوڕی صالح و پێغەمبەری صالح بەخێربێت، پاشان جبریل بەرزی کردمەوە هەتا گەیشتمە ئاسمانی دووهەم وداوای کرد دەرگای بۆبکەنەوە ،فریشتە ووتیان ئەمە کێ یە؟ فەرمووی:جبریلم،ووتیان ئەی کێت لەگەڵە ؟فەرمووی :موحەممەد ،وتیان نێردراوە بەدوای دا ؟ فەرمووی :بەڵێ،وتیان :بەخێربێت هاتنێکی چاکە ئیتر دەرگا کرایەوە،کەچوومە ژوورەوە دەبینم یەحیاو عیسا سەلامی خوایان لێ بێ کە پورزای یەك بوون لەوێن،فەرمووی :ئەوە ئەمە یەحیاو عیسان سەلامی خوایان لێ بێ سەلامیان لێ بکە، سەلامم لێ کردن و ئەوانیش وەلامی سەلامەکەیان دایەوەو پاشان فەرموویان :برای صالح و پێغەمبەری صالح بەخێربێت، پاشان جبریل بەرزی

کردمەوە بۆ ئاسمانی سێ هەم وداوای کرد دەرگای بۆبکەنەوە ،فریشتە ووتیان ئەمە کێ یە؟ فەرمووی:جبریلم، ووتیان ئەی کێت لەگەڵە ؟فەرمووی :موحەممەد ،وتیان نێردراوە بەدوای دا ؟ فەرمووی :بەڵێ،وتیان :بەخێربێت هاتنێکی چاکە ئیتر دەرگا کرایەوە،کەچوومە ژوورەوە دەبینم وا یوسف لەوێ یە فەرمووی :ئەوە یوسفی براتە سەلامی لێ بکە،سەلامم لێکردو ئەویش وەڵامی سەلامەکەی دایەوە، پاشان فەرمووی: برای صالح و پێغەمبەری صالح بەخێربێت. پاشان بەرز کرامەوە بۆ ئاسمانی چوارەم و داوای کرد دەرگای بۆبکەنەوە ،فریشتە ووتیان ئەمە کێ یە؟ فەرمووی:جبریلم، ووتیان ئەی کێت لەگەڵە ؟فەرمووی :موحەممەد ،وتیان نێردراوە بەدوای دا ؟ فەرمووی :بەڵێ،وتیان : بەخێربێت هاتنێکی چاکە ئیتر دەرگا کرایەوە،کەچوومە ژوورەوە دەبینم وا ئیدریس لەوێ یە فەرمووی :ئەوە ئیدریسە سەلامی لێ بکە،سەلامم لێکردو ئەویش وەڵامی سەلامەکەی دایەوە، پاشان فەرمووی: برای صالح و پێغەمبەری صالح بەخێربێت. پاشان بەرز کرامەوە هەتا گەیشتمە ئاسمانی پێنجەم و داوای کرد دەرگای بۆبکەنەوە ،فریشتە ووتیان ئەمە کێ یە؟ فەرمووی:جبریلم، ووتیان ئەی کێت لەگەڵە ؟فەرمووی :موحەممەد ،وتیان نێردراوە بەدوای دا ؟ فەرمووی :بەڵێ،وتیان :
بەخێربێت هاتنێکی چاکە ئیتر دەرگا کرایەوە کەچوومە ژوورەوە دەبینم وا هاروون لەوێ یە فەرمووی: ئەوە هاروونە سەلامی لێ بکە،سەلامم لێکردو ئەویش وەڵامی سەلامەکەی دایەوە، پاشان فەرمووی: برای صالح و پێغەمبەری صالح بەخێربێت. پاشان بەرز کرامەوە هەتا گەیشتمە ئاسمانی شەشەم و داوای کرد دەرگای بۆبکەنەوە ،فریشتە ووتیان ئەمە کێ یە؟ فەرمووی:جبریلم، ووتیان ئەی کێت لەگەڵە ؟فەرمووی :موحەممەد ،وتیان نێردراوە بەدوای دا ؟ فەرمووی :بەڵێ،وتیان : بەخێربێت هاتنێکی چاکە ئیتر دەرگا کرایەوە کەچوومە ژوورەوە دەبینم وا مووسا لەوێ یە فەرمووی :ئەوە مووسایە سەلامی لێ بکە،سەلامم لێکردو ئەویش وەڵامی سەلامەکەی دایەوە، پاشان فەرمووی: برای صالح و پێغەمبەری صالح

بەخێربێت.کە تێپەڕیم دەستی بەگریان کردو پێی ووترا :چی ئەتگریێنی؟ ووتی :بۆ ئەوە دەگریم دوای من منداڵێك کراوە بە پێغەمبەر کەلە ئوممەتەکەی ئەو زیاتر لەئوممەتەکەی من دەچنە بەهەشت . پاشان بەرز کرامەوە هەتا گەیشتمە ئاسمانی حەوتەم و داوای کرد دەرگای بۆبکەنەوە ،فریشتە ووتیان ئەمە کێ یە؟ فەرمووی:جبریلم، ووتیان ئەی کێت لەگەڵە ؟فەرمووی :موحەممەد ،وتیان نێردراوە بەدوای دا ؟ فەرمووی :بەڵێ،وتیان : بەخێربێت هاتنێکی چاکە ئیتر دەرگا کرایەوە کەچوومە ژوورەوە دەبینم وا ابراهیم لەوێ یە فەرمووی :ئەوە باوکتە سەلامی لێ بکە،فەرمووی: سەلامم لێکردو ئەویش وەڵامی سەلامەکەی دایەوە، پاشان فەرمووی: برای صالح و پێغەمبەری صالح بەخێربێت.

پاشان بەرزکرامەوە بۆ ﴿سدرة المنتهى﴾ دەبینم بەرهەمی درەختەکانیان وێنەی کوپەی هەجەرەو گەڵاشیان بەوێنەی گوێچکەی فیلە،جبریل فەرمووی :ئەمە ﴿سدرة المنتهى﴾ یە دەبینم چوار ڕووباری لێ یە فەرمووی چوار ڕووبارم بینی دوو ڕووباریان ڕووپۆش کرابوون دووانەکەی تریشیان بەدەرەوەبوون ووتم ئەی جوبرەئیل ئەم ڕووبارانە چین ؟ ووتی : ئەوانەی ڕووپۆش کرابوون ئەوە دوو ڕووباری بەهەشتن ئەو دووانەش کە بە دەرەوەن ناویان ( نیل و فوراتە ) ،پاشان ﴿ البيت المعمور ﴾ م لێوە دەرکەوت،ئەوەبوو قاپێك لەعەرەق و قاپێك لەشیرو قاپێك لەهەنگوینیان بۆم هێنا،منیش شیرەکەم وەرگرت جبریل فەرمووی:ئەوەی وەرتگرت ئەو فیترەتەیە کەخۆت و ئوممەتەکەت وان لەسەری پاشان بۆ هەموو ڕۆژێك پەنجا نوێژم لەسەر فەرز کراو بەدوای خۆمدا گەڕامەوە بەلای موسادا تێپەڕیم فەرمووی:فەرمانی چیت بەسەردادرا ؟ووتم :فەرمانم بەسەردادراوە کەهەموو ڕۆژێك پەنجا نوێژ بکەم،فەرمووی :ئوممەتەکەت توانای نابێت هەموو ڕۆژێك پەنجا نوێژ بکات چونکە من پێش تۆ خەڵکم تاقی کردۆتەوە و بەوپەڕی نارەحەتی یەوە کارو باری بەنی ئیسرائیلم هەڵسووڕاندووە بگەڕێوە بۆلای پەروەردگارت با باری سەر شانی ئوممەتتەکەت سووك بکات،منیش

گەڕامەوە و دەنوێژم لەسەر لابرا کەگەڕامەوە لای مووسا هەمان فەرمایشی فەرمووەوەو دیسان گەڕامەوە و دە نوێژی ترم لەسەر لابرا جارێکی تر گەڕامەوە لای مووساو هەمان فەرمایشی فەرمووەوە دیسان گەڕامەوە وە دیسان گەڕامەوەو دەنوێژی ترم لەسەر لابرا ئەم جارەش گەڕامەوە بۆلای مووسا دیسان هەمان فەرمایشی فەرمووەوە کەگەڕامەوە فەرمانم بەسەردادرا کە ڕۆژی پێنج نوێژ بەجێ بهێنم فەرمووی:ئەممەتەکەت توانای نابێت هەموو ڕۆژێك پێنج نوێژ بکات چونکە من پێش تۆ خەڵکم تاقی کردۆتەوەو بەو پەڕی نارەحەتی یەوە کاروباری بەنی ئیسرائیلم هەڵ سووڕاندووە بگەڕێوە بۆلای پەروەردگارت داوای لێ بکە باباری سەرشانی ئوممەتەکەت سووك بکات،فەرمووی :ئەوەندەم لەپەروەردگار داواکراد شەرمەزار بووم،کەواتە ڕازیم و تەسلیم بووم،فەرمووی:کەتێپەڕم کرد بانگم لێکرا بڕیارم لەسەر فەرزەکەم داوەو باری بەندەکانیشم سووك کردووەوهەندێك ڕیوایەتی ئیمام موسلیمیش باسی هاتنی پێغەمبەر بۆ ( بیت المقدس ) و چوونە ناوی و بەجێ هێنانی دووڕکات نوێژو هەڵبژاردنی قاپە شیرەکەو نەویستنی قاپە عارەقەکە جبریل هەردووکی بۆهێنا ئەکات،ئەمەش دوای هاتنە دەرەوەی لە (بیت المقدس) هەروەها ئەوەشی باس کردووە کە خوای گەورە فەرموویەتی:﴿ يا محمد إنهن خمس صلوات كل يوم وليلة لكل صلاة عشر ،يعني حسنات فذلك خمسون صلاة ، ومن هم بحسنة فلم يعملها كتبت له حسنة، فإن عملها له كتبت له عشراً ، ومن هم بسيئة ولم يعملها لم تكتب شيئاً فإن عملها كتبت سيئة واحدة...﴾ واتە : ئەی موحەممەد لەشەوە ڕۆژێکدا پێنج نوێژن و هەر نوێژێکیش بە دە چاکەیە،ئەمە پەنجا نوێژ هەر کەسیش نیازی چاکەیەکی کردو ئەنجامی نەدا بەچاکەیەك بۆی دەنووسرێ هەرکەسیش نیازی خراپەیەکی کردو ئەنجامی نەدا هیچی لەسەرنانووسرێ گەر ئەنجامی دا تەنها یەك خراپەی لەسەر دەنووسرێ ... هەروەها هەندێك کتێبی تری فەرموودەش باسی ئەوشتانە دەکەن کە پێغەمبەر (ﷺ) لەمەککەوە بۆ ﴿بیت

**الـمقدس** ﴾ چاوی پێکەوتوون ،دوو ڕکات نوێژیش کەلە ﴿**طور سیناء** ﴾ و لە ﴿**بیت لحم**﴾ و ئەنجامی داون،هەروەها باس لەوە دەکەن کەلە ﴿**بیت الـمقدس**﴾ پێش نوێژی بۆ پێغەمبەران کردووەو پێغەمبەریش و پێغەمبەرانیش ستایشی پەروەردگاریان کردووە. لەو گەشتەیدا پێغەمبەری خوا (ﷺ) چاوی بەمالیکی سەرپەریشتیاری دۆزەخ دەکەوێت کەبەهیچ شێوەیەك پێ ناکەنێ و خۆشی ناکەوێتە ناوچاوانی هەروەها چاوی بەبەهەشت و دۆزەخ دەکەوێت. چاوی کەوت بەوانەی کەبەستەم ماڵ و سامانی هەتیوان دەخۆن،کەوەك ووشتر لـموزیان هەبوو ،وەپارچە ئاگری وەك تاشە بەردیان دەخستە دەمیانەوەو لەدوایانەوە دەردەچوو ،چاویشی بەسووخۆرەکان کەوت،کەوەرگێکی وەها زلیان پێوەبوو نەیاندەتوانی لەجێی خۆیان بجووڵێن و کەئالی فیرعەون بەلایاندا تێپەڕیان دەکرد تائاگری دۆزەخیان پیشان بدرێت،ئەنیشتنە ملیان و ئەیان پلیشاندن.چاویشی بەزیناکاران کەوت کەگۆشتێکی قەڵەوی چاك و گۆشتێکی لەڕی گەنیویان لەبەردەم دابوو،

لەگۆشتە گەنیوەکەیان دەخواردو وازیان لەقەڵەوە چاکەکە دەهێنا،چاویشی کەوت بەهەندێك ئافرەت کە بەمەمکیان هەڵواسرابوون بەبۆنەی ئەوەوە کە منداڵی پیاوێکیان بەهی پیاوێکی تر لەقەڵەم دابوو ،هەروەها لەوسەرو لەوسەرەوە چاوی کەوت بەکاروانێکی قورەیش کەئەوەبوو ووشترێکیان لێ وون بووبوو پیشانی دان و ئاوەکەشیان لەدەفرێکی سەر گیراودا بوو کاتێ کەئەوان خەوتبوون ئاوەکەی خواردەوەو دەفرەکەشی وەك خۆی بەسەرگیراوی بەجێ هێشت ،ئەوەش بووە بەڵگەیەك لە ڕاستی فەرمایشتەکانی کاتێك کەلە مەککە بۆ قورەیشی باس کرد ...هەر ئەوشەوە ئەو گەشتە پیرۆزە تەواو بوو کەڕۆژ بوویەوە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) باسی ئەو گەشتەو ئەوشتانەی کەبینیبوونی کرد بۆ قورەیش و

ئەوانیش زیاتر لەجاران ملیان بادەداو دژایەتیان دەرکرد، داوایان لێکرد باسی ﴿بیت المقدس﴾ یان بۆبکات، خوای گەورە وێنەی مزگەوتەکەی بۆدەرخست هەتا بەووردی بۆیان باس بکات ئەویش هەموو ناونیشانێکی مزگەوتی بۆ هەڵدەدان و نەیاندەتوانی ئینکاری لەڕاستی بکەن، هەروەها هەواڵی کاروانەکەی پێدان کەلەم سەرو لەوسەرەوە چاوی پێکەوتبوو، هەواڵی ئەوکاتەشی دانێ کەدەگاتە بەرەومو هەواڵی ئەو ووشترەش کە دەکەوێتە پێش کاروانەکە ،ئەوەبوو هەموو هەواڵەکانی بەڕاست دەرچوون کەچی ئەو ستەم کارانە سەرەڕای بینینی ئەو موعجیزە گەورانە لە پێغەمبەر (ﷺ) زیاتر دەسلەمینەوەو هەتا دەهات بێ باوەڕتر دەبوون.هەر کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) وەسفی (ئەقصا) دەکات بۆ کافرەکانی مەککە سێ موعجیزەی گەورەو ناودار دەردەکەون :یەکەم : خوای گەورە مزگەوتی ئەقصای بەرزکردەوە لە ( بيت المقدس ) لە فەلەستین وەهێنای لە مەککە داینا بەرامبەر پێغەمبەر (ﷺ) تەماشای دەکرد نزیکتر لە خانووی عەقال یان عەقیل.

دووەم : پێغەمبەر (ﷺ) بەتەنها هەر خۆی مزگەوتی ئەقصای بینیوە جگە لەو کەسانەی کە لەدەوری بوون واتە ئەو کەسانەی دەوری نەیان بینیوە .

سێیەم : لە دوای ئەوەی پێغەمبەر ( ) کۆتای هێنا لە وەسفکردنی مزگەوتی ئەقصا خوای گەورە مزگەوتی ئەقصای گەڕاندەوە شوێنی خۆی .

## موعجیزەی (٢) هەردوو دەستی بەبەردەکەوە ووشك بوون :

لەکاتی گەیاندنی بانگەوازە پیرۆزەکەی خوای گەورە لەمەککە پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) زۆر نێبراوانە قوڵی مەردایەتی لێ هەڵکردوو کەوتە بانگەواز کردن بۆ ئەم بەرنامە پاکە.جا ناحەزانی حەق وڕاستی و سەرکردە ستەمکارە بتپەرستەکانی مەککە کەوتنە دژایەتی کردنی بەرنامە پاکەکەی خوای گەورەو ئازاردانی پێغەمبەرکەی ( ﷺ ) یەکێك لەو ستەمکارە گومڕایانە کەبەهەموو هەوڵ و تێکۆشانی کەوتە دژایەتی کردنی پێغەمبەرو بانگەوازەکەی ئەبو جەهل بوو ئەویش لەبەر حەسادەت وخۆبەزلزانی ڕێگای ڕاستی نەدەگرتە بەر ئەگینا زۆر چاك دەیزانی کە پێغەمبەر ( ﷺ ) چ کەسایەتی یەکی گەورەیە لەناویاندا کەسێکی ڕاستگۆیە و هەرچی پلەی خەسڵەتی بەرزو پایەدار هەیە لەو پێغەمبەرەدا دەدرەوشێتەوە هەرچەندە خوانەناسان بەبێ بەزەیی و دوور لەویژدانەوە بەرامبەر بە پێغەمبەری خوا دەجووڵانەوەو هەموو هەوڵێکیان دەدا بۆ بەربەست دروستکردن لەبەردەم بانگەوازەکەیدا پێغەمبەری سەروەری ئیسلام ( ﷺ ) لەبانگ کردنی پیاوە ناودارەکانیان کۆڵی نەدەداو بەزەیی بەحاڵیاندا دەهاتەوە پێی خۆش بوو لەئاگری دۆزەخ ڕزگار بن و ئیمان بهێنن بە پەیامی خوای گەورە و واز لەدژایەتی کردنی حەق و ڕاستی بهێنن...بەیهەقی لە موغیرەی کوڕی شەعبەوە هێناویەتی کە ووتوویەتی: یەکەم جار کە پێغەمبەری خوام ( ﷺ ) ناسی ڕۆژێك بوو کەمن و ئەبو جەهلی کوڕی هیشام لەیەکێك لەکۆڵانەکانی مەککەدا پێکەوە بەڕێدا دەڕۆیشتین،تووشی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) بووین، پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) بەئەبوو جەهلی فەرموو:﴿ **یا ابا الحکم هلم إلی الله وإلی رسوله أدعوك إلی الله** ﴾

فەرمووی : ئەبولحەکەم خێراکە بۆلای خواو بۆلای پێغەمبەرەکەی بانگت دەکەم بۆلای خوا،ئەبوجەهل ووتی: ئەی موحەممەد ئایا لەجنێودان بە پەرستراوەکانمان واز ناهێنی ؟

ئایا جگە لەوەی کە ئێمە شاهیدی بدەین تۆ پێت ڕاگەیاندووین، هیچی ترت دەوێت؟ دەی وائێمە شاهێدی دەدەین کەتۆ پێت ڕاگەیاندووین، بەخوا ئەگەر بزانم ئەوەی کەتۆ دەیڵێیت ڕاستە ئەوا شوێنت دەکەوم، ئەوەبوو پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕۆیشت ،و ئەبو جەهل ڕووی تێکردم و وتی: بەخوا دەزانم ئەوەی کەئەو دەیڵێت ڕاستە، بەڵام شتێك قەدەغەم دەکات: ئەوەی قوصەی ووتیان: ﴿ **حجابة**﴾ لەدەستی ئێمەدایە، وتمان بەڵێ، پاشان ووتیان ﴿ **سقاية** ﴾ ش لەدەستمان دایەو وتمان بەڵێ پاشان وتیان ﴿ **ندوة** ﴾ ش لەدەستمان دایەو وتمان بەڵێ : پاشان ووتیان ﴿ **لواء**﴾ ش لەدەستمان دایەو وتمان :بەڵێ پاشان ئەوان نانیان داو ،ئێمەش نانمان دا هەتا کەلە پایەداریدا یەکسان وەستاین: وتیان: پێغەمبەرمان تیادا هەڵکەوتووە بەخوا شتی واناکەم واتە: ئەبو جەهل ووتی دانی پیانانێم و ئیمانی پێ ناهێنم. بەڵێ خوێنەری بەڕێز: ئەبو جەهل سەرەڕای ئەوەی دەیزانی کە پێغەمبەر (ﷺ) ڕاست دەکات و ڕاستگۆیە، بەڵام سەرکەشی و بێ ئیمانی بەسەریدا زاڵ بوو بوو زیاتر کەوتە دژایەتی کردنی پێغەمبەرو بانگەوازەکەی ،ئەبو جەهل لەهەموو کەس زیاتر دژایەتی ئایینی تازەی دەکرد، جگەلەوەی کە ئەگبەتی یەخەی پێگرتبوو حەزی لە کوفرو ستەم بوو، لەو لاشەوە ڕقێکی لەنەوەی هاشم بوو، وەك مەخزوومی یەك پێی خۆش بوو لەشەرەف و پایەداری دا پێشیان بداتەوە بۆیە کەهەواڵی ئایینی تازەی بیست بەڕق و قینێکەوە ووتی: ئەی کۆمەڵی قوڕەیش موحەممەد هیچی ناوێت جگەلەوەی کەدەبینین کەبریتی یە لە عەیبدارکردنی دینەکەمان و جنێودان بەباب و باپیرانمان و بەشێت دانانی پیاوە ژیرەکانمان و سووکایەتی کردن بە پەرستراوەکانمان – دەی من بەڵێن بەخوا دەدەم کەسبەینێ بەبەردێکەوە بۆی دادەنیشم، جا کەلەنوێژەکەی دا سووجدەی برد ،سەری پێ لەت دەکەم، جا بانەوەی عەبدول مەناف چییان پێ خۆشە بیکەن، بۆ سبەی ئەبو جەهل بەردێکی بەدەستەوە گرت و بۆ پێغەمبەری خوا (ﷺ) دانیشت هەتا بێت، ئەوەبوو پێغەمبەری خوا

(ﷺ) هات و لەنێوان هەردووك ڕووکنی کەعبەدا ڕووکنی ئەسوەد و ڕووکنی یەمانی دا دەستی بەنوێژ کردو قوڕەیشیەکانیش هەر کۆمەڵەو لەشوێنی کۆڕو کۆمەڵی خۆیاندا دانیشتن و چاوەڕوان بوون کاتێك کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) سووجدەی برد ،ئەبو جەهل دەستی دایە بەردەکەو بەدزە دزە بەرەو ڕووی هات تاکەلێی نزیك کەوتەوە ڕەنگی زەردبوو وترسی لێنیشت و هەردوو دەستی بەبەردەکەوە ووشك بوون و هۆشی لەخۆی نەماو بەردەکەشی لەدەست کەوتە خوارەوە بەچاوی زاقەوە گەڕایەوە دواوە ،قوڕەیش ئاگاداربوون،بگرە بەتایبەت زۆرێکیان بەبۆنەی بەڵێنەکەی ئەبو جەهلەوە لەوێ کۆبوونەوە بەتەمابوون ئەبوو جەهل بەردەکە بکێشێ بە پێغەمبەری خوا (ﷺ) نەفامانە بێئاگابوون لەوەی نەیان دەزانی کەخوای گەورە ناهێلێ ئەم پیلانە گلاَوەیان سەربگرێ و پێغەمبەرەکەی خۆی دەپارێزێ ،بینیان ئەبو جەهل بەردەکەی فڕێ داو کشایەوە دواوە وچەندکەسێك هاتن بۆلای ئەبو جەهل پرسیان ئەوە چیتە ؟ وتی:هەستام بۆی تابەردەکەی پیادا بکێشم ،بەلاَم کەنزیك بوومەوە لێی نێرە ووشترێك هاتە ڕێم بەخوا هەرگیز نێرە ووشترم لەشێوەی کەللە سەرو مل و کەڵبەی ئەو ووشترەدا نەدیوە وویستی بم خوات: ئیبن ئیسحاق ووتوویەتی: بۆم باسکراوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ﴿ذلك جبريل، ولودنا من لآخذه﴾ واتە: ئەوە جبریل بووە ئەگەر نزیك بکەوتبایەوە لەناوی دەبرد،وەهەروەها بەیهەقی لەعەبباسەوە خوا لێی ڕازی بێ هێناویەتی کە ووتوویەتی: ڕۆژێکیان لەمزگەوت بووم بینیم ئەبو جەهلی کافرو ستەمکار هات ووتی: بەڵێن بەخاو دەدەم ئەگەر موحەممەد لەسوجدەدا ببینم بچمەسەرملی منیش خێرا دەرچووم و خۆم گەیاندە پێغەمبەری خوا (ﷺ) و چوومە ژوورەوە لای وهەواڵی ووتەکەی ئەبو جەهلم داپێی،ئەویش بەتوڕەیی لەماڵ دەرچوو هات بۆ مزگەوت،ئەوەندەپەلەی بوو لەدەرگا نەهاتە ژوورەوە بەڵکو بەسەردیوارەکەدا سەرکەوت،منیش ووتم:

ئەمڕۆ ڕۆژێکی ناهەمووارە ئیزارەکەم کۆکردەوەو کەوتمە شوێنی ئەوەبوو پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەستی بەخوێندنی ﴿ٱقۡرَأۡ بِٱسۡمِ رَبِّكَ ٱلَّذِي خَلَقَ * خَلَقَ ٱلۡإِنسَٰنَ مِنۡ عَلَقٍ﴾العلق(١-٢) کردو کاتێك کە گەیشتە لای ئەو ئایەتانەی کەباسی ئەبو جەهل دەکەن پیاوێك بەئەبو جەهلی ووت :ئەبولحەکەم ئەوە موحەممەدە، ئەبوجەهلیش ووتی :ئەوەی من دەیبینم ئێوەش نایبینن ؟بەخوا ئاسۆی ئاسمانم لێ داخراوە لەڕیوایەتێکیکەدا هاتووە : نێوانی من و ئەو بەسوپای مەلائیکەت دا پۆشراوە کاتێك کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) گەیشتە کۆتایی سوڕەتەکە سووجدەی برد [٢] وەهەروەها ئەبوجەهل جارێکی تریش دەڵێت: بەڵێن دەدەم بەخوا کە ئەگەرموحەممەد لەسووجدەدا ببینم دەچمە سەرملی و دەم و چاویشی لەخۆڵ هەڵ دەسووم، ئەوەبوو بەرەو ڕووی پێغەمبەری خوا (ﷺ) هات بچێتە سەر ملی ،کەچی لەناکاو بەرەو دواوە پاشەکشەی دەکردوو بەهەردووك دەستی خۆی دەپاراست، پێیان ووت ئەوە چیتە ؟ ووتی : لەنێوان من و ئەودا چاڵێك ئاگرو ترس و لەرزو باڵ هەن... پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ﴿ **لودنا مني ،لاختطفته الملائكة** ﴾ واتە:ئەگەر لێم نزیك بکەوتایەتەوە مەلائیکەت دەیان فڕاند وەهەروەها لەڕیوایەتێکی کەدا هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتەکانی ﴿٦-١٩﴾ کۆتایی سوڕەتی ﴿العلق﴾ وەها باس کراوە کەئەبوجەهل بەلای پێغەمبەری خوا (ﷺ) کەنوێژدەکات تێ دەپەڕی، ئەوەش دوای ئەوەی چەندجارێك ویستبووی دەست درێژی بکاتە سەر پێغەمبەر (ﷺ) بەلام خوای گەورە پارێزگاری لە پێغەمبەرەکەی کردبوو، ئەبوجەهل خەجاڵەت بوو، دەڵێت پێمان نەووتی نوێژ نەکەی ئەی موحەممەد ؟ خۆدەزانی لەمەککەدا هیچ کەس لەمن زیاتر پشتیوانی نی یە، پێغەمبەر (ﷺ)

---

[٢] شرح حياة الصحابة ١ / ٤٥٢ — ٤٥٣

**گوێی پێنەداو لێشی تووڕەبوو ئەوەبوو ئەبوو جەهل بەسەرشۆڕی و خەجاڵەتی گەڕایەوە دواوە، خوای گەورە دەربارەی ئەبوجەهلی ستەمکار ئەو ئایەتانەی دابەزاندن:**

﴿كَلَّآ إِنَّ ٱلۡإِنسَٰنَ لَيَطۡغَىٰٓ* أَن رَّءَاهُ ٱسۡتَغۡنَىٰٓ* إِنَّ إِلَىٰ رَبِّكَ ٱلرُّجۡعَىٰٓ* أَرَءَيۡتَ ٱلَّذِي يَنۡهَىٰ* عَبۡدًا إِذَا صَلَّىٰٓ* أَرَءَيۡتَ إِن كَانَ عَلَى ٱلۡهُدَىٰٓ* أَوۡ أَمَرَ بِٱلتَّقۡوَىٰٓ* أَرَءَيۡتَ إِن كَذَّبَ وَتَوَلَّىٰٓ* أَلَمۡ يَعۡلَم بِأَنَّ ٱللَّهَ يَرَىٰ* كَلَّا لَئِن لَّمۡ يَنتَهِ لَنَسۡفَعَۢا بِٱلنَّاصِيَةِ* نَاصِيَةٖ كَٰذِبَةٍ خَاطِئَةٖ* فَلۡيَدۡعُ نَادِيَهُۥ* سَنَدۡعُ ٱلزَّبَانِيَةَ* كَلَّا لَا تُطِعۡهُ وَٱسۡجُدۡ وَٱقۡتَرِب ۩﴾ **العلق(٦-١٩)**

**واتە: بەڕاستی مرۆڤ یاخی دەبێ کەخۆی ببینێ وا دەوڵەمەند بووە بێگومان هەربۆلای پەروەردگاری تۆیە گەڕانەوە ئایا بینیت ئەو کەسەی کەجلەو گیری دەکات لەبەندەیەك کەنوێژبکات ئایا پێم بلێ ئەگەر ئەوکەسە لەسەر ڕێ ی ڕاست بوایە یا فەرمانی بدایە بە پارێزگاری باشتر نەدەبوو ئایا بینیت ئەگەر بڕوای بەئایینی بەڕاستی نەبێ و پشتی لێ هەڵکات ڕزگاری دەبێت ئایا نەیزانیوە کەخوا دەیبینێ،وانی یە کەبیری لێدەکاتەوە بەڕاستی ئەگەر وازنەهێنێ ڕای دەکێشین بەقژی پێشەسەری، پێشەسەرێکی درۆزنی بەهەڵەدا چوو ئینجا با ئەوبانگی هاوڕێکانی خۆی بکات ئێمەش بانگی فریشتەی زەبر بەدەست دەکەین نەخێر بەگوێی ئەوکەسانە مەکە وە کڕنووش بەرەو لە ﴿ خوا ﴾ نزیك بکەومرەوە.**

## موعجیزەی (٣) پیاوە ئیراشیەکە قەرزەکەی وەرگرتەوە:

ئیبن ئیسحاق ڕیوایەتی کردووەو ووتوویەتی : پیاوێکی هۆزی ئیراش بەچەند سەر ووشترێکەوە هاتە مەککەو ئەبووجەهل لێی کڕی،بەڵام دەستی دەستی بەکابرا دەکردو پارەکەی نەدەدایە،کابرای ئیراشی هیچی بۆنەمایەوە ئەوەنەبێ هاتە لای کۆڕوکۆمەڵی قورەیش و پێغەمبەری خواش (ﷺ) لەلایەکی مزگەوتەوە دانیشتبوو،وتی:ئەی کۆمەڵی قورەیش چ پیاوێکتان ئامادەیە ئەو حەقەم لە ئەبولحەکەمی کوڕی هیشام بۆ وەربگرێتەوە ؟من غەریب و ڕێبوارم و حەقەکەم ناداتێ ، پیاوانی کۆڕەکە ووتیان :ئائەوە دەبینی ؟ ئاماژەیان بۆ پێغەمبەری خوا (ﷺ) کرد،چونکە دەیانزانی لەنێوان ئەوو ئەبو جەهلدا چ دوژمنایەتیەك هەیە،ووتیان بڕۆ بۆلای ،ئەو حەقەکەت بۆ وەردەگرێتەوە کابرای ئیراشی هاتە سەر سەری پێغەمبەری خوا (ﷺ) باسەکەی بۆگێڕایەوە،ئەویش هەستایەوەو پێکەوە ڕۆیشتن کە پیاوانی کۆڕەکە چاویان لێ بوو هەستایەوەو لەگەڵیدا ڕۆیشتن،بە پیاوێکیان کەلە گەڵیدا بوو،وت: شوێنیان بکەوەو بزانە چی دەکات ؟ پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕۆیشت هەتا گەیشتەلای ماڵی ئەبو جەهل تەقەی لەدەرگادا ووتی: ئەوەکێ یە ؟ فەرمووی محمدو وەرە دەرەوە ،کەهاتە دەرەوە ڕەنگی زەرد هەڵگەڕابوو پێغەمبەری خواش (ﷺ) فەرمووی:﴿**أعطى هذا الرجل حقه**﴾ واتە: هەقی ئەم کابرایە بدە،وتی: مەڕۆ هەتا چی لەلامە بی دەمێ ،چووە ژوورەوەو هاتە وەو پارەکەی بۆهێناو دایە دەستی، دوای ئەوە پێغەمبەری خوا (ﷺ) گەڕایەوەو بەکابرای ئیراشیشی فەرموو:﴿**إلحق لشأنك** ﴾ واتە: بڕۆ بەلای کاری خۆتەوە،کابرای ئیراشی هاتەوە بۆلای کۆڕەکەو ووتی:خوا پاداشتی بەچاکەوە بداتەوە هەقەکەمم وەرگرتەوە،کاتێ کەناردیان تابزانێ ئەبو جەهل چی دەکات گەڕایەوە پێ یان ووت: ماڵت کاول بێ چیت دی ؟ ووتی : شتێکی یەکجار سەیرم دی بەخوا هەرئەوەندە

کەتەقەی لەدەرگاکەی دا ،هاتە دەرەوەو گیانی تیادا نەمابوو ووتی:حەقی ئەم کابرایە بدە،ئەویش پێیدا ئەوەندەی پێنەچوو ئەبو جەهل هات و ئەوانیش لۆمەیان کردو بەگاڵتەوە پێیان ووت:دەبەخوا ئەوەی تۆ کردووتە تا ئێستا نەمان دیوە،وتی:ماڵتان کاول بێ هەرئەوەندە کەتەقەی لەدەرگاکەم دا،دەنگێکم بیست و ترسو لەرز دای گرتمەوە نێرە ووشترێکیش بەسەر سەریەوە بوو کەهەرگیز نێرە ووشترم لەشێوەی کەللە سەرو مل و کەڵبەی ئەو ووشترە دا نەدیوە دەبەخوا ئەگەر بەگوێم نەکردایە دەی خواردم،ئیتر شێوەی ئەو نێرە ووشترە هەرگیز لەمێشکی ئەبو جەهل دەرنەدەچوو.

لەپاش بینینی ئەو هەموو موعجیزانە لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەبو جەهل چونکە نەگبەتی و بەدبەختی سواری شان وملی بووبوو ڕێگای هیدایەتی نەگرتە بەرو لەسەر بێ باوەڕی بەردەوام بوو تا سەرەنجام بەکافری دنیای بەجێ هێشت سزای ئاگری دۆزەخی بۆ خۆی مسوگەر کرد...[٣]

## موعجیزەی (٤) خوای گەورە چاوی لە ئاستی پێغەمبەردا لە بینین خست :

ئوم جەمیلی هاوسەری ئەبولەهەب یەکێك بوو لەئافرەتە بێ باوەڕەکانی مەککە بەئەوپەڕی دژایەتی پێغەمبەری دەکرد،وەهەروەها ئەبولەهەبی مێردیشی کەهاوکات مامی پێغەمبەر بووزۆر بەبێ ڕەحمانە دژایەتی ئایینی پیرۆزی ئیسلامی دەکرد،ئەوەی جێگای سەرنجە ئەبولەهەب کەناوی عەبدولعزە بوو ،کاتێك ﴿ ثوەیبة ﴾ ی کەنیزەکی هەواڵی

---

[٣] ژیانی ئازیزمان (ﷺ) لاپەرە ٢٢٠- ٢٢١

دایە كەئامینەی هاوسەری عەبدوڵڵای برای كوڕی بووە،ئەبو لەهەب لەمژدەی دا ئەو كەنیزەكەی ئازادكرد،كەچی كاتێك كەوەحی هات بۆ پێغەمبەری ئازیز (ﷺ) ئەبولەهەبی مامی لەهەموو كەس زیاتر دژایەتی دەكرد،لەلایەكەوە خزمایەتی و لەلایەكی ترەوە دراوسێیەتی و لەلایەكی تریشەوە موحەممەدی ڕەوشت جوان و نەرم ونیان،شیاوی دژایەتی نی یە،چلو سێ ساڵ تەمەنی بەڕاستگۆیی و دەست پاكی بەسەربردووە تائێستا كارێكی نەكردووە كەدڵی هیچ كەسێك گەردبگرێت ئوم جەمیل هەوڵی ئەدا بەدووزمانی و قسەهێنان و بردن نێوان پێغەمبەرو خەڵكی تێك بدات ،دڕك و داڵی كۆئەكردەوە و ئەی خستە ڕێگاكەیەوەو پیسی فڕێ ئەدایە بەردەرگاكەیی و پێغەمبەریش (ﷺ) دووری ئەخستەوە ئەی فەرموو: ﴿أي جوار هذا يا بني عبد المناف ؟ ﴾ واتە: ئەمەچۆن دراوسێیەتی یەكە ئەی ئەوەی عەبدومەناف ؟ ئەوە ڕەفتاری ئەو ژن و مێردە نامەردەبوو تا ئەوەبوو خوای گەورە سوڕەتی ﴿ تبت يدا ﴾ ی ناردەخوارەوە مژدەی بەهەردووكیاندا كەهەردووكیان دەبنە سووتەمەنی دۆزەخ كاتێك ئوم جەمیل بیستی وادەربارەی خۆیی و مێردەكەی قورئان هاتۆتە خوارەوە هەستاو بەرەو مزگەوت كەوتەڕێ تا تۆڵە لەپێغەمبەری خوا (ﷺ) بستێنێ ،لەوكاتەدا ئەویش لە مزگەوتدا لەپەنای كەعبەدا لەگەڵ ئەبو بەكر دا دانیشتبوو،ئوم جەمیلیش بەردێكی پڕ بەمشتی هەڵگرتبوو ،كەنزیكیان كەوتەوە خوای گەورە چاوی لەئاستی پێغەمبەردا (ﷺ) لەبینین خست و تەنها ئەبوبەكری دەبینی، ئەمەش یەكێكی ترە لەموعجیزەكانی پێغەمبەر (ﷺ) وتی: ئەبوبەكر ئەوە هاوەڵەكەت كوا ؟ پێم گەیشتووە كە هەجووی كردووم، بەخوا ئەگەر بیبینم ئەم بەردە ئەكێشم بەدەمیا بەخوا منیش شاعیرم پاشان ووتی: **مذمما عصينا و أمره أبينا .ودينه قلينا** ،ئیتر ڕۆیشت،ئەبوبەكر ووتی:ئەی پێغەمبەری خوا ئایا ئەتی بینی ؟ فەرمووی :﴿ما

رأيتني،لقد أخذ الله ببصرها عني﴾ واتە:نەی بینیم ،خوای گەورە لەئاستی بینینی مندا چاوی لەبینین خست. [٤]

## موعجیزەی (٥) خوای گەورە پارێزگاری لەپێغەمبەرەکەی دەکات لەپیلانێکی شەیتانیانەی بێ باوەڕە قوڕەیشی یەکان :

کاتێك هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ) کۆچیان کرد لەمەککەوە بۆ مەدینە بت پەرستە قوڕەیشی یەکان ترسی ئەوەیان لێنیشت پێغەمبەری خواش (ﷺ) کۆچ بکات بۆ مەدینەو ئەوێ هێز پەیدا بکات و دوای ماوەیەك بێتەوە سەریان و مەککەشیان لەبن دەست دەربهێنێ .بۆئەمە زۆر خەمباربوون، چونکە زۆرچاك دەیانزانی ئەگەر پێغەمبەری خوا (ﷺ) مەککە جێ بهێڵێت کاریگەری زۆری دەبێ چونکە زۆر حەکیم و وردبینە، هاوەڵەکانیشی چەند بەغیرەت و ڕاستگۆو کۆڵ نەدەرن و بەدڵسۆزی و نیەتی پاکەوە کار بۆ ئایینەکەیان دەکەن،بۆیە بەوپەڕی توانایاناوە بۆ ڕێگا چارەیەك دەگەڕان ئەوەبوو پەرلەمانی مەککە لە (دار الندوة) کۆبوونەوەیەکی ئەنجام دا،نوێنەری هەموو هۆزە قوڕیشیەکان ئامادەی بوون تا ئەو کێشەیە چارەسەر بکەن.کاتێك کەهاتن بۆ (دار الندوة) شەیتان لەشێوەی ڕیش سپی یەکی نەجدی دا هاتە ڕێیان و دەستێك بەرگی ئەستووری لەبەردا بوو.کەبینیان وا لەبەر دەرگادا وەستاوە ووتیان مامەی ڕیش سپی کێ یە؟ ووتی : ڕیش سپی یەکی ئەهلی نەجدمو ئەوەی بیستووە کەبۆی کۆبوونەتەوە،بۆیە ئەویش لەگەڵتان ئامادە بووە،تا لەئامۆژگاری خۆی بێبەشتان نەکات،ووتیان چاکە فەرموو وەرە ژوورەوە دوای ئەوەی پیاوانی

---

[٤] ژیانی نازیزمان (ﷺ) لاپەڕە ٢٠٤ – ٢٠٥ – ٢٠٦

کۆبوونەوە کەئامادەبوون هەوڵیان دەدا بەهەموویان ڕێگایەك هەڵبژێرن و یەکدەنگ بن لەسەری، جا هەریەکەیان ڕێگە چارەیەکی دیاری دەکر هەموو جارێك شەیتان کەلە شێوەی پیاوێکی ڕیش سپی دابوو دەی ووت نەخێر ئەو ڕێگە چارەیە بەکەڵك نایەت و سوودی نی یە،تا سەرەنجام ئەبو جەهلی ستەمکارو سیفەت شەیتان ووتی:بەخوا من لەبارەیەوە ڕایەکم هەیە وبڕوا ناکەم ئێوە هیچتان بیرتان لیّ کردبێتەوە،ووتیان ئەوە چی یە؟ ئەبو جەهل ووتی: وای بۆدەچم ئێمە لەهەموو هۆزێك گەنجێکی چاك و خاوەن ئەسەب هەڵبژێرین و هەرگەنجێکیش لەوانە شمشێرێکی تیژی بدەینە دەست، پاشان بچنە سەری و هەرهەموو بەجارێك بە شمشێر دای بگرنەوەو بیکوژن، چونکە ئەگەر ئەو گەنجانە وەها بکەن ئەوا خوێنەکەی لەناو هەموو هۆزەکاندا بلأودەبێتەوە و ئەوەی عەبدومەناف ناتوانن لەگەڵ ئەو هەموو هۆزەدا بجەنگن،ناچاردەبن بەخوێندان ڕازی بن ئەوکاتەش ئێمە خوێنەکەی بۆیان کۆدەکەینەوە، ڕیش سپی یە نەجدی یەکە واتە شەیتان وتی:قسە ئەوەیە کەئەو پیاوە کردی ،بەم شێوەیە خەڵکەکە لەسەر ئەو ڕایە ڕێك کەوتن،کەبڕیارەکەیاندا خوای گەورە جبریلی ناردە خوارەوە بۆ لای پێغەمبەری ئیسلام (ﷺ ) هەواڵی دایە کەکافرەکان چ نیازێکی پیسیان کردووە، خوای گەورە فرمانی وەهایە ئەو شەوی داهاتوو لەسەر جێگاکەی خۆی نەخەوێ، هەر شەو کۆچ بکات لەوبارەوە قورئانی پیرۆز هاتە خوارەوە لەفێڵ و تەڵەکەی بیّ باوەڕان ئاگاداری کردو فەرمووی ﴿ وَإِذْ يَمْكُرُ بِكَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لِيُثْبِتُوكَ أَوْ يَقْتُلُوكَ أَوْ يُخْرِجُوكَۚ وَيَمْكُرُونَ وَيَمْكُرُ ٱللَّهُۖ وَٱللَّهُ خَيْرُ ٱلْمَٰكِرِينَ ﴾**الانفال** ( ٣٠ )

واتە: وە بیر بکەرەوە کاتێك ئەوانەی کەبیّ باوەڕبوون لەدژت پیلانیان دەگێڕا تابەندو کۆتت بکەن یان بتکوژن یان لەمەککە دەرت بکەن وە ئەوانە بەردەوام فڕوفێڵ دەکەن وە خوایش لەبەردەم ئەواندا پیلان دەگێڕێت خوا چاکترینی پیلانگێڕانە بەرامبەر پیلانگێڕان.ئەو

تاوانبارانەی کەزیاتر حەزیان لەدژایەتی کردنی ئیسلام بوو،ئەو ڕۆژە هەر خەریکی خۆئامادەکردن بوون بۆجێ بەجێ کردنی ئەو نەخشەیەی کەسەرلەبەیانی پەرلەمانی مەککە لە ( **دار الندوة** ) بڕیاری لەسەر درابوو، پێغەمبەری خواش (ﷺ) هەواڵی بە ئەبوبەکرداو نەخشەی کۆچکردنیان کێشاو گەڕایەوە بۆماڵەوە ئەوە بوو جبریل (سەلامی خوای لێبێ) فەرمانی پێدابوو کەشەو لەسەر جێگاکەی خۆی نەخەوێ کەدنیا تاریك دەهات،گەنجە قورەیشی یەکان کەفەرمانی کوشتنی پێغەمبەریان وەرگرتبوو هەموو پێکەوە هاتنە بەردەرگاکەی پێغەمبەر (ﷺ) و گەمارۆی ماڵەکەیاندا تا بزانن کەی دەخەوێت و هێرش بکەنە سەری ،کاتی پیلان بۆ جێ بەجێ کردنی ئەو پیلانە نامەردانەیە نیوە شەو بوو،بۆیە هەموویان بەووریایی یەوە چاوەڕوانی سەعاتی سفریان دەکرد،ئەوان نەخشەیەکیان دەویست و خوای باڵا دەستیش نەخشەیەکی ترهەرچەندە قورەیش هەرهەموویان خەریك بوون تا ئەوکارەیان جێ بەجێ بکەن،بەڵام خوای گەورە دۆڕان و شەرمەزاری دونیاو قیامەتی کردە بەشیان .کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەدەورگیرانی ماڵەکەی ئاگادار بوو شوێنی مەڵاس دانی گەنجە شمشێربەدەستەکانی زانی،هەستی کرد کەپێویستە بە ووردی نەخشە بکێشن،بۆئەوە فەرمانی بە ئیمامی عەلی دا کەئەوکاتە گەنجێك بوو،پێی فەرموو:کەلەنوێنەکەی خۆیدا بخەوێ،ئەو بووردە سەوزە حە ضرە می یە بدا بەخۆیدا.بەڵێنیشی پێدا کە هیچ خراپی یەك لەرێگەی ئەو گەنجانەوە نایەتە ڕێی وئیمامی عەلی لەسەر نوێنەکەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) خەوت وبووردەکەشی دا بەخۆیدا، ئەو نەخشە جوانە جبریل -سەلامی خوای لێ بێ- ئاماژەی پێکرد،کەئەوەبوو سەری لەبت پەرستەکان شێواند کەخێرا خێرا لەدرزی دەرگاکەوە سەیریان دەکردو کەوا کەسێك خەوتووە واشیان دەزانی کە پێغەمبەری خوایە (ﷺ) کەچی ئیمامی عەلی بوو،کاتی ئەوە هات پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەماڵ دەربچێت،بتپەرستانیش وان

لە پشت دەرگاکەوە کافرەبتپەرستەکانیش هاتوون بەدەم نەخشەی شەیتانەوە، لەهەمان کاتدا پێغەمبەری خواش ( ﷺ ) دەیەوێت بچێت بەدەم نەخشەی خوای پەروەردگارەوە.

جاچۆن بڕوا، واکافرەکان گەمارۆی ماڵەکەیانداوەو شمشێریان لەدەست دایە ؟بەشێك لەشەو ڕۆیشتبوو خوای گەورە فەرمانی دەرکرد بۆچاوەکانیان تا لەبینینی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) بکەون، هاتەدەرەوە مشتێك خۆڵیشی هەڵگرت و بۆ زیاتر گاڵتە پێکردنیان، خۆڵیشی وەشاند بەسەریانداو دەستیشی بەخوێندنی قورئانی پیرۆز کردەو ئایەتەی خوێندن﴿ يسٓ *وَٱلۡقُرۡءَانِٱلۡحَكِيمِ *إِنَّكَ لَمِنَ ٱلۡمُرۡسَلِينَ *عَلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ *تَنزِيلَ ٱلۡعَزِيزِ ٱلرَّحِيمِ *لِتُنذِرَ قَوۡمٗا مَّآ أُنذِرَ ءَابَآؤُهُمۡ فَهُمۡ غَٰفِلُونَ *لَقَدۡ حَقَّ ٱلۡقَوۡلُ عَلَىٰٓ أَكۡثَرِهِمۡ فَهُمۡ لَا يُؤۡمِنُونَ *إِنَّا جَعَلۡنَا فِيٓ أَعۡنَٰقِهِمۡ أَغۡلَٰلٗا فَهِيَ إِلَى ٱلۡأَذۡقَانِ فَهُم مُّقۡمَحُونَ *وَجَعَلۡنَا مِنۢ بَيۡنِ أَيۡدِيهِمۡ سَدّٗا وَمِنۡ خَلۡفِهِمۡ سَدّٗا فَأَغۡشَيۡنَٰهُمۡ فَهُمۡ لَا يُبۡصِرُونَ﴾ يس (١-٩)

واتە : بەیاسین دەخوێندرێتەوە، سوێند بەقورئانی پڕلەدانایی بەڕاستی تۆ ئەی موحەممەد ( ﷺ ) لە پێغەمبەرانی خوای لەسەر ڕێبازی ڕاستی قورئان دابەزێنراوەو لەلایەن خوای زاڵی میهرەبانەوە بۆئەوەی گەلێ بترسێنی لە سزا ، کەباوو باپیرانیان نەترسێنرابوون، بۆیە ئەوان بێ ئاگا بوون، سوێند بەخوا بەڕاستی بەڵێنی خوا چەسپاوەو هاتە دی لەسەر زۆربەیان چونکە ئەوان باوەڕناهێنن وەك کەسانێك وان کەتەوقمان کردبێتە گەردنیان جا ئەوتەوقانە تاچەناگەیان هاتبێ گەردنیانی بەتەوای گرتبێتەوە ئینجا سەریان بەرزکرابیتەوە نەتوانن بۆ خوا ڕوو ئەم لاو لا بجوڵێنن وەبەربەستمان لەبەردەم و پشتیانەوە داناوە پەردەشمان داوە بەسەر چاویاندا بۆیە ئەوان ڕاستی نابینن، پیاوێکیان نەما خۆڵ بەسەریدا نەکرابێت بەسوپاسێکی زۆری خواوە پێغەمبەر ( ﷺ ) بەرەو کاری خۆی بۆماڵی ئەبوبەکر ڕۆیشت و بتپەرستانیش چاوەڕوان بوون تا نووستووی ژێر بووردە سەوزە حە ضرە مى يەكە بێتە دەرەوەو

دەستی لێ بوەشێنن، پێغەمبەری خواش (ﷺ) بە پەلە خۆی گەیاندە ماڵی ئەبوبەکرو ئەبوبەکریش چاوەڕوانی هاتنی ئەوبوو، تا گەشتەکەیان دەست پێبکەن، شمشێر بەدەستەکان هەر چاوەڕوان بوون کەچی لەناکاو پیاوێك لەولاوە هاتوو چاوی بەو گەنجانە کەوت کەلەدەرگا وەستابوون، پرسی :چاوەڕوانی چیین ؟ ووتیان موحەممەد ، وتی: خوا زەرەرمەندی کردوون بەخوا موحەممەد لەناوتاندا دەرچووەو خۆڵیشی کردووە بەسەری هەمووتاندا و چووە بەلای کاری خۆیەوە نابینن چیتان بەسەر هاتووە؟

هەریەکەیان دەستی دا لەسەری خۆیی و ئەبینێ خۆڵی لەسەر وەستاوە، لەگەڵ ئەوەشدا هێشتا بڕوایان نەدەکرد لەبەردەرگاکەوە سەیری نووستووی ناو ژوورەکەیان دەکرد کە بووردەکەی بەخۆیدا دابوو،دەیان ووت ئەوە موحەممەدە خەوتووە و بووردەکەی بەخۆی داداوەو هەروا مانەوە هەتا ڕۆژبوویەوە و دنیا ڕووناك بوو، چوونە ژوورەوە دەبینن ئیمامی عەلی یە، ووتیان کوا موحەممەد ؟ وتی نازانم، ئیتر زانیان کەلەدەستیان دەرچووەو بەمە تووشی خەم وخەفەتێکی زۆرهاتن بۆلەدەست چوونی ئەوهەلەو سەرنەگرتنی نەخشە شەیتانیەکەیان ....

بەڵێ: خوێنەری بەڕێز خوای گەورە ئابەو موعجیزە گەورەیە پارێزگاری لە پێغەمبەرە خۆشەویستەکەی خۆی کردو پاراستی لە پیلانی بتپەرستانی نەفام و ستەمکار..[٥]

---

[٥] ژیانی ئازیزمان (ﷺ) لاپەرە ٤٣١ – ٤٣٩ .

## موعجیزەی (٦) هەرکە پێغەمبەری خوا (ﷺ) چووە ناو ئەشکەوتی ثە ور سێ موعجیزەی گەورە دەرکەوتن:

کاتێك کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) خوای گەورە پاراستی لە پیلانی ناحەزانی قورەیش و ئەو نەخشە شەیتانی یەی کەکافرەکان لە ( **دار الندوة** ) دا کێشایان بەرومالّی ئەبوبەکر بەرێ کەوت و کۆچیان کرد لەمەککەوە بۆ مەدینە لەرێگادا چوونە ناو ئەشکەوتێك بەناوی ثە ور خوای گەورە سێ موعجیزەی رەخساند بۆ پاراستنی پێغەمبەرەکەی (ﷺ) ریوایەت کراوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەگەلّ ئەبوبەکری هاوەلّیدا خوالێی رازی بێت،چوونە ناو ئەشکەوتەکەوە خوای گەورە فەرمانی دا درەختێك لەدەرگای ئەشکەوتەکەدا سەوز بوو لقەکانی دەرگاکەیان دا پۆشی و خوای گەورە بەئیلهام فەرمانی بەجالّجالّۆکەدا تا لقەکانی ئەو درەختە بەدەزوومکەی بتەنێ و بەئیلهامیش فرمانی دا دووکۆترەکێویلە لەنێولقەکانی ئەودرەختە دا هێلانەیان بەست و هێلکە یان تێدا کرد . [٥]

ئەم سێ نیشانەیە کاریگەری چاکیان هەبوو لەچەواشەکردنی موشریکەکان تا بگەرێنەوەو نەچنە ناو ئەشکەوتەکەوە ،قورەیشی یەکان سەرسام مان : ئەگەر چووبنە ناو ئەشکەوتەکەوە ئەی چۆن داوی جالّجالّۆکەکە نەدراوەو هێلکەی کۆترەکەش نەشکاون؟ ئایا پێویست دەکات بچنە ناو ئەشکەوتەکەوە ؟ یەکێکیان ویستی بچێتە ژوورەوە ،ئەوە بوو یەکێکی تریان ووتی :

ئەم داوی جالّجالّۆکەیە هی پێش لەدایك بوونی موحەممەدە ،بەلاّم ماوەیەك لەبەردەم ئەشکەوتەکەدا وەستان قسەیان دەکرد، پێغەمبەری خوا (ﷺ) و ئەبو بەکر گوێیان لێ یان

---

[٦] ئیمام ئەحمەدو بەززار هەریەکە لەموسنەدەکی خۆیداو قاسمی کوری ثابیتیش لە ( الدلائل ) دا ( شرح المواهب ) ١/ ٢٩٩ حافیظ ئیبن عەساکیریش ( البداية والنهاية ) ٣ / ١٨١ ، ١٨٢ ) ئەو چیرۆکەیان ریوایەت کردووە.

بوو، ئەبو بەکر زۆر ترسا پێیان بزانن و پێغەمبەری خوا (ﷺ) تووشی ناڕەحەتی ببێ .بۆیە دەی ووت: ئەی پێغەمبەری خوا ئەگەر کەسێکیان سەیری ژێر پێی بکات دەمان بینێ ، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی:ئەی ئەبوبەکر ئەگەر خوای گەورە چاودێری دووکەس بێ و نە پشتیان بێ دەبێ کێ بتوانێ زیانیان پێ بگەینێ ؟ خوای گەورەش لەوبارەوە قورئانی ناردە خوارەوە،وەك فەرمووی :﴿ إِلَّا تَنصُرُوهُ فَقَدْ نَصَرَهُ ٱللَّهُ إِذْ أَخْرَجَهُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ ثَانِيَ ٱثْنَيْنِ إِذْ هُمَا فِى ٱلْغَارِ إِذْ يَقُولُ لِصَٰحِبِهِۦ لَا تَحْزَنْ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَنَا ۖ فَأَنزَلَ ٱللَّهُ سَكِينَتَهُۥ عَلَيْهِ وَأَيَّدَهُۥ بِجُنُودٍ لَّمْ تَرَوْهَا وَجَعَلَ كَلِمَةَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ ٱلسُّفْلَىٰ ۗ وَكَلِمَةُ ٱللَّهِ هِىَ ٱلْعُلْيَا ۗ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴾ التوبة ( ٤٠ )

واتە :ئەگەر ئێوە یارمەتی ئەو پێغەمبەرە (ﷺ) نەدەن ئەوە بێگومان خوا یارمەتی داوە کاتێك بێ بڕوایان دەریان کرد لەمەککە پێغەمبەر یەکێك بوو لەو دوو کەسە کاتێك ئەو دووانە پێغەمبەرو ئەبوبەکر لەئەشکەوتی ثە وردا بوون ئەو کاتە بەهاوەڵەکەی دەووت خەم مەخۆ بێگومان خوا لەگەڵمانە ئینجا خوای گەورە ئارامی و ئاسایشی بۆناردە خوارەوە وەیارمەتی دا بەسەربازانێك کەنەتاندین وتەی بێ باوەڕانی گێڕا بەژێر کەوتوو و ووتەی خوا هەر بەرزو بڵندە وە خوا زاڵی کاردرووستە .

## موعجیزەی ( ٧ ) ئەسپەکەی سووڕاقە دەستەکانی ڕۆدەچێ بەناخی زەویداو دووکەڵی لێ بەرز دەبێتەوە :

لەکاتی کۆچ کردنی پێغەمبەری خواو هاوەڵەکەی ئەبوبەکر لەمەککەوە بەرەو مەدینە قوڕەیشیەکان بەخششیان دانابوو کەبریتی بوو لە صەد سەر ووشتر بۆ هەر کەسێك کە پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) یان ئەبوبەکر بەزیندووی یان بەمردوویی بخاتە بەر دەستیان،جا ئەو هەواڵە لەدەشت و دەردا بلاو بۆوە ،خەڵکێکی زۆر کەوتنە تەماعی ئەو هەموو وشترەو هەوڵیان دەدا شوێن پێیان هەڵبگرن بیانگرن،سووراقەی کوڕی مالیکی کوڕی جوعشوومی مود لیجیش یەکێك بوو لەو هەوڵدەرانە وە سوارێکی زۆر ئازاش بوو،سووراقە دەڵێ:لەکاتێکدا کەلەکۆڕێکی قەومەکەمدا کەنەوەی موود لیج بوون دانیشتبووم، پیاوێکی هۆزەکەمان هات و لەسەر سەرمان وەستاو ئێمەش دانیشتووین وتی: سووراقە کەمێك پێش ئێستا لەکەناری دەریادا ڕەشایەتی چەند کەسێکم بەرچاو کەوت وای دەبینم کە موحەممەدو هاوەڵەکانی بووبن مەبەستی ئەوە بوو سووڕاقە ئاگادار بکات تاپێکەوە بۆ دەستکەوتنی خەلاتەکەی قوڕەیش دوایان بکەون،سوڕاقە دەڵێ :زانیم ئەوان بوون،بەلام وتم:ئەوانە ئەوان نەبوون،ئەوە فلان و فلان بوون بەبەرچاومانەوە ڕۆیشتن بەدوای ئاژەڵی وونبوودا دەگەڕێن،سووراقە دەیویست خەڵکەکە وازبهێنن و دوایان نەکەون ،تا بەخۆی بەتەنیا دەستگیریان بکات سوراقە ماوەیەك لەکۆڕەکەدا دەمێنێتەوە، پاشان بەبێ دەنگی هەڵدەستێ و دەگەڕێتەوە ماڵەوەو فەرمان دەدا بەکەنیزەکەکەی تا ئەسپەکەی بۆ بەرێت بۆ ئەودیوی گردەکەو لەوێ بیبەستێتەوە هەتا خۆشی ڕمەکەی هەڵدەگرێ و بەئەسپایی دەگاتە لای ئەسپەکەی،ئەوەبوو لە پشتەوە لەماڵ دەرچوو ڕمەکەی بەشێوەیەك لێکرد کەدەرنەکەوێ کەدەگاتە لای ئەسپەکەی خۆی هەڵدەداتە سەری و بە پەلە لێی دەخوڕێ هەتا نزیکی

پێغەمبەرو هاوەڵانی دەکەوێتەوە، لەوکاتەدا بەفەرمانی خوا ئەسپەکەی پێی هەڵدەکەوێ و سوراقەش بەسەریەوە دەکەوێتە خوارەوە و سواری ئەسپەکەی دەبێتەوە و دوایان دەکەوێتەوە تادیسان لێیان نزیك دەکەوێتەوە ،ئەوەندە نزیك دەکەوێتەوە تاوای لێدێ گوێی لەقورئان خوێندنەکەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەبێ کەئەو ئاوری نەدەدایەوە، بەلام ئەبوبەکر زۆر ئاوڕی دەدایەوە، وەزۆریش دەترسا کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) تووشی ناڕەحەتی ببێ .ئەبوبەکر ووتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەوە سوارێکە وا گەیشتە لامان لەڕیوایەتێکی تردا ئەبوبەکر ووتی :وتم :ئەوەی بەدوامانەوەیە وا گەیشتە لامان فەرمووی:خەمبار مەبە خوامان لەگەڵە ،جا کەنزیکتر کەوتەوە ئەوەندەی ڕمێك یان دوو ڕم یان دەفەرمووێ:ئەوەندەی دوو یا سێ ڕم مابوو بگاتە لامان وتم:ئەی پێغەمبەری خوا ئەوەی بەدوامانەوەیە وا گەیشتە سەرمان و دەستیشم بەگریان کرد، فەرمووی بۆچی دەگری ؟ وتم :بەخوا من بۆخۆم ناگریم بۆتۆ دەگریم ئەوەبوو پێغەمبەری خوا دووعای لێکردو فەرمووی:﴿**أَللّهم اصرعه ، أَللّهم اكفناه بما شئت**﴾ واتە: خوایە بیدە بەزەوی دا، خوایە بەشتێ کەخۆت ویستت لەسەری بێ لەکۆڵمانی بکەرەوە، سوراقە دەڵێ :هەردوو دەستی ئەسپەکەم تا ئانیشکی چوون بەناخی زەویداو منیش لەسەری کەوتم ودامی بەزەیدا، پاشان پیایدا هەڵشاخیم هەر ئەوەندەبوو کەهەردوو دەستی لەزەویەکەدا دەرهێنان و ڕێك وەستا، دەبینم لەشوێنی دەستەکانیەوە تۆزو گەردێکی وەك دوکەڵ بۆ ئاسمان بەرز بوویەوە بانگم کردن تا ئەمانیان لێوەرگرم و وتم: من سوراقەی کوری مالیکی کوری جوعشومم، بوەستن هەتا قسەتان لەگەڵدا بکەم ،دەبەخوا کارێك گومانی لێبکرێ بەرامبەرتان نایکەم، لەخوا بۆم بپاڕێوەو زیانت پێناگەیەنم، پێغەمبەری خواش دووعای بۆکرد سوراقە دەڵێ :ئەوان وەستان و منیش سواری ئەسپەکەم بووم وهاتم تاگەیشتمە لایان کاتێك کەئەوشتانە هاتنە ڕێم ئەوە کەوتە دڵمەوە

کەلەلایەن خواوە پارێزراوەو کاری پێغەمبەری خوا (ﷺ) سەردەگرێ،بۆیە پێم وت: خزمەکانت خەڵاتیان داناوە بۆ دەست خستنت،هەواڵی ئەوەشم دایە کەخەڵکی چۆن هەوڵدەدەن دەستگیری بکەن،وتم:

ئەی پێغەمبەری خوا چیت پێ خۆشە فەرمانم پێبدە فەرمووی:﴿ **قف مكانك ،ولا تترك أحداً يلحق بنا،وأخفِ عنا** ﴾ واتە:لەو شوێنەی خۆتدا بوەستەو مەهێلە هیچ کەس پێمان بگاتەوە و دەنگ و باسمان ئاشکرا مەکە، سوراقە دەڵێ :داوام لێکرد نامەیەکی ئەمانم بۆ بنووسێ،ئەویش فەرمانی بە سەر عا میری کوری فوهەیرە دا دا تا لەسەر چەرمێك بۆم بنووسێ ،پاشان هەڵی دا بۆم منیش هەڵم گرت و خستمە ناو تیردانەکەمەوەو گەڕامەوە،ئەو چیرۆکەی سوراقە بەراستی موعجیزەیەکی گەورەی تێدا دەرکەوت،وە بەئاشکرا دەرکەوت کە پێغەمبەری خوا ڕاست دەکات و لەلایەن خوای گەورەوە پارێزگاری لێ دەکرێ،وەموعجیزەیەکی گەورەی تریش ڕوویدا ئەویش ئەوەبوو کاتێك کە سوراقە ویستی بگەڕێتەوە پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئاوڕی دایەوە بۆلای وفەرمووی﴿ **كأني بك يا سراقة تلبس سواري كسرى**﴾ واتە:ئەبینم سوراقە جووتە بازوبەندەکەی کیسرا لەدەست بکەیت....

سوراقە بەسەر سورمانەوە پرسی:کیسرای کوری هورمز ؟ فەرمووی :بەڵێ ،سوراقە ئەوپەڕی سەرسامی دایگرت،هەواڵێکی سەیرە شتی زۆر بەدڵیدا هات بەبوونەی ئەو موعجیزەوە وەبڕوای بەوەش دەکرد بەڵام چۆن ؟ زۆر سەیرە، پێغەمبەر (ﷺ) خۆی لەخزمەکانی دەشارێتەوە نەوەکو دەستگیری بکەن،کەچی بەڵێنی واگەورە بە سوراقە دەدات ،سوراقە کەگەڕایەوە چەند ڕۆژێك دەنگی نەکرد تالەوە بێ خەم بوو کە پێغەمبەری خوا و هاوەڵانی بەسەلامەتی گەیشتوونەتە مەدینە،ئەوسا باسەکەی خۆیی و ئەو موعجیزە گەورەیەی پێغەمبەری خوای

( ﷺ ) بۆ خەڵك دە گێڕایەوە ،کەچۆن بەسەر ئەسپەکەیەوە چەندجارێك کەوتۆتە خوارەوە و دەست و پەلی ئەسپەکەشی بەناوزەیدا ڕۆچوون،تا ئەو دەنگ و باسە لەسەر زمانی خەڵکی یەوە گەیشتەوە مەککەو سەرکردە بتپەرستەکانی قوڕەیش لەوە ترسان کەئەو ڕووداوە ببێتە هۆیەك بۆ موسڵمان بوونی دانیشتوانی مەککە،ئەبو جەهل نامەیەکی بۆنەوەی موود لیج نووسی،کەسوراقە ئەمیرو سەروکیان بوو،تابەگوێی نەکەن،سوراقەش وەڵامی ئەبو جەهل دەداتەوەو سوێندی بۆدەخوات ودەڵێ :ئەگەر چاوی لێ بوایە چۆن دەست و پەلی ئەسپەکەی دەچوون بەزەیدا ،گومانی لەوە نەدەما کە موحەممەد ( ﷺ ) پێغەمبەری خوایە،کەسیش ناتوانێ دژایەتی بکات،ڕۆژان ڕابووردو موسڵمانان مەردانە دانیان بەخۆیاندا گرت وەك ڕۆژانی ڕەش و سەختی مەککەیان بەسەر بردن،ڕۆژانی برسێتی و نارەحەتی و گەمارۆی جەنگ و هەرای مەدینەشیان بەسەربردن ،تائەوە بوو پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) فەتحی مەککە کردو طائیفیش رزگارکراو دوا جەنگی جونەین سوراقە لە ( جعرانە ) هاتە خزمەتی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) نامەکەی ڕۆژی کۆچکرنی پیشاندا،فەرمووی : ﴿**الیوم یوم الوفاء والبر أدن**﴾ ،واتە :ئەمرۆ ڕۆژی وەفاو چاکەکردنە،وەرە پێشەوە، سوراقەش لە پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) چووە پێشەوەو شایەتمانی بەڕاستی هێنا ، خوای گەورە تەمەنی بەسوراقە بەخشی و تاسەردەمی خەلیفە عومەری کوری خەتتاب ژیاو،

تائەوەبوو سوپای ڕزگاری خوازی ئیسلام بۆ ڕزگارکردنی گەلان لەژێر چنگی ستەمکاران کەوتەڕێ ،سوپای ئیسلام بەرەو قەڵای پرستەمی ساسانیەکان هەڵمەتی بردو پایتەختی لەستەمی ستەمکاران رزگارکرد،پادشای ملهوڕو خوا نەناس مەدائینی بەجێ هێشت و تاج و جل و بەرگ و جووتە بازوبەندەکی بەجێ مان و لەگەڵ گەنجینەو ئاڵتوون و زیوی دەوڵەت کەوتە دەست موسڵمانان،بەدەستێکی پاکەوە هاوەڵان ئەو دەستکەوتەیان هێنایەوە بۆ

مەدینەی پایتەختی ئیسلام،ئەو زێڕو دوررو گەوهەرانە ئەوەنە زۆر بوون کە بە ملیۆنەها دینارو درهەم مەزندە دەکران، خەلیفە عومەر خوای گەورە لێی ڕازی بێت سەری لەدەست پاکی سەربازو سوپای ئیسلام سورما چۆن ئەو هەموو شتە گرانبەهایەیان لەمەدائینەوە گەیاندۆتەوە مەدینە بێئەوەی هیچی لێ کەم بکەن...بۆیە فەرمووی: بەڕاستی کەسانێك ئەمانەیان هێنابێتەوە خاوەن ئەمانەتن،ئیمامی عەلیش خوای گەورە لێی ڕازی بێت کەلەلای ئامادەبوو فەرمووی: تۆخۆت دەست پاکیت بۆیە ڕەعیەتەکەشت دەست پاك دەرچووە،خەلیفە عومەر ئەوهەموو دەستکەوتانەی دابەش کردو هیچی بۆخۆی دانەنا لەوکاتەدا خەلیفە عومەر بەڵێنەکەی پێغەمبەری خوای هاتەوە یاد کەبەسوراقەی فەرموو بوو جووتە بازو بەندەکەی کیسرا لەدەست دەکات،بەڵێ جووتە بازو بەندەکە کەوتنە دەست موسڵمانەکان وبەفەرمانی خوا گەیشتنە مەدینە تابەڵێنەکەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) سەربگرێت،عومەر بانگی کردە سوراقەو جووتە بازوبەندەکەی کیسرای کردە دەستی ،جا دەڵێن هەردوو قوڵی سوراقە مووی زۆر پێوە بووە ،دوای لەدەستکردنی خەلیفە عومەر خوا لێی رازی بێت فەرمووی: (**الله اکبر**) سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە ئەو بازوو بەندەی لە کیسرای کوری هورمز سەندەوەو کردنیە دەستی ئەعرابیەکی ئەوەی مودلیج،کەسوراقەی کوری جوعشومە ،خەلیفە دەنگی بەرزکردەوەو پاشان سوراقە ی سواری ولاغێك کردو شاری مەدینەی پێوە گێڕاو خەڵکیش دەورەیان لێدابوو،سوراقەش بەدەنگی بەرز فەرمایشتەکەی خەلیفەی موسڵمانان عومەری دووبارەکردەوەو دەی وت: ﴿ **الله اکبر الحمدلله الذي سلبهما کسرى بن هورمز ،وألبسهما سراقة بن جعشم أعرابياً من بني مدلج** ﴾

بەڕاستی ئەو ڕۆژە دانیشتوانی مەدینە گەورەو بچووك هەر هەموو کۆبوونەوە تا بەڵێن فەرموودەو موعجیزەی پێغەمبەری ڕاستگۆ (ﷺ) بەچاوی خۆیان ببینن٬بەڕاستی ڕۆژێك بوو

ئەرۆژە ناوداره‌کانی مەدینە کەموسڵمانان سوپاسی خوای گەورەو مەزنیان دەکرد لەسەرناردنی قورئان و پێغەمبەرو سەرکەوتن و سەرفرازی و بەختەوەری ،وەسوپاسی خوای گەورەیان دەکرد کەوا لەژێر سایەو سێبەری ئەم ئایینە ڕاست و دروست و پاك و پوختەدا بوونەتە خاوەنی ڕێزو پایەداری و سەربەرزی دنیاو قیامەت سوپاس و ستایشی زۆری بێ پایان بۆ خوای گەورە لەسەر بەخشینی ئەم هەموو موعجیزە گەورەو ناودارانە بە پێغەمبەری ئیسلام(ﷺ).

## موعجیزەی (٨) پیاوەکە سامی ووشەی (الله) ی لێنیشت و لەرزی لێهات شمشێرەکەی لە دەست کەوتە خوارەوە

لەکاتی غەزای ﴿ذو أمر﴾ئەم غەزایە گەورەترین هەڵمەتی سەربازی بوو کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێش جەنگی ئوحود بەخۆی فەرماندەی بووبێ ،هۆی ئەم هەڵمەتە ئەوەبوو هەواڵ دەرانی مەدینە هەواڵێکیان گەیاندە پێغەمبەری خوا (ﷺ) کەئەوە بوو،ئەوەی ثە علە بە و موحاریب کە دوو بنەماڵە ی غە طە فان بوون خەڵکێکی زۆریان کۆکردەوە و نیازیان وایە هەڵبکووتنە سەر مەدینە ی پایتەختی دەوڵەتی ئیسلام،ئەوە بوو پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەگەڵ چوارصەدو پە نجا هاوەڵیدا لەمەدینە دەرچوون، کاروباری مەدینەشی بە عوسمانی کوری عەففان سپارد،لەڕێگادا موسڵمانەکان پیاوێکیان گرت کەلەئەوەی ثە علە بە بوو و بردیانە خزمەتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەویش بانگی کرد بۆسەر ئیسلام و کابراکە موسڵمان بوو،درایە دەست بیلال و بووە چاو ساغی موسڵمانان بەرەو ناوچەی ئەوەی ثە علبە و موحاریب،کەهەواڵی سوپای ئیسلام گەیشتە دانیشتوانی ئەو ناوچانە هەموویان لەترسانا بەرەو لوتکەی شاخەکان هەڵاتن،سوپای موسڵمانان دەستی بەسەر ئەوناوچانەدا گرت و

گەیشتە سەر ئاوی ﴿ذو أمر﴾ کەشوێنی کۆبوونەوەی ناحەزانی ئیسلام بوو کاتێك کەدانیشتوانی ئەو ناوچە لەترسی سوپای موسڵمانان هەلاتن. فەرماندەی هێزی ئەوەی ثە علبە و موحاریب کە ( دعثور ) یان ( غورث المحاربي ) بوو هەوڵی دا پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) بکوژێت،ئەوەش لەکاتێکدا بوو کە سوپای موسڵمانان سەر ئاوی ( ذو أمر ) یان کردبووە سەربازگە، ئەوەبوو ڕۆژێك باران لەسەر ئەو شوێنە باری،بەهۆی بارانەکەوە جل و بەرگی پێغەمبەری خواش تەڕبوون،بۆیە بەسەر درەختێك هەڵی خستن بۆئەوەی ووشك ببنەوە، پاشان پاڵ کەوت،هەروەها هاوەڵانی پێغەمبەریش ا ( ﷺ ) هەرهەموویان بەهەڵ خستنی جل و بەرگیانەوە خەریك بوون،ئالەوکاتەدا ( دعثور ) فەرمانەدی ئەوهۆزانە ئەوەی بەهەل زانی و خۆی گەیاندە سەربازگەی موسڵمانان و تەماعی کەوتە سەر ئەوە کە پێغەمبەریش ( ﷺ ) بکوژێت،وەئەو دعثورە پیاوێکی ئازاو بەجەرگ بوو قەومەکەشی هانیان دەدا بۆ ئەوەی هەوڵی کوشتنی پێغەمبەری خوا بدات، ئەوکابرایە بەئاسانی چووە ناو سەربازگەی موسڵمانەکان بێ ئەوەی کەس هەستی پێبکات گەیشتە لای پێغەمبەر ی خوا ( ﷺ ) وبەشمشێرەوە گەیشتە سەرسەری و وویستی بیکوژێ ،پێغەمبەریش هیچ چەکی لەلانەبوو،وتی: ئەی موحەممەد ئێستا لەدەستم کێ ڕزگارت دەکات؟ فەرمووی :الله ، ئەو کابرایە سامی ووشەی ( الله ) ی لێنیشت و لەرزی لێهات و شمشێرەکە ی لەدەست کەوتە خوارەوە کەوت بەپشتا و پێغەمبەر یش ( ﷺ ) شمشێرەکەی هەڵگرت و بەرزی کردەوەو بەکابرای ووت :﴿من یمنعك مني﴾ کێ لەدەستی من دەربازت دەکات ؟ وتی هیچ کەس ، پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) چاوپۆشی لەکابرا کردو ئەویش بەدڵ و بەگیان موسڵمان بوو بەبینینی ئەو موعجیزەیە ، پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) شمشێرەکەی بۆگێڕایەوە ،ئەوکابرایە بەموسڵمانی گەڕایەوە ناوقەومەکەی وهەواڵی ئەو ڕۆشتنەی پێدان و ئەوانیشی بۆسەر ئایینی ئیسلامی پیرۆز بانگ کرد،هەواڵی ئەوەشی پێدان کەهۆکاری بەپشتدا کەوتنی و بەربوونەوە

ی شمشێرەکەی لەدەستی ئەوە بووە کەپیاوێکی بالأبەرز داویەتی بەسنگی داو کەزانیویشیەتی ئەوە مەلائیکەیە ئیمانی هێناومو موسلمان بووە.(٨).

## موعجیزەی (٩) ئەربەدی کوڕی قەیس وعامری کوڕی توفەیل پیلانێك دژی پێغەمبەری خوا (ﷺ) دادەڕێژن خوای گەورەش پیلانەکەیان پووچەڵ دەکاتەوە:

تەبەرانی لەعەبدوللأی کورشی عەبباسەوە هێناویەتی ئەربەدی کوری قەیس و عامری کوری توفەیل هاتن بۆ مەدینە لای پێغەمبەری خوا (ﷺ) گەیشتنە لای و ئەویش دانیشبوو، ئەوانیش لەبەردەمیدا دانیشتن، عامری کوری توفەیل وتی:ئەی موحەممەد ئەگەر موسلمان ببم چیم بۆدەکەی ؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ئەوەی بۆموسلمانان هەیە بۆتۆش هەیە لەسەر تۆش هەیە، عامری کوری توفەیل وتی: ئەگەر موسلمان ببم دوای خۆت هیچم بۆهەیە؟ فەرمووی:﴿ **ليس لك ولا لقومك ولكن لك اعنة الخيل** ﴾ واتە:ئەوە بۆخۆت و هۆزەکەشت نی یە بەلأم دەتکەمە فەرماندەی سوارەکان ،وتی: دەی من ئێستا ئەوەم هەیە،بەڵکو لادێکان بۆ من و شاریش بۆتۆ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی:نا ، کاتێك لەلای دەرچوون عامر وتی: بەخوا بۆت پڕدەکەم لەئەسپ و سەرباز، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی:خوا رێت لێ دەگرێ ، ئەربەدو عامر دەرچوون، عامر وتی: ئەی ئەربەد من موحەممەد بەقسە سەرقاڵ دەکەم و تۆش بەشمشێر لێی بدە ،چونکە ئەگەر موحەممەد بکوژیت خەڵکی بەڕازی بوون بەسەرانەدان زیاتر ناچن و ڕقیان لەشەڕ بەوە سەرانەیان دەدەینێ، ئەربەد وتی:

---

نیبن کەثیر لە ( البداية والنهاية ) دا باسی ئەوەی کردووە کەئەوەی دەعثوری خستووە بەپشتداو شمشێرەکەی لەدەست بەرداوەتەوە، جبریل بووە کەداویەتی لە سنگی ......

باشە، هەردووكیان گەڕانەوە بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ) عامر وتی: ئەی موحەممەد لەگەڵم هەستە تاقسەت لەگەڵدا بكەم، پێغەمبەر (ﷺ) لەگەڵی هەستا، لای دیوارەكە دانیشتن و پێغەمبەر (ﷺ) لەگەڵی وەستاو قسەی لەگەڵ دەكرد، ئەربەد شمشێری هەڵگرت، بەلام بەدەستی توانای شمشێرەكەی نەما، بۆیە لێدانەكەی دواخست پێغەمبەر (ﷺ) لایكردەوەو بینی ئەربەد چی دەكات لەلایان دەرچوو، كەئەربەدو عامر لای پێغەمبەر (ﷺ) دەرچوون گەیشتنە ﴿ الحرة﴾ دابەزین سەعدی كوری موعازو ئوسەیدی كوری حوزەیر چوون بۆیان و ووتیان :دەركەون ئەی دوژمنانی خوا ئەفرینی خواتان لێبێت، عامر ووتی: ئەوە كێ یە ئەی سەعد ؟ وتی:ئەوە ئوسەیدی كوری حوزەیری عاتبە، دەرچوون تاگەیشتنە ﴿ الرقم﴾ خوا هەورە بروسكەیەكی نارد بۆ ئەربەدو كوشتی عامر دەرچوو تا لە ﴿ الجریم ﴾ خوا دەردێكی بۆ نارد وگرتی و شەو لەماڵی ئافرەتێكی سەلولی بوو قورم كە گەیشتبووە قورگی و دەیوت دەردێ وەك دەردی ووشتر لەماڵی ئافرەتێكی سەلوولی حەز دەكات لەماڵی ئەو بمرێت، پاشان سواری ئەسپەكەی بوو لەگەڕانەوەیدا لەسەری مرد خوای گەورەش لەسەریان ئەو ئایەتەی دابەزاند ﴿أَللّهُ يَعْلَمُ مَا تَحْمِلُ كُلُّ أُنثَى ..........تا........وَمَالَهُمْ مِنْ دُونِهِ مِنْ وَالٍ﴾ [٩]

---

[٩] لەتەفسیری ئیبن كە ثیر ( ج٢ ، ص ٥٠٦ ) واهاتووە

## موعجیزەی (١٠) خوای گەورە مەلائیکەت دەنێرێ بۆیارمەتی دانی پێغەمبەر (ﷺ) لەجەنگی بەدردا :

عومەری کوری خەتتاب خوا لێی رازی بێ دەڵێ :لەرۆژی بەدردا پێغەمبەری خوا (ﷺ) تەماشای کرد هاوبەش پەیداکەران هەزارکەس بوون،هاوەڵانی خۆشی سێ سەدو نۆزدە کەس بوون پێغەمبەری خوا رووی لە رووگە کردو دەستەکانی بەرزکردەوە و داوای لەخوای گەورە دەکردو دەپارایەوەو دەی ووت: ﴿**اللهم انجز لي ماوعدتني،االلهم أت ماوعدتني ،اللهم إنك إن تهلك هذه العصا بة من أهل الاسلام لاتعبد في الارض**﴾ واتە:ئەی خوایە ئەو بەڵێنەی کە پێتدام بۆم بەجێ بێنە ئەی خوایە ئەگەر ئەوکۆمەڵەی موسڵمانان تیابچێت ئەوا لەسەر زەویدا تۆنا پەرسترێی ،بەردەوام دەپارایەوە لە خوای پەروەردگار دەستەکانی بەرزکردبووە بەرەو قبلە هەتا عەباکەی سەرشانی کەوتە خوارەوە ،ئەبوبەکر هات عەباکەی خستەوە سەرشانی و ووتی: ئەی پێغەمبەری خوا خوای گەورە ئەو بەڵێنەی کە پێتی داوە بۆتی جێ بەجێ دەکات،خوای گەورە قورئانی دابەزاندو فەرمووی: بیربکەنەوە کاتێك لەبەدردا هاناتان بۆ پەروەردگارتان دەبرد خواش هات بەهاناتانەوەو فەرمووی :من دەنێرم بۆتان هەزار فریشتە بەدوای یەکدا دێنە خوارێ وەخوا ئەوەی تەنها بۆ شادی و مژدە نارد تادڵەکانتان پێی ئارام بگرێت وەسەرکەوتنیش تەنها لای خوایەو بەس بەراستی خوا بەدەسەڵاتی کار بەدەست و کار بەجێ یە،بیربکەنەوە کاتێك خوا وەنەوزی بەسەرتان دا هێنا بووە هۆی دڵنیایی ئێوە لەلایەن پەروەردگار خۆیەوە بارانیشی لەئاسمانەوە بۆباراندن تاپاکتان بکاتەوە پێی و پیسی شەیتان و دوودڵی وگومان لەئێوە دوور بخاتەوە و پەیوەندی دڵەکانتان پتەوبکات وەبەو

بارانە پێکانتان جێگیرو دامەزراو بکات بێنەوە بیر کاتێك کەپەروەردگارت نیگای کرد بۆ فریشتەکان کەبێگومان من ﴿خوا﴾ لەگەڵتانم دەی دڵی کەسانێك قایم و دامەزراو کەن کەباوەڕیان هێناوە بەزوویی ترس و بیم دەخەمە دڵی ئەو کەسانەی کەبێباوەڕبوون جائێوەش لەسەرووی گەردنیان بدەن ،واتە :سەریان و هەموو سەرپەنجەکانیان واتە :لەهەموو لاشەیان بدەن لەسەرەوە تاخوارەوە ئەوە لەبەر ئەوەی کەبەڕاستی ئەوانە دژایەتی خواو پێغەمبەرەکەیان کردو هەر کەسێکیش دژایەتی خواو پێغەمبەرەکەی بکات ئەوە بێگومان تۆڵەو سزای خوا زۆر بەتینە،حوکم و سزای ئێوە ئەوەیە دەی بیچەژن وەبەراستی بۆ بێ بڕوایان سزای ئاگری دۆزەخ هەیە( سورەتی الأنفال ٩-١٤ ). هەر لەکە پرەکەدا پێغەمبەری خوا (ﷺ) سەرخەوێکی شکاندو پاشان بەخەبەرهات و فەرمووی:﴿ **أبشر يا أبابكر فقد أتاك نصرالله ،هذا جبريل أخذ بعنان فرسه يقوده على ثنا ياه النقع** ﴾ واتە: مژدەبێ ئەی ئەبوبەکر سەرکەوتنی خوا پێشکەش بە موسڵمانان کراو چاویشی لەجبریلە کە جڵەوی ئەسپەکەی گرتووەوهەموو گیانی بەعارەق خووساوە،وەهەروەها خوای گەورە لەبارەی یارمەتی دانی پێغەمبەرەکەی لەبەدردا فەرموویەتی:﴿ وَلَقَدْ نَصَرَكُمُ ٱللَّهُ بِبَدْرٍ وَأَنتُمْ أَذِلَّةٌ فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ *إِذْ تَقُولُ لِلْمُؤْمِنِينَ أَلَن يَكْفِيَكُمْ أَن يُمِدَّكُمْ رَبُّكُم بِثَلَٰثَةِ ءَالَٰفٍ مِّنَ ٱلْمَلَٰٓئِكَةِ مُنزَلِينَ *بَلَىٰٓ إِن تَصْبِرُواْ وَتَتَّقُواْ وَيَأْتُوكُم مِّن فَوْرِهِمْ هَٰذَا يُمْدِدْكُمْ رَبُّكُم بِخَمْسَةِ ءَالَٰفٍ مِّنَ ٱلْمَلَٰٓئِكَةِ مُسَوِّمِينَ *وَمَا جَعَلَهُ ٱللَّهُ إِلَّا بُشْرَىٰ لَكُمْ وَلِتَطْمَئِنَّ قُلُوبُكُم بِهِۦ وَمَا ٱلنَّصْرُ إِلَّا مِنْ عِندِ ٱللَّهِ ٱلْعَزِيزِ ٱلْحَكِيمِ *لِيَقْطَعَ طَرَفًا مِّنَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ أَوْ يَكْبِتَهُمْ فَيَنقَلِبُواْ خَآئِبِينَ﴾ال عمران ( ١٢٣- ١٢٧ ) واتە: سوێند بەخوا بێگومان خوا ئێوەی سەرخست لەجەنگی بەدردا لەکاتێکدا کەئێوە کەم ولاوازبوون دەی لەخوا بترسن بەڵکو سوپاس گوزاری بن بیریان بخەرەوە ئەوکاتەی دەت ووت بەبڕوادارەکان ئایا بەستان نی یە

**پەروەردگارتان کۆمەکتان بکات بەسێ هەزار لەفریشتە دابەزێنراوەکان بەڵێ ئەگەر ئارام بگرن وە لەخوا بترسن پەلامارتان بدەن لەم کاتانەدا پەروەردگارتان کۆمەکتان بکات بە پێنج هەزار لەفریشتە نیشانەدارەکان وەخوا تەنها ئەو کۆمەکیانەی کرد بە مژدە بۆتان وەبۆئەوەی دڵەکانتانی پێ ئارام ببێ سەرکەوتنیش تەنها لەلایەن خوای بالأدەستی داناوەیە وە ناردنی فریشتەکان بۆ ئەوە دابڕێت لەناوی بات بەشێك لەوانەی کەبێ بڕوان یان خەفەت باریان بکات بەتێشکانیان ئینجا بگەڕێنەوە بەنا ئومێدی .**

**وەهەروەها خوای گەورە دەفەرمووێ:**﴿ وَٱذۡكُرُوٓاْ إِذۡ أَنتُمۡ قَلِيلٞ مُّسۡتَضۡعَفُونَ فِي ٱلۡأَرۡضِ تَخَافُونَ أَن يَتَخَطَّفَكُمُ ٱلنَّاسُ فَـَٔاوَىٰكُمۡ وَأَيَّدَكُم بِنَصۡرِهِۦ وَرَزَقَكُم مِّنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ لَعَلَّكُمۡ تَشۡكُرُونَ﴾**الانفال ( ٢٦ ) واتە: بیربکەنەوە کاتێك کەئێوە کەم و لاوازو ژێر دەستەبوون لەزەوی مەککەدا دەترسان کە خەڵکی بتانفرێنن، ئینجا خوای گەورە پەنای دان وە بەیارمەتی خۆی پشتیوانی کردن وەڕسق و ڕۆزی لەشتە پاك و حەلاڵەکان پێ بەخشین بۆ ئەوەی سوپاس گوزاری خوا بن......**

**سەبارەت بەدابەزینی مەلائیکەتەکان لەغەزای بەدردا ئەبو سوفیانیش دا بەو راستی یەدا دەنێت کەسانێکی جل سپی بینیوە لە ڕۆژی بەدردا کەلەسەر ئەسپی ڕەش و سپی بوون لەنێوان ئاسمان و زەوی دا،ئیبن ئیسحاق لە عیکرەمەوە هێناویەتی دەڵێت: ئەبو رافیعی مەولای پێغەمبەر (ﷺ ) وتی:من غولامی عەبباسی کوری عەبدولموتەلیب بووم ،ئیسلام هاتبووە ناو ئێمەی ئالو بەیت،عەبباس موسڵمان بوو ئوم فەزڵیش موسڵمان بوو،منیش موسڵمان بووم،عەبباس ترسی لەهۆزەکەی هەبوو حەزی نەدەکرد پێچەوانەیان بوەستێ،موسڵمان بوونی خۆی دەشاردەوە،ئەو لەناو هۆزەکەیدا پارەیەکی زۆری هەبوو کەبڵاوبووبوویەوە،ئەبولەهەب لەبەدر دواکەوت و لەباتی خۆی عاصی کوڕی هیشامی کوری**

موغیرەی نارد هەروەها ئەوەی دوابکەوتایە لەبری خۆی کەسێکی دەنارد،کەهەواڵی بەرکەوتنی بەدریەکانی قوڕەیشی بیست خوا سەرشۆڕو ڕیسوای کردو ئێمەش لەدەروو نماندا هێزو عیززەتمان بەدی کرد،ئەبو ڕافیع دەڵێ:من کەسێکی لاوازبووم و کاری قاپ و قاچاغم دەکرد لەژووری زەم زەمدا نەخشم دەکرد،بەخوا لەوێ سەرقاڵبووم و ئووم فەزڵیش دانیشتبوو بەوهەواڵە خۆش حاڵبووین کەئەبولەهەب هات بەخراپە قاچەکانی ڕادەکێشا تا لەجێ دەرگای ژوورەکەدانیشت و پشتی لە پشتم بوو،دانیشتبوو کەبەخەڵکی ووت:ئەوە ئەبوو سوفیانە هاتووە،ئەبولەهەب ووتی:وەرە بۆلام بەخوا هەواڵت پێ یە،ئەویش لەلای دانیشت و خەڵکی لەدەوری بوون،وتی:برازا پێم بڵی باری خەڵکی چۆن بوو ؟ ووتی: بەخوا کە پێیان گەیشتین شان و گەردنی خۆمان پێدان تاچۆن بیانەوێت بمانکوژن و دیلمان بکەن ؟ئەی هاوار بەخوا لەگەڵ ئەوەشدا سەرکۆنەی خەڵك ناکەم ،بەکەسانێکی سپی ڕەنگ لەسەر ئەسپی ڕەش و سپی کەوتین کەلەنێوان ئاسمان و زەیدا بوون،بەخوا هەرچی بیویستایە دەیکرد ،ئەبو ڕافیع دەڵێ ووتم: بەخوا ئەوانە فریشتە بوون ئەبو لەهەب دەستی بەرزکردەوەو بەتووندی دای بەدەم وچاومدا و ووتی: هاوار بۆت بێدەنگ بە،هەڵیگرتم و دامی بەزەویدا، پاشان لەسەرم دانیشتوو لێی دەدام،منیش کەسێکی لاواز بووم،ئوم فەزڵ دارێکی ژوورەکەی هەڵگرت و دای لەسەری،ئازارێکی توند تووشی سەری بوو،ئوم فەزڵ وتی:بەوەی گەورەکەی لێرە نی یە وای لێدەکەیت ؟ ئەویش بەزەلیلی هەستاو ڕووی وەرگێڕا ،بەخوا حەوت شەو نەژیا تاخوا عەدەسەی بۆناردو کوشتی ،یونس لە ئیبن ئیسحاقەوە ئەوەی بۆ زیادکردووە،دووکورەکەی بەجێیان هێشت پاش مردنی بە سێ ڕۆژ نەیا نخستە ژێر گڵ تا بۆنی کرد،قوڕەیش خۆیان لەو عەدەسەیە دوور دەگرت وەك چۆن خۆیان لەتاعون دوور دەگر ت،تا کەسێکی قوڕەیش وتی: هاوار بۆتان دوو کورەکەی ئایا شەرم ناکەن باوکتان لەماڵەکەیدا بۆگەنی کردووە ئێوەش نایخەنە ژێرخاك ؟ وتیان:دەترسین لەو دوژمنەیە ،وتی:بڕۆن من چاوم لێتانە

لەسەری،بەخوا نەیانشۆرد بەڵکو لەدوورەوە ئاویان بەسەردا کردو لێی نزیک نەبوونەوە، پاشان بردیان بۆسەرووی مەککەو دایانە پاڵ دیوارێك و دواتر بەردیان بەسەردا کرد....وەهەروەها حاکم لە عەبدوڵڵای کوری زوبەیرەوە هێناویەتی دەڵێت:ڕۆژی بەدر زوبەیری کوری عەوام مێزەرێکی زەردی بەستووە فریشتەکانیش بەوشێوە مێزەر بەستنە دابەزین بەسەر بێباوەڕانداو وەهەروەها ئەبو نەعیم (الدلائل ص ١٧٠ ) لەعەبدوڵڵای کوری عەبباسەوە هێناویەتی دەڵێت:سیمای فریشتە لەڕۆژی بەدردا مێزەری سپی بوو کەدابوویان بەسەر پشتیاندا،ڕۆژی حونەینیش سەوز بوون،فریشتەکان تەنها ڕۆژی بەدر شەڕیان دەکرد،جارانی تر تەنها ژمارەو یارمەتیان زیادی دەکردو شەڕیان نەدەکرد،وەهەروەها یەکێك لە پشتیوانان عەبباسی کوری عەبدواموتەلیبی دیل کرد،عەبباس وتی:ئەی پێغەمبەری خوا بەخوا ئەوە منی دیل نەکرد بەڵکو پیاوێکی قژداهێنراو و قژدرێژ جوانترین ڕووی هەبوو لەسەر ئەسپێك بوو لەوخەڵکە نەبوو منی گرت، پشتیوانەکە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا من بەدیلی گرتم، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: بێدەنگ بە بەڕاستی خوای گەورە بە فریشتەیەکی بەڕێز پاڵپشتی کردیت.وەهەروەها هەرلەبارەی گرتنی عەبباسەوە هێناویەتی دەڵێت:ئەوەی عەبباسی گرت ئەبولیوسر کەعبی کوری عەمر لەبەنی سەلەمە بوو،ئەبولیوسر کەسێکی کۆکراوە بوو و عەبباسیش کەسێکی زەبەلاح بوو. پێغەمبەر (ﷺ) بە ئەبولیوسری فەرموو :چۆن عەبباست بەدیل گرت ئەی ئەبولیوسر ؟وتی:ئەی پێغەمبەری خوا کەسێك یارمەتی دام کەپێشترو دواتریش شێوەی وام نەدیبوو، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی:فریشتەیەکی بەڕێز لەسەری یارمەتی دایت.

وەهەروەها موسلیم لەعەبدوڵڵای کوری عەبباسەوە هێناویەتی کەسێك لەموسڵمانان بەدوای یەکێك لە بێباوەڕانی بەردەمی یەوە بوو،کەبیستی دەنگی قامچی یەك لەسەروویەوەو دەنگی سوار چاکێك دێ دەیوت: پێش کەوە ( حەیزوم ) ئەسپەکەی جبریل سەیری بێباوەڕەکەی کرد کە

ڕاکشاوەو دابەستراوەو بەلێدانی قامچی دراوە لەدەم و چاوی، پشتیوانی یەك هات و ئەوەی گێڕایەوە بۆ پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەویش فەرمووی:ڕاست دەکەی ئەوە لەیارمەتی ئاسمانی سێ یەمەوە بوو لەو ڕۆژی بەدرەدا موسلمانان حەفتایان لەکافرەکان کوشت و حەفتایان بەدیل گرت...

وەهەروەها پێغەمبەر (ﷺ) ڕۆژی غەزای بەدر مشتێك زیخی هەلگرت و بەڕوو کافرەکاندا وەشاندی و فەرمووی﴿ **شاهت الوجوه**﴾ کافرەکان شکان، خواش ئەم ئایەتەی دابەزاند ﴿ وَما رميت إذ رميت ولكن الله رمى﴾.

## موعجیزەی (١١) خوای گەورە پێغەمبەرەکەی (ﷺ) سەردەخات لەغەزای خەندەق دا بەڕەشەبا:

ئیبن سەعد لەسەعیدی کوری جوبەیرەوە هێناویەتی دەلێت:ڕۆژی خەندەق لەمەدینە بوو ،ئەبوسوفیانی کوری حەرب و هاودەمانی قورەیش و کینانەو عویەیەنەی کوڕی حەصن و غەتەفان و تولەیعەو بەنی ئەسەد و ئەبولئەعوەرو بەنی سەلیم هاتن،قورەیزەش لەگەلْ پێغەمبەر (ﷺ) بەلێنێکیان هەبوو،ئەو بەلێنەیان شکاندو دایانە پالْ بێباوەڕان،خواش ئەو ئایەتەی لەسەر دابەزاندن:﴿ وَأَنزَلَ ٱلَّذِينَ ظَٰهَرُوهُم مِّنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ مِن صَيَاصِيهِمْ وَقَذَفَ فِى قُلُوبِهِمُ ٱلرُّعْبَ فَرِيقًا تَقْتُلُونَ وَتَأْسِرُونَ فَرِيقًا ﴾ الاحزاب( ٢٦ ) واتە: خوا بەنی قورەیزە کە پشتگیری ئەوان قورەیش و غەطفانیان کرد هێنانی یە خوارەوە لەقەلاَکانیان وە ترسی خستە ناودلْیانەوە کۆمەلێکیان دەکوژن وەکۆمەلێکی تر بەدیل دەگرن...

جبیرل سەلامی خوای لێبێت هات و ڕەشەبای لەگەلْدا بوو، پێغەمبەر (ﷺ) کەجبریلی بینی سێجار فەرمووی:مژدەتان لێبێت خوا ڕەشەبای بۆ بێباوەڕان ناردو چادریان ڕماو پەتیان بڕاو

بارگەو بنەیان ژێر خاك کەوت،ئەوانیش ڕایان کردو کەسیان لای نەکردەوە بەلای کەسدا ،خوای گەورەش ئەو ئایەتەی لەسەر دابەزاندن ﴿إِذْ جَآءَتْكُمْ جُنُودٌ فَأَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ رِيحًا وَجُنُودًا لَّمْ تَرَوْهَا ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرًا﴾الاحزاب ( ٩ ) واتە: ئەی ئەوکەسانەی کەباوەڕتان هێناوە بیرلەچاکەو بەهرەی خوا بکەنەوەبەسەرتانەوە کاتێ لەشکرێکی زۆرتان بۆهات لەجەنگی خەندەقدا ئینجا ئێمە بایەکی بەهێزمان بۆناردن و لەشکری فریشتەش کەئێوە نەتان بینین وەخوا بەوەی ئێوە دەیکەن بینایە...

ئەوکات پێغەمبەر (ﷺ) گەڕایەوە،ئیبن سەعد لەحەمیدی کوری هیلالەوە هێناویەتی:دەڵێت قسەو بەڵێنێ لەنێوان پێغەمبەر (ﷺ) و قورەیزەدا هەبوو،کاتێ ئەحزاب هاتن وسەربازیان هێنا جوولەکەکانی بەنو قورەیزە بەڵێنیان شکاندو دایانە پاڵ بێباوەڕان دژ بە پێغەمبەری خوا (ﷺ) خوای گەورەش سەربازو ڕەشەبای ناردو ئەوانیش ڕایان کردو ئەوانی دیکەش لەقەلاکەیان دامانەوە وەهەروەها بەزار لەعەبدوڵلای کوری عەبباسەوە هێناویەتی دەڵێت:شەوی ئەحزاب ڕەشەبا هات وتی: بڕۆن تا پێغەمبەر سەردەخەین،بەشەو گەرما ناچێت ،ئەو ڕەشەبایەی کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێ سەرخرا کزە بوو. [١٠]

---

[١٠] کەسەکانی سەنەدە کە صەحیحن ئیبن ئەبی حاتەم لە عەبدوڵلای کوری عەبباس و ئیبن جەریر لەعیکرمەوە بەو واتایە هێناویانە وەك لەتەفسیری ئیبن کەثیر ج٣ ص ٤٧٠ دا هاتووە .

## موعجیزەی (١٢) جبیرل دەچێتە سەر قەڵای جوولەکەی بەنی قورەیزە:

ئەبو نەعیم لە ( الدلائل ص ١٨٢ ) لەئەنەسەوە هێناویەتی دەڵێت: سەیری تەپ و تۆزێکی نێو ڕێگەی بەنی غەنەمم کرد کاروانی جبریل سەلامی خوای لێ بێت بوو کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) چووە بۆلای بەنی قورەیزەو ئیبن سەعد (ج٢ ص ٧٦ ) لەئەنەسەوە هەر بەم شێوەیە هێناویەتی،وەهەروەها لە ( ج٢ ص ٧٧ ) لەحەمیدی کوری هیلالەوە بەو شێوە باسی بەنی قورەیزەی هێناوە،وەتیایدا هاتووە دەڵێت: پێغەمبەر (ﷺ) وهاوەڵانی چەکیان هەڵگرت،جبریل سەلامی خوای لێبێت هات بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ) ئەویش چووە دەر بۆلای، پێغەمبەر (ﷺ) دابەزی و پاڵی دابوویەوە بەلاسنگی ئەسپەکەدا ،جبیرل دەیوت: ئێمە هێشتا چەکمان دانەناوە،تۆز لەسەر تەوێڵی مابوو،هەستە بۆ بەنی قورەیزە ، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ﴿ان في أصحاب جهدا فلو أنظر تهم أياما﴾ واتە: هاوەڵانم ماندوون دەکرێ چەند ڕۆژێ مۆڵەتیان بدەم،جبریل فەرمووی: هەستە بۆ بەنی قورەیزە ،بەخوا بەو ئەسپەم دەچمە قەڵایان و تێکی دەشکێنم،جبریل سەلامی خوای گەورەی لێبێت، لەگەڵ فریشتە هاودەمەکانی چوو تا تەپوتۆز گەڕەکی بەنی غەنەمی پشتیوانانی گرتەوە،وەهەروەها ئەبو نەعیم لە (الدلائل ص١٨٢ ) لەعائیشەی دایکی بڕوادارانەوە هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر (ﷺ) دەنگی کەسێکی بیست ڕاچڵەکاو چووە دەرەوە بۆلای عائیشە (خوا لێی ڕازی بێت ) دەڵێت:منیش شوێنی کەوتم و سەیرم کرد دەبینم لەسەر لاملی ئەسپێك پاڵی داوەتەوەو دحیەی کلبیە(ڕەزای خوای لێبێ ) ئەوەش بەو شێوەی منیش وامدەبینی،مێزەری بەستبووو مێزەرەکەی لەنێوان دووشانیدا بەرەو خوار هاتبوو ، پێغەمبەر

(ﷺ) کەهاتە ژوورەوە بۆلام ووتم تووند هەستایت و دواتر دەرچوویت،منیش سەیرم کرد دحیەی کەلبی بوو،فەرمووی ئایە بینیت ؟

وتم بەڵێ:فەرمووی:ئەوە جبریل سەلامی خوای لێ بێ بوو :فەرمانی پێکردم دەربچم بۆ بەنی قورەیزە وەهەروەها ئەبونەعیم لەسەعیدی کوری موسەییەوە هێناویەتی و باسی چیرۆکی بەنی قورەیزەی کردووەوتیادا هاتووەو دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) دەرچوو بۆچەند کۆڕێك کەلەنێوان ئەوویەنی قورەیزەدا بوون،فەرمووی:ئایا کەس دای بەلاتاندا ؟وتیان:بەڵێ دحیەی کەلبی لەسەر وولاخێك کەلەژێریەوە کۆپانی دیباج هەبوو دای بەلاماندا،فەرمووی:ئەوە دحیە نەبوو بەڵکو جبریل بوو نێردرابوو بۆبەنی قورەیزە تا قەڵاکانیان بهەژێنێ و ترس بخاتە دڵیانەوە

## موعجیزەی (١٣) خوای گەورە فریشتەکانی دەنێرێ بۆ یارمەتی پێغەمبەرەکەی (ﷺ) لەجەنگی حونەین دا:

خوای گەورە لەقورئانەکەی خۆیدا لەبارەی یارمەتی دانی پێغەمبەرەکەی لەجەنگی حونەین کە تەنها چەند کەسێك بەهاوەڵەکانی لەدەورەوە مابوون فەرموویەتی:﴿ لَقَدْ نَصَرَكُمُ ٱللَّهُ فِى مَوَاطِنَ كَثِيرَةٍۢ ۙ وَيَوْمَ حُنَيْنٍ ۙ إِذْ أَعْجَبَتْكُمْ كَثْرَتُكُمْ فَلَمْ تُغْنِ عَنكُمْ شَيْـًۭٔا وَضَاقَتْ عَلَيْكُمُ ٱلْأَرْضُ بِمَا رَحُبَتْ ثُمَّ وَلَّيْتُم مُّدْبِرِينَ * ثُمَّ أَنزَلَ ٱللَّهُ سَكِينَتَهُۥ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ وَعَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ وَأَنزَلَ جُنُودًۭا لَّمْ تَرَوْهَا وَعَذَّبَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ۚ وَذَٰلِكَ جَزَآءُ ٱلْكَٰفِرِينَ * ثُمَّ يَتُوبُ ٱللَّهُ مِنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ عَلَىٰ مَن يَشَآءُ ۗ وَٱللَّهُ غَفُورٌۭ رَّحِيمٌۭ ﴾التوبة(٢٥-٢٧) واتە: سوێند بەخوا بەڕاستی خوا سەری خستن لەزۆر جێگاو شوێنداو لەڕۆژی

حونەینیشدا یارمەتی دان کەبەزۆری خۆتان دەنازین بەلاّم هیچ سودێکی نەبوو بۆتان و زەویتان لەسەر تەنگ بوویەوە، بەو فراوانیەی کەهەیەتی، پاشان پشتتان کردە دوژمن و هەڵهاتن لە پاش ئەوە خوا ئارامی خۆی نارد بۆ پێغەمبەرکەی بۆ بڕوادران وەسەربازانێکی لەئاسمانەوە ناردە خوارەوە کەئێوە نەتاندیین وەسزای بێبڕواکانیشی دا بەکوشتن و بریندارى وبەدیل گرتن ئەوەش سزای بێباوەڕانە پاشان خوا خۆش دەبێت لە پاش ئەوە لەهەرکەسێك کەبیەوێ وەخوا لێبووردەی میهرەبانە،لەغەزای حونەین دا تەنها سەدکەس بەدەوری پێغەمبەری خوا (ﷺ) مابوونەوەو کەشەست و حەوت کەسیان لە ئەنصارەکان وسی و سێشیان لە موهاجیرەکان بوون،ئالەوکاتە نارەحەتیەدا خوای گەورە فریای پێغەمبەرەکەی دەکەوێ و لەو ناخۆشی و ناهەمواری یە ڕزگاری دەکات و پشتگیری دەکات و چەند موعجیزەیەکی گەورەی بۆ دەرەخسێنێ و لەشکری زۆروبێ شوماری کافرەکانی بۆ دەشکێنێ و سەرکەوتن و دڵنیایی بەپێغەمبەرە خۆشەویستەکەی دەبەخشێ،لەبەرائی کوری عازبیەوە خوالێی ڕازی بێت کەئەویش یەکێك بووە لە وانەی کەلەدەوری پێغەمبەری خواوە مابوونەوە دەوریان چۆڵ نەکردبوو ڕیوایەت کراوە کەووتوویەتی: بەوخوایەی کەجگەلەخۆی خوایەکی تر نی یە پێغەمبەری خوا (ﷺ) پشتی هەڵنەکرد،بەڵکو داوای سەرکەوتنی کرد،پاشان لەسەر وولاغەکەی دابەزی و دەیفەرموو:﴿ **أنا النبيُّ لاكذب أنا ابن عبدالمطلب** ﴾ وەلەو ساتە ئاسکانەدا پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەخوادەپاڕایەوە و دەیفەرموو: ﴿**اللهم لك الحمدو إليك المشتكى وأنت المستعان**﴾ یارمەتی مەلائیکەتەکان بۆ پێغەمبەر (ﷺ) لەجەنگی حونەین دا چەند نموونەیەك، ئیبن جەریر لەعەوفی ئەعرابی لە عەبدوررەحمانی مەولای ئیبن برثنە وە هێناویەتی دەڵێت:یەکێك لەبێباوەڕان لەڕۆژی جەنگی حونەین دا بۆی گێڕامەوە وتی:کەئێمەو هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ) لەڕۆژی حونەین دا

بەیەك گەیشتین هێندەی شیر دۆشینێك نەوەستان بۆمان، کەبەسەریاندا زاڵبووین بەدوایاندا دەچووین تالەلای خاوەنی وولآخی سپی وەستاین، سەیرمان کرد پێغەمبەری خوا (ﷺ) ، لەلای کەسانێك سپی و دەم وچاو جوان پێمان گەیشتن و پێیان ووتین: دەم وچاوەکان گول بن ، بگەڕێنەوە ، ئێمەش شکاین و ئەوانیش بەسەرماندا زاڵبوون و سەرکەوتن. (١١)

وەهەروەها ئیبن ئیسحاق لەجوبەیری کوری موتعەمەوە -خوا لێی ڕازی بێ - هێناویەتی دەڵێت: ئێمە لەگەڵ پێغەمبەری خوا (ﷺ) بووین لەڕۆژی حونەین، خەڵکیش شەڕیان دەکرد کەسەیرم کرد شتێك وەك جلی ڕەش لە ئاسمانەوە دەهاتە خوار تا کەوتە نێوان ئێمەو خەڵکەکە، سەیرم کرد مێروویەکی بڵاوبۆوەیە دۆڵەکەی پڕکردبوو، خەڵکەکەی تووشی شکست کرد ، گوما نمان نەبوو ئەوە فریشتەیە. (١٢)

وەهەروەها بەیهەقی لەعەوفی کوری عەبدورەحمانی مەولای ئوم برسن لەکەسێکەوە حونەینی بەبێباوەڕی دیبوو وتی: کاتێك ئێمەو پێغەمبەر (ﷺ) بەیەکگەیشتین هێندەی دۆشینی مەڕێك بۆمان نەوەستان شمشێرەکا نمان لەبەردەم پێغەمبەردا (ﷺ) گەڕو لاسار کەوتن تا لێی جیاکەوتین لەنێوان ئێمەو ئەودا کەسانی دەم وچاو جوان هەبوون، ووتی: دەم و چاوەکان ناشیرین کەون بگەڕێنەوە بەو قسەیە شکاین. (١٣)

وەهەروەها یەکێکی تر ئەوە دەگێڕێتەوە کەسیخورانی مالیکی کوری عەوفی سەرکردەی بێباوەڕان لەجەنگی حونەین دا بەترس و لەرزێکی بێ ئەندازە دەگەڕێنەوە لای لێیان دەپرسێ: تیاداچن، ئەوە چیتانە ؟ دەڵێن : پیاوی سپیمان دیتن بەسەر ئەسپی بەڵەکەوە بەخوا خۆمان پێنەگیراو ئاوەهامان بەسەرهات...

---

(١١) لەتەفسیری (ئیبن کەثیر ج٢ ص ٣٤٥ ) داهاتووە

(١٢) بەیهەقی لەو ڕێگەیەوە هێناویەتی لە ( البداية والنهاية ج٤ ص ٣٣٤ ) داواهاتووە .

(١٣) لە ( البداية والنهاية ج٤ ص٣٣٢ ) داواهاتووە .

وەهەروەها لەوەشاندنی زیخ و خۆڵیش لەڕۆژی حونەین دا چەند نموونەیەك بەیارمەتی خوای گەورەباس دەکەین،بەیهەقی لەسائیبی کوری یەسار لەیەزیدی کوری عامری سوائیەوە هێناویەتی دەڵێت:ئێمە لەسەر ئەوترسەی خوا لەڕۆژی حونەین دا خستی یە دڵی بێباوەڕان پرسیارمان لیکرد چۆن بوو؟ وتی: چەویکی بۆهەڵدەگرتین و فڕێی دەدایە ناو تەشتێك دەنگی دەدایەوە،ئێمە ئەوەمان لەدەروو نماندا بەدیدەکرد...[١٤]

وەهەروەها تەبەرانی و ئەبونەعیم و ئیبن عەساکیر لەحارثی کوری بەدەلەوە هێناویانە دەڵێت: رۆژی حونەین پێغەمبەر (ﷺ) بینی هاوەڵانی داشکان جگە لەعەبباسی کوڕی عەبدولموتەلیب و ئەبوسوفیانی کوڕی حارث پێغەمبەر (ﷺ) مشتێك خۆڵی بەسەرماندا فڕێدا ئێمەش شکاین،وامدەبینی چی درەخت و بەرد هەیە بەدوامانەوەیە.[١٥]

وەهەروەها یەعقووبی کوڕی سوفیان لەعەمری کوڕی سوفیانی ثە قەفییەوە جگە لەویشەوە هێناویەتی دەڵێت: ڕۆژی حونەین موسڵمانان شکان و تەنها عەبباس و ئەبوسوفیانی کوڕی حارث لەگەڵ پێغەمبەر (ﷺ) مانەوە، پێغەمبەر مشتێك زیخی هەڵگرت ووەشاندی بەڕووی دەم و چاویاندا، دەڵێت: ئێمەش شکاین و وامان دەزانی چی دارو بەرد هەیە سوارچاکە و بەدواماندا دێت،ثە قەفی دەڵێت: چوومە سەر ئەسپەکەم تاچوومە تائیف وەهەروەها تەبەرانی لە﴿المعجم الکبیر والاوسط﴾ دا لەحەکیمی کوڕی[١٦] خرامەوە هێناویەتی دەڵێت: دەنگێکمان لەئاسمانەوە بیست کەهاتە سەرزەوی وەك دەنگی چەوو زیخ لەتەشتێکدا وابوو،پێغەمبەر (ﷺ) ئەوەی وەشاندو ئێمەش شکا ین.[١٧]

---

[١٤] (البدایة والنهایة ج٤ ص ٣٣)

[١٥] لە (کنز العمال ج٥ ص ٣٠٤ )داواهاتووە ئیبن مندەو ئیبن عەساکیر بەکورتی لێوەی هێناوە.

[١٦] لە (البدایة والنهایة ج٤ ص٣٣٢ ) داواهاتووە.

[١٧] هەیسەمی ( ج٦ ص٨٤ ) دەڵێت سەنەدەکەی باشە.

بەڕاستی ئەوانە موعجیزەی ئەوەندەگەورەن کەبەقەد تۆزقاڵێك گومان ودوودڵی ناهێڵن لەناودڵەکاندا وەوەك ڕۆژی ڕووناك پێغەمبەرایەتی پێغەمبەری ئیسلام دەسەلمێنن هەزاران درووود بۆ گیانی پاکی ئەو پێغەمبەرە پایەدارە (ﷺ).

## موعجیزەی (١٤) بەوێنەی برووسکە پارچە ئاگرێکی بۆ دێ لەترسان دەست بە چاویەوە دەگرێت :

لەجەنگی حونەین دا شەیبەی کوڕی عوسمانی عەبدەری کەیەکێك بوو لەدانیشتوانی مەککە لەڕۆژی ئازادکردنی مەککەدا موسڵمان بوو بوو لەجەنگی ئوحوددا هەڵگری ئاڵای قوڕەیش بوو و بەدەستی موسڵمانەکان،لەگەڵ دەستەی هەڵگرانی ئاڵا دا هەر هەموویان کوژرابوون،وویستی لەتۆڵەی باوکیدا پێغەمبەری خوا (ﷺ) بکوژێت،شەیبە دوای ئەوەی کەبەچاکی ئیمانی هێنا ئەو ڕووداوەی دەگێڕایەوەو دەی وت: وتم: ئەمڕۆ تۆڵەی باوکم دەستێنم،شەیبە دەڵێ :هەوڵم دا پێغەمبەری خوام (ﷺ) دەست بکەوێ،شتێك هات بەڕوومداو دڵمی داگیرکرد،ئیتر توانای ئەم کارەم نەماو زانیم بەمن ناکوژرێ..ئەو شەیبەیە ئەوەندە داخ لەدڵ بوو دەی ووت ئەگەر عەرەب و عەجەم هەرهەمووی دوای ئیسلام بکەوێ و تاقە پیاوێك نەمێنێ من شوێنی موحەممەد ناکەوم،کەخەڵکەکە تێکەڵ بوون و پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەسەر ئێسترەکەی دابەزی ،شەیبە شمشێرەکەی لەکێلان دەرهێناو لێی نزیك کەوتەوەو شمشێری بەرزکردەوەو خەریك بوو دای بێنێتەوەو پێغەمبەری ئیسلام (ﷺ) بکوژێت،کەچی لەو کاتەدا بەوێنەی بروسکە پارچە ئاگرێکی بۆدێ کەخەریك دەبێ لەناوی بەرێ ،وەلەترسان دا دەست بەچاویەوە دەگرێ و پێغەمبەری خوا (ﷺ) بانگی دەکات:﴿**یا شیبة أدنُ مني**﴾ واتە:شەیبە لێم نزیك بکەوەرەوە ،شەیبە لێی نزیك دەکەوێتەوەو ئەویش

ئاوڕێکی لێدەداتەوە و زەردەخەنەیەك دەکات ودەست بەسەر سنگی شەیبەدا دێنێ وپاشان دەفەرمووێ:﴿أللهم أعذه من الشيطان﴾ واتە: خوایە لەداوی شەیتان پەنای بدە،شەیبە دەڵێت:دەبەخوا هەر ئەوساتە ئەوم لە گوێم و چاوم وخۆمم خۆشتر دەویست ،وەهەرچی دەربارەی ئەو لەدڵم دا هەبوو خوا لای برد. پاشان فەرمووی:لێم نزیك بەرەوەو جەنگ بکە ،شەیبە دەڵێ: منیش لەبەردەمیدا شمشێرم دەوەشاند خوا چاك دەزانێ پێم خۆش بوو بەگیانی خۆم لەهەموو شتێك بیپارێزم،خۆ ئەگەر باوکم زیندوو بوایە لەو ساتەدا تووشی بوومایە شمشێرم لێی نەدەگێڕایەوە .

## موعجیزەی (١٥) دەستی لەسەر سنگم لانەبرد،هەتا وام لێهات لەبەدی هێنراوانی خوادا هیچ شتێك نەبوو لەو خۆشەویست تر بێ بەلامەوە:

لەکاتی ئازادکردنی مەککەدا کەگەیشتنە کەعبەی پیرۆز، پێغەمبەری خوا (ﷺ) یەکەم جار تەوافی ماڵی خوای کرد،ئەوەندە قەرەباڵغ بوو ئەویش بەسەر پشتی ووشترەکەیەوە بوو بەگۆچانێك ئامازەی بۆبەردە ڕەشەکە دەکرد، پاشان دوورکات نوێژی کرد،دوای ئەوە تەشریفی بەرەو زەمزەم ڕۆیی و داوای ئاوی زەمزەمی کرد،بۆ خواردنەوەو دەست نوێژ هەڵگرتن،کاتێك کەدەست نوێژی هەڵگرت موسڵمانەکان نەیاندەهێشت ئاوەکە بگاتە سەرزەوی و دەیانگرتەوە،بت پەرستەکان بەسەر سورمانەوە دەیان ووت:هەرگیز پادشای وەهامان نەدیوەو نەبیستووە،لەو ڕۆژەی کەمەککە تیایدا لەبت و بتپەرستی ئازادکرا لەکاتی تەوافی کەعبەی پیرۆزدا پیاوێکی ئەوەی بەکری کوری کەنانە کەناوی فوضالەی کوری عومەیر بوو هەوڵی دا دەست لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) بووەشێنێت و بیکوژێ،بەلام خوای گەورە پێغەمبەرەکەی لەوە

ئاگادارکردوکاتێك کە فوضالە لێی نزیك کەوتەوە تادەستی لێبوەشێنێ،ئەم پرسیارەی لێکردو فەرمووی:(( أ فوضالە ) ؟ واتە : فوضالە تۆی ؟ وتی :بەڵێ ئەوم ئەی پێغەمبەری خوا فەرمووی :﴿ماذا کنت تحدث في نفسك﴾ واتە :لەدڵی خۆتدا باسی چیت دەکرد؟ فوضالە وتی: زیکری خوام دەکرد، پێغەمبەری خوا (ﷺ)پێکەنی وپاشان فەرمووی: ﴿أستغفرالله﴾ فەرمووی :داوای لێخۆش بوون لەخوا بکە، پاشان دەستی موبارەکی خستە سەر سنگی ودڵی نیشتەوە، فوضالە دەی ووت:دەستی لەسەر سنگم لانەبرد،هەتا وام لێهات لەبەدی هێنراوانی خوادا هیچ شتێك نەبوو لەو پێغەمبەرە (ﷺ) خۆشەویست تربێتبەلامەوە.

## موعجیزەی( ١٦ ) پیلانی جوولەکەکان سەری نەگرت :

بە گێڕانەوەی صەحیح چەسپاوە دەگێڕنەوە کە : جارێك پێغەمبەر (ﷺ) پاڵی بە دیواریکەوە دابووەوە ، جولەکەکان پیلانیان لە دژی پێغەمبەر (ﷺ) سازکردو ، یەکێکان ویستی بەردێکی گەورەی بەسەردا بکێشێت پێش ئەوەی دەستی خۆی بووەشێنێت ، پێغەمبەر (ﷺ) هەڵساو ڕۆیشت [١٨] بەم جۆرە بەبۆنەی پارێزگاری خوای گەورەوە پیلانەکەیان سەری نەگرت .

---

[١٨] ( رواه ابن اسحاق الشفا ٣٥٢/١ )

## موعجیزەی (١٧) گوێی لە دەنگی پێغەمبەر (ﷺ) بوو ، کەچی بەچاو نەیدەبینی:

وەلیدی کوڕی موغەیرە ، هات بۆلای پێغەمبەر (ﷺ) بەنیازی ئەوەی بیکوژێت ، بەڵام خوای گەورە چاوەکانی واکوێر کرد کەگوێی لە دەنگی پێغەمبەر بوو ، کەچی بە چاو نەیدەبینی ، ناچار گەڕایەوە بۆ لای هاوڕێکانی ، ئەوانیشی نەبینی تابانگیان کرد . هەربەم جۆرە مایەوە هەتا پێغەمبەر (ﷺ) تەشریفی لە مزگەوت دا بوو ، بەڵام کەلەمزگەوت ڕۆیشتە دەرەوە چاوی چاك بووەوە چونکە هیچ پێویستەیەك بە کوێری ئەو نەما....

## موعجیزەی (١٨) شوانەکە دڵی مۆرکراو لەبیری چۆوە :

دەگێڕنەوە کە شوانێك دەنگو باسی پێغەمبەر (ﷺ) وئەبوبەکری دەست کەوت ، یەکسەر بە ڕاکردن ڕۆیشت تاکو قوڕەیش ئاگادار بکاتەوە ، کە گەیشتە مەککە ، دڵی مۆرکراو نەیدەزانی چی بکات و لە بیری برایەوە بۆچی هاتووە تا گەڕایەوە جێی خۆی لە دواییدا بۆی دەرکەوت کەلە بیری براوەتەوە[١٩]

---

[١٩] ( الشفا ١/ ٣٥١ ) .

## موعجیزەی (١٩) لەلای باشترین مرۆڤ هاتوومەتەوە :

دەگێڕنەوە کەجارێك کابرایەکی دەشتەکی بەشمشێرەوە هاتە سەر پێغەمبەر (ﷺ) و پێی وت : ئێستا کێ لەدەست من ڕزگارت دەکات ؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی : (الله) یەکسەر دەستی پیاوە دەشتەکییەکە کەوتە لەرزین و شمشێرەکەی لێ کەوتە خوارەوە [٢٠] ئینجا پێغەمبەر (ﷺ) هەڵی گرتەوە و فەرمووی : ئەی ئێستا کێ تۆ لەدەستی من ڕزگار دەکات ؟ هەر لەم ڕیوایەتەدا دەڵێت : لە ئە نجامدا پێغەمبەر (ﷺ) لێی خۆش بوو ، ئەویش گەڕایەوە بۆ ناو هۆزەکەی خۆی و پێی وتن: لەلای باشترین مرۆڤەوە هاتوومەتەوە .

## موعجیزەی (٢٠) ئیتر زانیم کەس چاری تۆ ناکات و تۆ لەسەر هەقیت:

لە مانگی شەوالی ساڵی شەشەم دا ، یەك مانگ پێش حودەیبیە پێغەمبەری خوا (ﷺ) هاوەڵی ئازاو لێ هاتووی بەناوبانگی عەمری کوڕی ئومەییەی ضە مریی ، لەگەڵ سەلەمەی کوڕی ئەسلەم دا نارد بۆ لای ئەبوسوفیانی کوڕی حەرب ، کە فەرمانەی گشتی سوپای مەککە بوو و، فەرمانی بەسەر هەردووکیان دادا کە لەهەر کوێ چاویان پێی کەوت بی کوژن ، هۆی ئەو ناردنەش بۆ کوشتنی ئەبو سوفیان ئەوەبوو کە ئەبوسوفیان ئەعرابی یەکی بەکرێ گرتبوو و ، فەرمانی بەسەردادا بوو کە بچێت بۆ مەدینە و پێغەمبەری خوا بکوژێت ، کابرا گەیشتە مەدینەو هەوڵیشی دا کەپێغەمبەری خوا (ﷺ) بکوژێت ، کەچی خوای گەورە کارەکەی ئاشکرا کردو ، بەرلەوەی دەست بەکار بێت ، موسڵمانان گرتیان و ، دوایش دانی نا

---

[٢٠] صحيح : رواه البخاري ومسلم ) .

بە هەموو شتێك داو پێغەمبەری خواش چاوپۆشی لێ کردو ، دوایش کابرا موسڵمان بوو کورتەی چیرۆکەکە ئەمەیە کە ئەبوسوفیانی کوڕی حەرب لەگەڵ چەند قورەیشی یەك کەوتە باسی ئەوەی کەهێزی موسڵمانەکان لە زیاد بووندایە و ، بت پەرستان تێك ئەشکێنن پاشان ئەبوسوفیان وتی: ئەوە کەسێك نیە بچێت موحەممەد بکوژێت و لەدەستی بحەسێینەوە ؟ کە ئەم قسیەی ئەبوسوفیان بلاْوبوویەوە ، ئەعرابیەك هات بۆلای وپێی وت : وا ئەوپیاوەت دۆزیەوە کەلەهەموو پیاوێك دڵ پتەوترو، دەست وەشێنترو ، لە ڕێ بڕین دا خێراتر بێت مەبەستی خۆی بوو جا ئەگەر تۆ کۆمەکیم بکەیت ، ئەوا ئەچم بۆ ئەوێ و ئەی کوژم خەنجەرێکم پێیە هەر ئەڵێی دەنووکی بازەو ، هیچ کەسیش ناگات بە تۆزی پێم دا ، من خۆم شارەزای هەموو ڕێگایەکم ئەبوسوفیان ئەمەی بە دڵ بوو و، وشترێك و هەندێ پارەی پێدا و داوای لێکرد کە ئەم باسە لای کەس نەدرکێنێ ، شەو لەمەککە دەرچوو ماوەی نێوان مەککەو مەدینە بە پانزە ڕۆژ ئەبڕدرا ، کەچی ئەم ئەعرابیە بە پێنج ڕۆژ بڕیی و سەر لەبەیانی ڕۆژی شەشەم گەیشتە مەدینە کە گەیشت وشترەکەی بەستەوە و ، پاشان هەواڵی پێغەمبەری خوای (ﷺ) پرسی لەبەر ئەوەی پاسەوانی نەبوو ،بەئاسانی دۆزیەوە لەوکاتەدا پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە مزگەوتی ئەوەی عەبدولئەشهەل بوو کۆمەڵێك لە هاوەڵان لە دەوری بوون ، کابرا بێ خەم خۆی کرد بە ژووردا کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) سەرنجی دا هەستی کرد ئەو کابرایە نییەتی خراپە ، بۆیە فەرمووی (ان هذا اليريد غدراً والله حائل بينه وبين مايريد) فەرمووی : ئەمە ئەیەوێ غەدرێك ئەنجام بدات و خواش نایەڵێ ئەعرابیەکە پرسی : کامەتان کوڕی عەبدول موطەلیبە ؟ فەرمووی : من کابرا بە پەلە لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) نزیك کەوتەوە و ، وەك بیەوێ نهێنی یەکی پێ بڵێ ، بەسەریا چەمی یەوە و ، ئەی ویست خەنجەری لێ بدا ، کەچی ئوسەیدی کوڕی حوضە یر دەستی دایە ئەعرابیەکەو ڕای کێشایە دواوەو وتی : لە پێغەمبەر دوور بکەرەوە هەردوو دەستی گرت و کە ئیزارەکەی ڕاکێشا ئەبینێ وا خەنجەرێکی

پێ یەو ، وتی : ئەی پێغەمبەری خوا ئەمە کاری خرا پی بەدەستەوەیە ، ئەعرابی هاواری کرد خوێنەکەم، ئوسەیدی کوڕی حوضە یر کاکۆڵی گرت و خەریك بوو بی خنکێنێ ، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی : (أصدقني ما انت وما اقدمك ؟ فان صدقتني نفعك الصدق ، وان كذبتني فقد اطلعت على ما هممت به ) فەرمووی ڕاستم پێ بڵێیت بە کەڵکت دێ و گەر درۆیشم لەگەڵ دا بکەیت ئەوا لەوەی کەنیازت کردووە ئاگادار کراوم ئەعرابی وتی : لە خۆم بێ خەم بم ؟ فەرمووی : (وانت امن ) باسەکەی بەووردی بۆ گێڕایەوە ئەعرابیەکە لای ئوسەیدی کوڕی حوضە یر بەند کراو ، بۆ سبەینێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) بانگی کرد و فەرمووی : (قد امنتك فاذهب حيث شئت ، او خير لك من ذلك ) فەرمووی : ئەمانم پێ دابوویت ، بۆ کوێت پێ خۆشە بڕۆ ، ئایا لەوە چاکترت ناوێ ؟ وتی: کامەیە ؟ فەرمووی : (ان تشهد ان لااله الا الله وانی رسول الله ) کابرا موسڵمان بوو وتی : ئەی پێغەمبەری خوا هەرگیز لە هیچ پیاوێك نەترساوم ، کەچی کەتۆم دیی هۆشم بەخۆمەوە نەما و ترس دای گرتم و ، تۆش بەنیازی دڵمت زانی ، خۆ ڕێبوارانیش پێشم نەکەوتوون و ، کەسیش لێی ئاگادار نەبووە ، ئیتر زانیم کەس چاری تۆ ناکات و،تۆ لەسەر هەقیت و حیزبی ئەبوسوفیانیش حیزبی شەیتانە پێغەمبەری خواش (ﷺ) زەردەخەنەی دەکرد[٢١]

## موعجیزەی (٢١) پارێزگاری خوای گەورە لە پێغەمبەر (ﷺ) :

پاراستن و پارێزگاری کردنی پێغەمبەر (ﷺ) لەلایەن خوای گەورەوە موعجیزەیەکی ئاشکراو ڕاستیەکی یەکجار ڕوونە و بەدەقی ئایەتی قورئان باسی لێوەکراوە کە دەفەرمووێت (يايهاالرسول بلغ ما انزل اليك من ربك وان لم تفعل فما بلغت رسالته والله يعصمك من

---

[٢١] ژیانی نازیزمان (صلى الله عليه وسلم) بەرگی دووەم لاپەڕە ٢٢٦ تا ٢٢٨ .

الناس ان الله لایهدی القوم الکافرین ) المائدة ( ٦٧ ) واتە : ئەی پێغەمبەر ( ﷺ ) ڕایگەیەنە بەخەڵك ئەوەی هێنراوەتە خوارەوە بۆت لەلایەن پەروەردگارتەوە وەئەگەر وانەکەی ئەوە ڕاسپێریەکەی خوات ڕانەگەیاندووەو بەجێت نەهێناوە وە خوا تۆ دەپارێزێ لەخەڵکی کە بت کوژن بێگومان خوا ڕێنموونی بێ بڕوایان ناکات ... لەو ئایەتە پیرۆزەدا موعجیزەیەکی زۆر گەورە هەیە ، لەبەر ئەوەی لەو کاتەدا کە پێغەمبەر ( ﷺ ) ئەوەی ڕاگەیاند کە خوای گەورە هەڵیبژاردووە تا دوا پەیامی خۆی لەسەر دەستی ئەودا ڕابگەیەنێت بە مرۆڤایەتی ، تە حەددای تەنها تاقمێك ، یان نەتەوەیەك ، یان چەند پێشەوایەکی سیاسی

یان چەند کاربەدەستێکی دیاری کراوی نەکردووە ، بەڵکو تەحەدای هەموو دەستەڵاتداران و خاوەن ئاینەکانی بەگشتی کردووە ، لە کاتێکدا جگە لە خوا هیچ پارێزگارێکی نەبووە ، تەنانەت مام وخزم وکەس وکارو تیرەکەشی دوژمنی بوون ، کەچی سەرەڕای ئەوەش ، بیست و سێساڵی ڕەبەق ، بەبێ هیچ پاسەوانێك ، ژیانی بەسەر بردو چەندین ڕووداوی سامناکیشی لەو ماوەیەدا بەسەرهات ، لەگەڵ هەموو ئەوانەش ، هەر تەنها خوای گەورە دەیپاراست و ، تائەو کاتەی کۆچی دوای کردوو گەڕایەوە لای خوای گەورە بەو پەڕی دڵنیایی و ئاسوودەییەوە ژیا ، ئەوەش بەڕاستی موعجیزەیەکی زۆر گەورەیە ، هەردووك ئیمامی پایەدار بوخاری و موسلیم و پێشەوایانی تری فەرمووده لە عائیشەی دایکی بڕوادارانەوە دەگێڕنەوە ، کەدەفەرمووێت ، تا ئەو کاتەی ئایەتی ( و الله یعصمك من الناس ) هاتە خوارەوە پێغەمبەر ( ﷺ ) پاسەوانی هەبوو ، بەلام کە ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە ، پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) سەری لەماڵەوە هێنایە دەرەوە و فەرمووی: ﴿ أيها الناس انصرفوا ، فقد عصمني ربي ، عز وجل ﴾ واتە : خەڵکینە فەرموون بڕۆن وا خوا خۆی دەمپارێزێت .

## موعجیزەی (٢٢) پێغەمبەری خوا(ﷺ) هەواڵ دەدات بە ئەبوجەهل کەبەبێ باوەڕی وسەربڕاوی کۆتایی بەژیانی دێت:

لە ڕیوایەتێکدا کە ئیبن ئەبوو شەیبە لەعەمری کوری عاصەوە دەی گێڕێتەوە کە ووتوویەتی:تەنها ڕۆژێك چاوم لێ بوو کە قوڕەیش دەیان ویست پێغەمبەر(ﷺ) بکوژن،ئەوەبوو لە پەنای کەعبەدا دانیشتبوون و کەوتنە تەکبیری ئەوەی کەئازاری بدەن وپێغەمبەری خواش لەنزیك مەقامدا نزێژی بەجێ دەهێنا،عوقبەی کوڕی ئەبو موعیط هەستایەوە بۆیی و عەباکەی خستە ملی وڕای کێشا هەتا بەسەر ئەژنۆیدا کەوت و خەڵکەکە هاواریان لێ بەرز بوویەوەو وایان زانی گیانی دەرچوو،لەولاوە ئەبوبەکر (خوا لێی ڕازی بێ)بەپەلە هات و هەردوو قۆڵی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەدواوە گرتن و دەی فەرموو پاشان کافرەکان وازیان لە پێغەمبەر (ﷺ) هێنا، پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەستایەوەو دەستی بەنوێژ کرد ،کەنوێژەکەی تەواو کرد بەلایاندا هات وکافرەکانیش لەسێبەری کەعبەدا دانیشتبوون و فەرمووی:﴿**یا معشر قریش أما والذي نفس محمد بیده ما أرسلت إلیکم إلا با لذبح**﴾ واتە: ئەی کۆمەڵی قوڕەیش بەوخوایەی کە گیانی موحەممەدی بەدەستە سەربڕین بەشتانە ئەگەر ئیمان نەهێنن ، بەدەستیشی ئاماژەی بۆ قورگی کرد،ئەبو جەهل پێی وت:تۆ هەرگیز نەفام نەبوویت، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی:﴿أنت منهم﴾.[٢٢]

بەوەش هەواڵیدا کەئەبو جەهل سەربڕین بەشیەتی هەروەك پێغەمبەر فەرمووی:ئەوە هاتەدی ،ئەوەبوو ئەبو جەهل چونکەئەگبەتی و بەدبەختی سەرشانی گرتبوو یەکێك بوو لەو

---

[٢٢] شرح حیاة الصحابة ١/ ٤٤٤ – ٤٤٥

کەسانەی کەدورێکی سەرەکی هەبوو لەهەڵگیرسانی جەنگی بەدردا ئەوەبوو لەو جەنگەدا بەکافری تیاچوو و سەری بڕدرا....

## موعجیزەی (٢٣) هەواڵدانی پێغەمبەر (ﷺ) کەخوای گەورە ئایینەکەی خۆی سەردەخات و ئاشتی و ئاسوودەیی بەرقەرار دەبێ:

لە خەبیابی کوری ئەرەتەوە – خوا لێی ڕازی بێ - دەگێڕنەوە کە وتوویەتی:هاتمە خزمەتی پێغەمبەر (ﷺ) کەلەسێبەری کەعبەدا بوردەیەکی کردبووە پاڵ پشتی و ئێمەش بەدەست بت پەرستەکانەوە گیرمان خواردبوو وتم:ئایا لەخوا ناپاڕێیتەوە بۆمان ؟دانیشت و دمم و چاوی پیرۆزی سووربوویەوەو فەرمووی:﴿ **قد كان من كان قبلكم ليمشط بأمشاط الحديد مادون عاظمه من لحم أو عصب،ما يصرفه ذلك عن دينه وليتمن الله هذا الأمر حتى يسير الراكب من صنعاء الى حضرموت مايخاف إلاّ الله عزَّ وجل،والذئب على غنمه وفي رواية ( ولكنكم تستجلون)**﴾ [٢٣] واتە: ئەوانەی لەپێش ئێوەوە ئیماندا ربوون هیوایان هەبوو کەستەمکاران دەیانگرت وبۆئەوەی لەئایین پاشگەز بێتەوە بەشانەی ئاسنین گۆشت و دەماری لاشەی لەئێسقانەکانیان جیانەکردنەوە بێ ئەوەی ئەوە لەئایین وازی پێ بهێنێ،جائەو ئایینەش بەجۆرێك خوا بەئاکامی دەگەیەنێت کەسوار بەتەنیا لەصنعاوە هەتا حەضرەمەوت بڕواو لەهیچ نەترسێ جگە لەخوای گەورە،وەگورگیش کەهەلەت بۆ مەڕەکانی بەرێت ،بەلام

---

[٢٣] ( رواه البخاري ومسلم )

ئێوە پەلە دەکەن هەروەك پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) فەرمووی دەقاو دەق ئەو هەواڵە هاتە دی و خوای گەورە ئایینەکەی خۆی بە پایان گەیاندو سەری خست...

## موعجیزەی ( ٢٤ ) هەواڵ دانی پێغەمبەر (ﷺ) سەبارەت بەنووسراوەکەی کابە کەمۆرانە خواردوویەتی جگە لەووشەی بەرزو بڵندی خوای گەورە:

بێ باوەڕانی قورەیش بەچاوی خۆیان دەیانبینی بانگەوازی خوایی ڕۆژبەڕۆژ پەرە دەسێنێ خەلکی لەدەوری کۆدەبێتەوە .زۆرچاك دەیانزانی کەخەلك شوێن بەرنامەی ئیسلام بکەوێ ئەوە کورسی ئەو ستەمکارانە دەکەوێتە لەرزەوەو ئاستەنگ لەبەردەم بەرژەوەندی یەکانی ئەواندا درووست دەکات،چونکە ئایینی پیرۆزی ئیسلام ئایینی دادگەری و یەکسانی یەو بەیەکسانی مامەڵە لەگەڵ تاکەکانی مرۆڤایەتی دا دەکات،جالەبەرئەوە بەهەموو شێوەیەك کەوتنە بەربەرەکانی کردن لەگەڵ پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) وبانگەوازە پیرۆزەکەی بۆئەوە لەشیوی حەصصەب کۆبوونەوە و بڕیاریاندا و سوێندیان خوارد کەدژی ئەوەی هاشم و ئەوەی موتەلیب بووەستن،بەوەی کەنەژن و ژن خوازیان لەگەڵدا بەکەن و نەکڕین و فرۆشتن ونەهەلس وکەوت،نەتێکەلاویان نەکەن و نەچنەماڵیان و قسەیان لەگەڵدا نەکەن ،ئەوەیان لەشێوەی بەلگەنامەیەکدا نووسی،ئەو نووسراوە بەدەستی بەغیضی کوڕی عامیری کوری هاشم نووسرا، پێغەمبەری خواش ( ﷺ ) دووعای لێکدروو دەستی ووشك بوو،قورەیش بۆئەوەی ئەوبڕیارەیان سەربگرێ و کەس نەوێرێ لەدژی بوەستێ لەناو کەعبەدا هەلیانواسی،ئەوەش لەسەرەتای مانگی موحەڕڕەمی ساڵی حەوتەمی پێغەمبەرایەتی دا،ئەوەی هاشم و ئەوەی موتەللیب لەشیوی ئەبو تالیبدا بەندکران و لەدانیشتوانی مەککە دابڕان،دابڕان و گەمارۆی

قورەیش بۆ موسڵمانەکان درێژەی کێشا،بەڕادەیەك کەخۆراك و کەل و پەلیان لێبڕا،چونکە هەرخۆراکێك دەهاتە ناو شاری مەککەوە خێرا بت پەرستە دەوڵەمەندەکان دەیان کڕی و موسڵمانەکان بەیەکجاری تەنگیان پێ هەڵچنرا،لەودیوی شیوەکەوە دەنگی منداڵان و ژنیان دەهات کەلەبرسان دەکڕوزانەوە،ئیتر ئەگەر شتێکیان بەنهێنی پێبگەیشتایە و تەنها لەمانگەکانی حەرامدا کەلەشیوەکە دەرچوونایە بۆ شت کڕین ،جاری واش هەبوو کەکاروانێك لەدوورەوە دەهات هەوڵیان دەدا بەرلەوەی بگاتە ناو شاری مەککە دەستیان بگاتیٌ و شتێکی لێبکڕن،بەلام هەرکام لەخاوەنانی کاروانەکە ئەگەر خەڵکی مەککە بوایە،کەل وپەلەکەی لەسەرموسڵمانەکان ئەوەندەگران دەکرد تاتوانایان نەبێت بی کڕن،ماوەی دووسێ ساڵ بەم شێوەیە مانەوە،ئیبن هیشام باسی ئەوەی کردووە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەئەبوتاڵیبی فەرمووە:﴿**یاعم إن الله سلط الأرضة على صحيفة قريش،فلم تدع فيها إسماً هو لله إلاّ أثبتته فيها،ونفت منها الظلم،والقطيعة والبهتان**﴾ واتە :مامە خوای گەورە مۆرانەی ناردووەو جگە لەناوی خوا هەرچی نووسینی سەر ئەو نووسراوە هەیە لەستەم و ڕەحم بڕیی و بووهتان،هەرهەمووی سڕیوەتەوە...ئەبوتاڵیب وتی: ئایا پەروەدگارت ئەو هەواڵەی پێداوی ؟

فەرمووی: بەڵێ:وتی:دەبەخوا ناهێڵم کەس بچێتە کەعبەوە،خێرا هەستاو هات بۆلای قورەیش وتی:ئەی کۆمەڵی قورەیش موحەممەدی برازام هەواڵێکی ئاوەهاو ئاوای پێداوم،ئادەی وەرن بەلای نووسراوەکەتانەوە جائەگەر وابوو کە ئەوفەرموویەتی:ئەوا وازلەدابڕانمان بهێنن و لەسەر ئەو بڕیارە دابەزان،خۆ ئەگەر وانەبوو ئەوا برازاکەم دەدەم بەدەستتانەوە،خەڵکەکە ووتیان: ئێمە ڕازین و لەسەر ئەوە پەیمانیان بەست،ئەوە بوو موطعیمی کوری عەدی هەستا بۆ نووسراوەکە،سەیری کرد جگە لە نووسراوی ﴿باسمك اللهم﴾

هەرهەموو نووسینەکە مۆرانە خواردوویەتی:چۆن پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموو بووی بەو شێوەیە بوو....[٢٤]

## موعجیزەی ( ٢٥ ) هەواڵ دانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەپەیدا بوونی درۆزنێك و خوێن ڕێژێك لەهۆزی سەقیف:

ئەبو نەوفەل ـ خوا لێی ڕازی بێت – وتی: لاشەی عەبدوڵلای کوڕی زوبەیرم دی،لەهەورازەکەی مەدینە بەداردا کرابوو،واتە:لەو هەورازە کەوا لەمەککە، بەڵام ناوی هەورازی مەدینەیە،چونکە لە سەر ئەوڕێگەیە یە کەلەمەککەوە دەچێت بۆ مەدینە،لاشەکەی لەوێدا لەسێدارە درابوو،پیاوانی قوڕەیش و خەڵکانی تر بەلایدا بەخامۆشی ڕادەبوورن،لەترسی حەجاج نەیان دەوێرا قسەبکەن،بەڵام کاتێك عەبدوڵلای کوڕی عومەر گەیشتەلای،لەدیاری ڕاوەستاو سێ جار ووتی: سڵاو لەتۆ ئەی باوکی خوبەیب،سێ جاریش وتی:بەخوا بۆخۆم گەلێك پێم وتیت کەدانیشەو شتی وامەکە،سەری خۆت دامەنێ،ئینجا ووتی: بەخوا بە پێی ئاگا لێبوونی من ،تۆ ڕۆژوو گرێکی زۆر باش بووی و ڕۆژووی سوننەتت زۆر دەگرت وشەونوێژکەرێکی زۆرچاك و خزم دۆستێکی زۆر چاك بووی،

سوێند بەزاتی خوا گەل و میللەتێك کەپیاوی چاکی وەك تۆ تیایدا بێ،بەڕاستی گەلی چاکە.ئینجا عەبدوڵلای کوڕی عومەر تێپەری و ڕۆیشت.کاتێك کەئەو هەڵوێست و فەرمایشتانەی عەبدوڵلای کوڕی عومەر گەیشتەوە بەحەجاج ناردی لاشەکەیان لەقەدی دار خورماکە داگرت ولەناو گۆڕستانی جولەکەکاندا ناشتیان،لەپاشان حەجاج ناردی بەشوێن

---

[٢٤] ( ژیانی نازیزمان – صلى الله عليه وسلم - ) لاپەرە ٣٠٦ - ٣٣٤

ئەسمای کچی ئەبوبەکری هاوەڵی پێغەمبەری خوا (ﷺ) کەدایکی عەبدوڵلابوو، بەلآم ئەسمارازی نەبوو کە بچێ بۆلای، حەججاجیش نوێنەرەکەی خۆی ناردەوە بۆلای، کەوا یان بەپێی خۆی دێ بۆلام یان کەسێکی وادەنێرم کەهەتا بەپرچی خۆی ڕای بکێشێ ،دیسان ئەسما گوێی نەدایە قسەی حەججاجی زۆردار، وتی:

بەخوا تانەنێریٚ بەپرچەکانم پەلکێشم بکەن نایێم بۆلات،جا حەججاج وتی: کوا پێلآوەکانم لەکوێ یە ؟ پێلآوەکانی کردە پێی وبەفیزو خۆبەزلزانی یەوە بە پەلە چوو بۆلای ئەسما کەگەیشتەلای پێی وت: خۆدیتت کەچیم لەو دوژمنی خوایە کرد ئەسما وتی:ئەوەی من دیم ئەوەیە:کەڕاستە تۆ ئەو دنیایەت لەو تێکدا،بەلآم ئەویش ئەو دنیای تری واتە ژیانی دواڕۆژی لەتۆ تێکدا ،ئەسما وتی: بیستوومەتەوە گوایە تۆ بەتانەو تەشەرەوە پێی دەڵێی کوڕەکەی ژنە دوو پشتێن،بەڵێ بەخوا ڕاستە کەمن دوو پشتێنم هەبوو،یەکێکیان نان و خواردەمەنی پێغەمبەری خواو ئەبوبەکرم پێ دەبەست لەلاقەدی ولآخ و ئەوی تریشیان وەك هەموو ئافرەتێك بۆ کارو فەرمان دەمبەستە پشتم،ئەوە هیچ عەیبی تێدا نی یە،بەلآم زۆر چاك بزانە ئەی حەججاج کە پێغەمبەر (ﷺ) بۆخۆی پێمانی فەرموو:کەلەناو هۆزی سەقیف کەسێکی درۆزن پەیدا دەبێت کەلافی پێغەمبەرایەتی لێدەدات لەگەڵ کەسێکی خوێن ڕێژ،ئەوەبوو پێغەمبەرە درۆزنەکەمان بەچاوی خۆمان دی کەموختاری کوڕی ئەبو عوبەیدی سەقەفی بوو،ومن وادەزانم کەخوێن ڕێژەکەش تۆی ئەی حەججاج وتی:ئیتر حەججاج بەسەری شۆڕەوە و لوتی شکاوەوە لەلای ئەسما هەستاو وەلآمی پێنەدرایەوە....[٢٥]

---

[٢٥] أخرجه مسلم فضائل : ٦٤٤٣

## موعجیزەی (٢٦) هەواڵ دانی پێغەمبەر(ﷺ)سەبارەت بەچارەنووسی بەدی موسەیلەمەی درۆزن:

عەبدوڵڵای کوری عەبباس - خوا لێی ڕازی بێت - وتی: موسەیلەمەی درۆزن هات بۆ مەدینە، خەڵکێکی زۆری لەهۆزەکەی خۆی لەگەڵدا بوو دەی ووت:ئەگەر موحەممەد لەدوای خۆی کاروباری بەمن بسپێرێ من بکات بەجێگری خۆی دێمە ناوئاییەنەکەی ، پێغەمبەریش (ﷺ) سابیتی کوڕی قەیسی کوڕی شەمماسی لەگەڵ خۆی بردو سابیت خەتیبی پێغەمبەر بوو، پێغەمبەر (ﷺ) پارچە چیلکەیەکی پەلکە خورمای بەدەستەوە بوو کەگەیشتە لای موسەیلەمە لەناو هۆزەکەی دا بوو ،لەدیاری ڕاوەستا و فەرمووی : ئەگەر داوای ئەو پارچە چیلکەیەشم لێبکەی ناتدەمێ چ جای ئەوەی کە بتکەم بەجێنشینی خۆم، تۆ ناتوانی فەرمانی خوا بشکێنی وئەو فەرمانەی خوا لەبارەی تۆوە بڕیاری داوە بەتۆ ڕەت نابێتەوە، خۆ ئەگەر لەمن هەڵگەڕێیتەوە خوا لەگلو گۆت دەخات، وات دەبینم کەتۆ ئەو کابرایەیت کەبەخەو حاڵی بەدی ئەوم پێ نیشان دراوە، ئەوا من دەڕۆم ئەوە سابیتە چی قسەیەکت هەیە ئەو لەجیاتی من وەڵامت دەداتەوە ، پێغەمبەر (ﷺ) بەجێی هێشت وڕۆیشت عەبدوڵڵای کوری عەبباس وتی: لەبارەی ئەو خەونەی پێغەمبەرەوە کەفەرمووی: لەئەبو هورەیرەم پرسی وتی: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: نووستبووم لەخەوما دیم کەلەهەردوو دەستمدا دووبازنی زێڕم دی ئەوە غەمگینی کردم، لەخەوەکەمدا سرووشم بۆکرا، ئادەی فوویان لێبکە، منیش فووم لێکردن، جا هەردووکیان فڕین، ئەو بازنانەم بەدوو درۆزن لێك دایەوە کەلەدوای من شۆڕەتیان بڵاودەبێتەوە وناویان دەزرێ ئەو دوو درۆزنە یەکێکیان ئەسوەدی عەنسی بوو، ئەوی تریان موسەیلەمەی درۆزن بوو، لەدوا ئەوەی کە پێغەمبەر (ﷺ) وەفاتی کرد، موسەیلەمەی درۆزن خەڵکێکی زۆری لەخۆی کۆکردەوەو هەڵی خەڵەتاندن و چەواشەی کردن، خەلیفەی

پێغەمبەریش ئەبوبەکر ( خوا لێی ڕازی بێت ) لەشکری ئیسلامی بۆناردن ولەگەڵ لەشکری موسەیلەمەی درۆزن ڕووبەڕوو بوونەوەو لەئەنجامدا سوپای بڕواداران سەرکەوت بەسەر سوپای شەیتانداو موسەیلەمەی درۆزن و فێڵباز و ستەمکار بەکافری کۆتایی بەژیانی هات ،هەواڵ دانەکەی پێغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم ) کەلەبارەی فەرمووبووی ڕاست دەرچوو... [٢٦]

## موعجیزەی (٢٧) هەواڵ دانی پێغەمبەر (ﷺ) لەبارەی (أم الحرام)ی کچی ( ملحان ) کەبەشداری غەزا دەکات لەسەردەریا:

ئەنەسی کوڕی مالیك –خوا لێی ڕازی بێت – دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) سەردانی ( أم الحرام ) ی کچی ( ملحان ) دەکرد کەژنی عەبادەی کوڕی صامت بوو ڕۆژێکیان سەردانی کردو میوانداری کردو خواردنی دایە ئینجا پێغەمبەر (ﷺ) خەوی لێکەوت،کەخەبەری بوویەوە پێدەکەنی ( أم ملحان ) دەڵێ وتم: بۆچی پێدەکەنی ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ؟ فەرمووی: کەسانێك لەئومەتم پیشاندرا کەغەزایان دەکرد لەڕێی خوادا، سواری دەریا بوو بوون،بووبوونە پاشا لەسەر عەرشی پاشایەتی،یان وەکو پاشاکان لەسەر عەرشی پاشایەتی دەڵێ:وتم ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) دووعام بۆبکە خوا بمکات بەیەکێك لەوان، پێغەمبەر (ﷺ) دووعای بۆکرد، پاشان سەری نایەوەو خەوی لێکەوتەوە کەهەستا پێدەکەنی ووتم بۆچی پێدەکەنی؟ ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی :کەسانێك لەئومەتم پیشاندرا کەغەزایان دەکرد لەڕێگای خوا وەکو لەیەکەمدا فەرمووی:دەڵێ وتم:
ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) دووعام بۆبکە خوا بمکات بەیەکێك لەوان، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: تۆ لەوانەی پێشووی،ئیتر ئەوە بوو لەسەردەمی معاویەی کوڕی ئەبوسوفیان دا (ام الحرام)ی کچی (

[٢٦] ( أخرجه البخاري والمسلم )

ملحان ) سواری کەشتی بوو لەنێودەریادا ،کاتێ لەدەریا دابەزین لە وولاَخەکەی بەربۆوەو شەهید بوو.[٢٧]

## موعجیزەی ( ٢٨ ) هەواڵ دانی پێغەمبەر (ﷺ) سەبارەت بەپلانێکی عومەیری کوڕی وەهب و صەفوانی کوڕی ئومەییە:

عومەیری کوڕی وەهب و صەفوانی کوڕی ئوممەییە ڕۆژێکیان دوای جەنگی بەدر دانیشتبوون باسی لێقەومانی بەدریان کرد،عومەیر وتی:ئەگەر لەبەر ئەوە نەبوایە قەرزدارم و نیمە بیدەمەوە،خاوەنی ماڵ ومنداڵم ودەترسم دوای خۆم بفەوتێن.بەوە عومەیر ئەوەی دەربڕی کەنیازی کوشتنی پێغەمبەری خوا ی هەیە،صەفوان ئەوەی بەهەل زانی و پێی وت:قەرزەکەت لەسەر من،من بۆت دەدەمەوەو ماڵ منداڵەکەشت لەگەڵ ماڵ ومنداڵی خۆمدا چاودێریان دەکەم ودرێغی ناکەم لەو بارەوە عومەیر وتی: ئەوە ئاشکرا مەکە وتی: باشە پاشان عومەیری کوڕی وەهب بەڕێ کەوت و گەیشتە مەدینە ،لەکاتێکدا کە عومەری کوڕی خەتتاب وچەند موسڵمانێك باسی ڕۆژی بەدریان دەکرد،کەچۆن خوای گەورە بەسەرکەوتنی بەدر ڕێزی لێگرتن،سەیری کرد واعومەیری کوڕی وەهب لەدەرگای مزگەوت ووشترەکەی چۆك پێداداوە،شمشێرەکەی لەکێلان دەرهێناوە،عومەر وتی:ئەوە عومەیری کوڕی وەهبی دوژمنی خوایە بۆئەنجامدانی خراپەیەك هاتووە،پاشان چووە ژوورەوە بۆخزمەتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) وهەواڵەکەی پێ ڕاگەیاند،ئەویش فەرمووی:بیکە ژوورەوە بۆلام،عومەر ڕووی کردە عومەیرو دەستی دایە حەماڵە ی شمشێرەکەی کەلەملی دابوو بای داو بەو هاوەڵە ئەنصارانەی کەلەوێش بوون پێی ڕاگەیاندن کەبیبەنە ژورەوە لای پێغەمبەری خوا کەچاوی پێ کەوت

---

[٢٧] پوختەی صەحیحی بخاری لاپەرە ٩٣٨ .

واعومەر دەستی داوەتە حەماڵەی شمشێرەکەی ملی فەرمووی:عومەربەری بدەو تۆش عومەیر وەرە پێشەوە،کەنزیك بۆوە پێی فەرموو:﴿**فما جاء بك يا عمير؟**﴾ واتە:بۆچی هاتووی ئەی عومەیر ؟ وتی:بەدوای ئەو دیلەدا هاتووم کەوا لەلای ئێوەیە چاك بن لەگەڵیدا فەرمووی:﴿**أصدقني مالذي جئت به ؟**﴾ واتە:ڕاستم پێ بلێ بۆچی هاتوویت ؟ وتی: تەنها بۆئەوە هاتووم،فەرمووی:﴿**بل قعدت أنت وصفوان بن أمية في الحجر فذكر تما أصحاب القليب من قريش ،ثم قلت:لولا دين عليَّ وعيال عندي لخرجت حتى أقتل محمداً،فتحمل لك صفوان بن أمية بدينك وعيالك على أن تقتلني ،والله حائل بينك وبين ذلك**﴾ واتە: بەڵکو تۆو صەفوانی کوڕی ئومەییە لەحیجردا دانیشتن وباسی کوژراوەکانی قوڕەیشتان دەکرد، پاشان تۆ وتت:ئەگەر قەرزم لەسەر نەبوایە ماڵ و منداڵم بەسەردا نەکەوتبایە، دەچووم موحەممەدم دەکوشت، ئیتر صەفوانی کوڕی ئومەییە چووە ژێر قەرزەکەت وچاودێری ماڵ منداڵەکەت، بەومەرجەی تۆ بێیت ومن بکوژیت، خواش ماوەت نادات ئەوە بکەیت، عومەیروتی:شاهێدی دەدەم کەتۆ پێغەمبەری خوایت جاران ئەی پێغەمبەری خوا کەتۆ دەنگ و باسی ئاسمان و ئەوەحی یەی کەدەهاتە سەرت بۆمانت باس دەکرد، ئێمە باوەڕمان پێت نەکرد، ئەم باسەش جگە لەخۆم و صەفوان کەس ئامادەی نەبووەوبەخوا چاك دەزانم تەنها خوا لەمەی ئاگادار کردوویت، جا سوپاس بۆئەوخوایەی کەهیدایەتی دام بۆسەر ئایینی ئیسلام وبەوشێوازەش پاڵی پێوەنام، پاشان شایەتمانی هەقی هێنا پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی:﴿**فقهو أخاكم في دينه وعلمه القرأن ،وأطلقوا أسيره**﴾ واتە:براکەتان لەدینەکەی شارەزا بکەن وقورئانی

فێربکەن ودیلەکەشی بۆ بەربدەن پاشان عومەیر وتی: ئەی پێغەمبەری خوا جا من پێم خۆشە ماوەم بدەی بگەڕێمەوە بۆ مەککە بانگیان بکەم بۆلای خواو پێغەمبەرەکەی و ئایینی ئیسلام،بەڵکو خوا هیدایەتیان بدات ، پێغەمبەری خوا (ﷺ) ماوەی داو گەڕایەوە بۆمەککە،عومەیری کوڕی وەهب کەهاتەوە مەککە لەوێ دەستی بەبانگکردنی خەڵکەکەی بۆسەر ئاایینی ئیسلام کردو ،ئەوە بوو لەسەردەستی ئەودا خەڵکێکی زۆر ئیمانیان هێناو هاتنە ناو ئاایینی پاکی ئیسلام...

## موعجیزەی (٢٩) هەواڵ دانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەکوژرانی ئومەییەی کوڕی خەلەف :

عەبدوڵلای کوڕی مەسعود – خوا لێی ڕازی بێت – دەڵێ : سەعدی کوڕە مەعاز – خوا لێی ڕازی بێت – هاتە مەککە بۆئە نجام دانی عەمرە دابەزی بۆلای ئومەییەی کوڕی خەلەف وبووە میوانی ئەو،لەبەر ئەوەی ئومەییەش کەسەفەری دەکرد بەرەو شام دادەبەزی لەلای سەعدو دەبووە میوانی ئەو،ئومەییە بەسەعدی وت: چاوەڕوان بکە تانیوەڕۆو خەڵکەکە غافڵ دەبن، دەرچوون و سەعدی کوڕی موعاز دەستی کرد بەتەواف کردن،ئەبوجەهل هات و ووتی:ئەوە کێ یە لەکەعبە تەواف دەکات،سەعد وتی: منم سەعدی کوڕی موعاز ، ئەبوجەهل وتی:تەواف دەکەی لەکەعبە بەهێمنی و ئاسایش لەکاتێکدا کە موحەممەدو هاوەڵەکانی لای ئێوە جێگایان بۆتەوەو ئێوە بوونە هۆی پەنادانی سەعد ووتی: بەڵێ وایە،دەنگەدەنگ و ناخۆشی لەنێوانیاندا پەیدا بوو ،سەعد دەنگی بەرزکردەوە بەسەر ئەبو جەهلدا و لێی تووڕەبوو،ئومەییە بەسەعدی وت: دەنگت بەرز مەکەوە بەسەر ئەبولحەکەمدا، چونکە ئەو گەورەی ئەو وادی یەیە،سەعد بەئەبو جەهلی وت:سوێند بەخوا ئەگەر تۆ من قەدەغە بکەی

لەتەواف کردنی بەیت،ڕێگای بازرگانیەکەت لێدەگرم کەئەنجامی دەدەی بەرەو شام،دیسان ئومەییە بە سەعدی وت: دەنگت بەرز مەکەوە،سەعد توڕەبوو ووتی:وازمان لێبێنە گوێم لەپێغەمبەر (ﷺ) بوو دەیفەرموو:کەتۆ دەکوژرێی،ئومەییە ووتی:ئەو وای وت،سەعد وتی:بەڵێ،ئومەییە وتی:سوێند بەخوا دەزانم ئەگەر موحەممەد ئەو قسەیەی کردبێت ڕاست دەکات،گەڕایەوە بۆلای خێزانەکەیی و ووتی: ئایا دەزانی کە برا یەثریبی یەکە چی دەڵێ ؟ خێزانەکەی وتی:چی دەڵێ؟ وتی: دەڵێ موحەممەد ووتوویەتی:کەتۆ دەکوژرێی،خێزانەکەی ووتی: سوێند بەخوا موحەممەد ڕاستی ووتوە موحەممەد قسەی ناڕاست ناکات،کاتێك کەجەنگی بەدر ڕوویدا و خەڵکەکە دەرچوون لەمەککە بەرەو مەیدانی جەنگ ئومەییە کەویستی دەرچێ خێزانەکەی وتی:ئایا لەبیرت ماوە کەبرا یەثربییەکەت چی پێ وتی ؟ ئومەییە وویستی کەدەرنەچێ ،بەلام ئەبو جەهلی شەیتان وفێڵباز پێی ووت:تۆ ئەی ئومەییە یەکێکی لەئەشراف وپیاوماقولانی ئەو دۆڵە،وەرە لەگەڵمان ڕۆژێك یان دوو ڕۆژ لەگەڵی چوو خوای گەورە بەکوشتن کۆتایی بەژیانی هێناو لەجەنگی بەدردا بەکافری کوژرا.....[٢٨]

## موعجیزەی ( ٣٠ ) بەشوکو ڕۆژێك بێت ئەو پیاوە هەڵوێستێکی وای ببێت کەدڵی تۆی پێ شاد بێت:

لەڕۆژی غەزای بەدردا کەسوهەیلی کوڕی عەمر دیل کراو هێشتا موسڵمان نەبووبوو،عومەری کوڕی خەتتاب (خوا لێی ڕازی بێت ) وتی:ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەوە پیاوێکی قسەزان و زۆر بلی یە،ڕووخسەتم بدە باهەردوو کەڵبەی خوارەوەی هەڵبکێشم،تاکو لەمرۆ بەدواوە نەتوانێ قسەت پێ بلێت، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ﴿**وعسى أن يقوم مقاماً**

---

[٢٨] أخرجه البخاري ٣٦٣٢

**یسرك یا عمر﴾** (٢٩) واتە: ئەی عومەر بەشکو ڕۆژێك بێت هەر ئەم پیاوە هەڵوێستێکی وای بێت کەدڵی تۆی پێ شاد ببێت، ئەوە بوو فەرموودەکەی پێغەمبەر (ﷺ) هاتەدی ،چونکە ئەوڕۆژی ڕزگارکردنی مەککەدا موسڵمان بوو، سوهەیل هاوەڵێکی پایەداری بەخزمەتی لێ دەرچوو، لەڕۆژی فەتحی مەککەدا ئەوەبوو وەڵامی پێغەمبەری خوای (ﷺ) دەدایەوە، کاتێك کەپرسیاری دەکرد لە قوڕەیش دەی فەرموو: ﴿**ماذا تقولون؟**﴾ واتە: چی دەڵێن؟ سوهەیلیش دەی ووت: چاك دەڵێن و چاکیش زەن دەبەین، تۆ برایەکی بەڕێزو کوڕی برایەکی بەڕێزمانی وهەموو دەسەڵاتێکیشت هەیە، ئەویش فەرمووی :

أقول كما قال أخي يوسف: لا تثرين عليكم اليوم .ئەوەبوو فەرموودەکەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) هاتەدی، چونکەکاتێك کارەساتی گەورەو دڵتەزێنی کۆچی دوایی پێغەمبەر (ﷺ) ڕووی دا، صەبرو ئارام لەلای موسڵمانان نەما، ئەبوبەکری صدیق( خوا لێی ڕازی بێ) لەشاری مەدینە موسڵمانانی کۆکردەوەو ووتارێکی بۆدان بەڕەوانی وجوانی تیایدا سەرەخۆشی لێکردن وهەولی دا دڵی هاوەڵانی. پێغەمبەر (ﷺ) بهێنێتەوە جێی خۆی و ئارامی بەدڵانیان بدات، لەهەمان کاتدا سوهەیلی کوڕی عەمر لەشاری مەککەدا هەمان ڕۆڵی ئەبوبەکری بینی و ووتارێکی هاوچەشنی ووتارەکەی ئەوی بۆ خوێندنەوە، تەنانەت تاڕادەیەکیش ووشەکانی هەردوو ووتارەکە یەك مەبەست و واتایان ڕادەگەیاند، بەوەش ئەو موعجیزە گەورەیەی پێغەمبەر (ﷺ) هاتەدی کەلەبارەی سوهەیلەوە فەرموو بووی ،هەزاران درووود بۆگیانی پاکی ئەو پێغەمبەرە پایەبەرزەی ئیسلام .

---

(٢٩) رواه البيهقي وشيخه الحاكم عن الحسن بن محمد مرسلاً

## موعجیزەی (٣١) هەواڵ دانی پێغەمبەر (ﷺ)بەعەبباس سەبارەت بەو پارەیەی کەلەلای (أم الفضل) دای نابوو بەنهێنی:

دوا ئەوەی کە عەبباسی مامی پێغەمبەر (ﷺ) ئینکاری ئەوەی کرد هیچ پارەو پوڵێك شك بیات، پێغەمبەر (ﷺ) هەواڵی ئەو پارەیەی پێدا کەمامی بەنهێنی لای (أم الفضل )ی خێزانی دای نابوو،[٣٠] ئەوەبوو عەبباسی مامی کەهێشتا موسڵمان نەبوو بوو لەغەزای بەدردا دیل کراو پێغەمبەر (ﷺ) داوای لێکرد خۆی بە پارە لەدیلی ڕزگار بکات،ئەویش وتی: پارە شك نابەم، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی:ئەی ماڵ و سامانەی لای دایکی (أم الفضل ) داتنا، چی لێ هات ؟ عەباس ووتی جگەلەمن و ئەو کەسی تر بەو پارەیەی نەزانیوە ئەوەش بوو بەهۆی ئەوەی عەبباس موسڵمان ببێت...

## موعجیزەی (٣٢)سەرکردەکانی قورەیش بەبینینی موعجیزەیەکی گەورە لە پێغەمبەر (ﷺ)موسڵمان دەبن:

بەڕیوایەتێکی صەحیح باسکراوە کەلەو کاتەدا پێغەمبەر (ﷺ) مەککەی ئازاد کرد لە بت و بتپەرستان،فەرمانی بەبیلال دا(خوا لێی ڕازی بێت ) بچێتە سەربانی کەعبەو بانگ بدات لەوکاتەشدا ئەبووسوفیانی کوڕی حەرب و عەتتابی کوڕی ئوسەیدو حاریسی کوڕی هیشام ،کەلە سەرکردەو پیاوە دەست ڕۆیشتووەکانی قورەیش بوون لەنزیکی کەعبەو دەوروبەری دانیشتبوون، عەتتاب ووتی: خوا بەزەیی بەئوسەید واتە: باوکی داهاتەوە ،کەئەو ڕۆژەی

---

[٣٠] ( رواه أحمد والحاكم وصححه ،والبيهقي بسند صحيح )

ئەدی حاریسیش ووتی:موحەممەد کەسی ئەدۆزیەوە جگە لەو قەلە ڕەشە ؟ئەبوو سوفیانیش ووتی:من هیچ ناڵیم،چونکە ئەگەر هەرچی یەك بڵێم ئەم بەردە ووردانە بۆ موحەممەدی دەگێڕنەوە کتوپڕ پێغەمبەر (ﷺ) بەرەو ڕوویان هات و فەرمووی: دەزانم چیتان ووت:ئاواو ئاواتان ووت:چیان ووتبوو هەمووی بۆ گێڕانەوە حاریس و عەتتاب کەئەمەیان بیست یەکسەر ووتیان:شایەتی دەدەین کەتۆ پێغەمبەری خوایت چونکە هیچ کەسێکی ترمان لەگەڵدا نەبووە تاکو بلێین ئەو بۆی گێڕاویتەوە... [٣١]

خوێنەری بەڕێز:سەرنج بدە ئەو سەرکردانەی قوڕەیش کەچەند سەرسەخت بوون بەرامبەر ئیسلام تەنها بەبینینی ئەو موعجیزەیە لەو سەرسەختی و دژایەتی یەی ئیسلام وازیان هێناو موسڵمان بوون و ڕێگای ڕاستیان دۆزیەوە،هیچ گومان و دوودڵی یەکیان نەما بەڕاستی موعجیزە بەڵگەیەکی ئێجگار گەورەو شتێکی هەرە سەرەکی یە بۆ ڕێنمایی مرۆڤ بەرەو ڕاستە ڕێگای ژیان و مایەی بەخشینی ئارامی ودڵنیایی یە بەدڵ و دەروون...لەبەرهەمە جوانەکانی موعجیزەکان ئەوەیە:

**یەکەم**:زیادبوونی بڕوای بڕواداران.

**دووەم**:سەرخستنی پێغەمبەر (ﷺ) و بەرگری لێکردنی.

**سێ یەم**:بۆئەوەی کەهەموو خەڵك بزانێ کەموحەممەد (ﷺ) پێغەمبەری خوایە بەهەق و ڕاستی.

**چوارەم**:بۆبانگ کردنی خەڵکی ناموسڵمان بۆ بڕوا هێنان بەو ڕاستی یەی کە پێغەمبەر (ﷺ) بانگەوازی بۆدەکات بۆوەلامدانەوەی بانگەوازی خوای گەورە کەدەفەرمووێ:﴿لِّتُؤْمِنُوا۟ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَتُعَزِّرُوهُ وَتُوَقِّرُوهُ وَتُسَبِّحُوهُ بُكْرَةً وَأَصِيلًا﴾**الفتح** ( ٨-٩ )

---

(٣١) (زاد المعاد المحقق ٣/ ٤٠٩ – ٤١٠ ابن هشام ( ٤١٣/٢ )

واتە :بۆئەوەی باوەڕبەخواو پێغەمبەرەکەی بێنن وەپشتیوانی لێ بکەن ورێزی لێبگرن،وەتەسبیحاتی خوا بکەن لە بەیانیان و ئێواراندا وەهەروەها بۆ وەڵامدانەی ووتەی خوای گەورە کەدەفەرمووێ:﴿ قُلْ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنِّى رَسُولُ ٱللَّهِ إِلَيْكُمْ جَمِيعًا ٱلَّذِى لَهُۥ مُلْكُ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۖ لَآ إِلَـٰهَ إِلَّا هُوَ يُحْىِۦ وَيُمِيتُ ۖ فَـَٔامِنُوا۟ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِ ٱلنَّبِىِّ ٱلْأُمِّىِّ ٱلَّذِى يُؤْمِنُ بِٱللَّهِ وَكَلِمَـٰتِهِۦ وَٱتَّبِعُوهُ لَعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ﴾الاعراف (١٥٨)،

واتە :ئەی خەڵکینە بەڕاستی من پێغەمبەری خوام بۆ ئێوە هەمووتان ئەو خوایەی کەتەنها بۆ ئەوە،موڵکایەتی هەموو ئاسمانەکان وزەوی هیچ پەرستراوێکی ڕاست نی یە جگە لەئەو دەژێنێت و دەمرێنێت کەواتە بڕوا بەخوا و پێغەمبەرەکەی بهێنن کەنێردراوێکی نەخوێندەوارە ئەویش باوەڕی بەخواو بە ووتەکانی هەیە ئێوەش شوێنی بکەون و پەیڕەوی بکەن تابکەونە سەر ڕێگای ڕاست .

## موعجیزەی (٣٣ ) هەواڵ دانی پێغەمبەر (ﷺ) لەبارەی کیسرا کە کیسرای تری بەدوادا نایەت:

پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی :﴿إذا هلك كيسرى فلا كسرى بعده﴾. [٣٢]

واتە : کەئەم کیسرایە لەناوچوو،ئیتر کیسرای تری بەدوادانایەت،هەروەها پێغەمبەر (ﷺ) بەنێردراوەکەی کیسڕای فەرموو:خوا شێرۆیەی کوڕی کیسرای بەسەرکیسرادا زاڵکردو لەفلان کاتدا کوشتی پاشا کەئەو نێردراوە لەکاتی کوشتنی کیسرای کوڵیەوە ،بۆیدەرکەوت لەو کاتەدا کوژراوە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویوی ئیتر بەهۆی ئەو موعجیزەیەوە موسڵمان بوو...

---

(٣٢) ( صحيح رواه البخاري ومسلم والترمذي )

## موعجیزەی (٣٤) هەواڵ دانی پێغەمبەر (ﷺ) لەبارەی عەمماری کوڕی یاسر کەدەستەیەکی یاخی بوو شەهیدی دەکەن:

یەکێکی تر لەو شتانەی کە پێغەمبەر (ﷺ) پێش ڕوودانی هەواڵی لەبارەوە داوە ئەوەیە کەفەرموویەتی: ﴿**إن عماراً تقتله الفئة الباغية**﴾.[٣٣]

واتە: عەممار کۆمەڵی یاخی بووان دەیکوژن، ئەوەبوو پاشان لەجەنگی ﴿صفين﴾ دا کوژراو عەلی کوڕی ئەبو تالیب کەخەلیفەی موسلمانان بوو فەرموودەکەی پێغەمبەرو کوشتنی عەمماری لەو جەنگەدا کرد بەبەڵگە لەسەر ئەوەی کەشوێنکەوتووانی معاويه پێڕەیاخی بووە کەن، معاویەش حەدیثە کەی تەئویل کردو عەمری کوڕی عاصیش ووتی: یاخی بووەکان تەنها ئەوانەن کەعەمماریان کوشتووەو هەموان ناگرێتەوە.

## موعجیزەی (٣٥) لەوانەیە بمێنیتەوە تاکو چەند قەومێك سوودت لێ وەردەگرن وچەند قەومێکی تریش لەتۆوە تووشی زیان دەبن:

بەڕیوایەتێکی صەحیح چەسپاوە دەڵێت: لەکاتێکدا سەعدی کوڕی ئەبوو وەققاص لەنەخۆشی یەکی سەخت دابووە، پێغەمبەر (ﷺ) پێی فەرمووە: ﴿**لعلك تخلف حتى ينتفع بك أقوام ويستضربك أخرون**﴾.[٣٤] واتە: لەوانەیە بمێنیتەوە تاکو چەند قەومێك سوودت لێ وەردەگرن و چەند قەومێکی تریش لەتۆوە تووشی زیان دەبن، ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەر (ﷺ) ڕای دەگەیەنێت کەسەعد دەبێت بە پێشەوایەکی گەورەو خوای

---

[٣٣] (صحيح ، رواه مسلم وأحمد ورواه البخاري بغير الألفاظ السابقة)

[٣٤] (صحيح رواه البخاري ومسلم)

بەرزو بێ وێنە لەسەردەستی ئەودا چەندین وولات فەتح دەكات و چەندین تیرەو دەستەو كۆمەڵیش بەهۆی ئەوەوە دێنە ڕیزی ئاینی ئیسلامەوەو بەوەش سوودێكی زۆریان دەست دەكەوێت.هەروەها چەند تاقمێكی تریش بەهۆی سەعدەوە زیانیان پێ دەگات و دەوڵەتەكەیان تیادەچێت،لەڕاستیدا هەربەو جۆرە ڕووی دا كە پێغەمبەر (ﷺ) هەواڵی دابوو،ئەوەبوو سەعد بوو بەپێشەوای سوپای ئیسلام و دەوڵەتی فارسەكانی لەناوبردو بوویەهۆی ئەوەی كەچەندین تیرەو نەتەوەی زۆر موسڵمان بن،بەڕاستی ئەو موعجیزانە موعجیزەی ئەوەندە گەورەن كەبەقەد تۆزقاڵێك گومان ودوودڵی ناهێڵن لەناو دڵەكاندا و وەك ڕۆژی ڕووناك پێغەمبەرایەتی پێغەمبەری ئیسلام دەسەلمێنن،هەزاران درووود بۆ گیانی پاكی ئەو پێغەمبەرە پایەدارە (ﷺ).

## موعجیزەی ( ٣٦ ) هەواڵدانی پێغەمبەر (ﷺ)لەبارەی ئەو قسە نهێنیەی كەئەبو سوفیان بەهاوسەرەكەی ووت:

ئەو ڕۆژەی كوموسڵمانەكان فەتحی شاری مەككەیان كرد ،كەیەكەم شەویان بەسەردا هات تا ڕۆژ بوویەوە هەر خەریكی تەهلیل و تەكبیرو تەوافی كەعبە بوون،ئەو شەوە ئەبوسوفیان بە هیندی هاوسەری ووت:ئایا ئەمە لەخواوە دەزانیت ؟ئەویش ووتی:بەڵێ ،ئەمە لەخواوەیە،كەئەبو سوفیان ڕۆژی لێ بوویەوە و چووە خزمەتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی:﴿قلت لهند أترى هذا من الله﴾ واتە: تۆبەهیندت وت:ئایا ئەمە لەخواوە دەزانیت ؟ ئەویش ووتی:بەڵێ ئەمە لەخواوەیە ،ئەبوسوفیان وتی:شاهێدی دەدەم كەتۆ بەندەو پێغەمبەری خوایت،بەو كەسەی كەسوێندی پێ دەخورێ ئەو ووتەیەی من جگە لەهیند تاقە كەسێكی تر نەی بیستووە [٣٥]

---

[٣٥] ژیانی نازیزمان (صلى الله عليه وسلم ) بەرگی دووەم لاپەرە ٥٥٦

## موعجیزەی ( ٣٧ ) هەواڵدانی پێغەمبەر (ﷺ) بەمانەوەی عەبدوڵلای کوڕی سەلام لەسەر ئیسلام تامردن:

قەیسی کوڕی عەبباد دەڵێ:لەمزگەوتی مەدینە دانیشتبووم ، پیاوێك هاتە ژوورەوە نیشانەی خشوع لەسەر دەموو چاوی بوو،خەڵکی وتیان: ئەم پیاوە لەئەهلی بەهەشتە ، پیاوەکە دوو ڕکات نوێژی سوننەتی کرد بەخێرایی و چووە دەرەوە،منیش شوێنی کەوتم پێم وت:تۆ کەهاتیتە ناو مزگەوتەوە وتیان:ئەم پیاوە لەئەهلی بەهەشتە ئەویش وتی:بەخوا نابێ کەسێ شتێك بلێ کەنەیزانی،ئێستا پێت دەڵێم ئەوە لەچی یەوە هاتووە؟من خەوێکم دی لەسەردەمی پێغەمبەری خوادا (ﷺ) بۆم گێڕایەوە،لەخەومدا لەباخێکی گەورە خۆش دابووم،لەناوەڕاستیدا عەموودێکی ئاسن هەبوو،کەلەخوارەوەی زەویدا چەقا بوو،سەرەوەشی لەئاسماندا بوو ،لەسەرەوەی قوڵفێکی پێوەبوو پێم ووترا پیایدا سەرکەوە،وتم: ناتوانم،خزمەتکارێك هات و لەپشتەوە جلەکانی بۆکوکردمەوەو یارمەتی دام سەرکەوتم ودەستم گرت بەقوڵفەکەوە،دەستم بەقوڵفەکەوە بوو خەبەرم بووەوە،کەئەمەم بۆ پێغەمبەر (ﷺ) گێڕایەوە فەرمووی:ئەو باخە ئیسلامەو ئەو عەموودەش عەموودی ئیسلامە ئەو قوڵفە(عروە) یە ( عروة الوثقى ) یە تۆ لەسەر ئیسلام دەبیت تادەمریت ئەو پیاوە عەبدووللای کوڕی سەلام بوو. [٣٦] ئەم هەواڵەش هاتەدی عەبدوللای کوڕی سەلام سی و سێ ساڵ دوای پێغەمبەر (ﷺ) ژیاو بەموسڵمانی لە مەدینە وەفاتی کرد لەساڵی چل و سێ ی کۆچیدا. بەڕاستی ئەو هەوالانە موعجیزەی ئەوەندە گەورەن کەبەقەدتۆزقاڵێك گومان ودوودڵی ناهێڵن لەناو دڵەکاندا وەوەك ڕۆژی ڕووناك پێغەمبەرایەتی پێغەمبەری ئیسلام دەسەلمێنن هەزاران درووود بۆگیانی پاکی ئەو پێغەمبەرە پایە بەرزەی ئیسلام (ﷺ) .

---

[٣٦] ( صحیح رواه البخاری ومسلم )

# موعجیزەی (٣٨) هەواڵدانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەماوەی خەلافەتی ڕاشدین:

پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: ﴿خلافة النبوة ثلاثون سنة ثم يؤتي الله الملك أو ملكه من يشاء﴾[٣٧] واتە: خەلافەتی نەبوەت سی ساڵەو پاشان خوای گەورە موڵكەكەی دەدات بەهەركەسێك بیەوێت، ئەوەش هەروەك هەواڵەكانی تر بەتەواوی هاتەدی، خەلافەتی ئەبوبەكر (خوا لێی ڕازی بێ) لەساڵی یازدەی كۆچی یەوە دەستی پێكرد تا ساڵی چلی كۆچی كەحەسەنی كوڕی عەلی (خوا لێی ڕازی بێ) وازی هێنا لەخەلافەت بۆ معاویه ساڵەكانی حوكمرانی خەلیفەكانی ڕاشیدین بەم جۆرە بوو:

**یەكەم**: ئەبوبەكر (خوا لێی ڕازی بێ) دووساڵو سێ مانگ و دە ڕۆژ.

**دووەم**: عومەر (خوا لێی ڕازی بێ) دەساڵ و شەش مانگ و هەشت ڕۆژ.

**سێ یەم**: عوسمان (خوا لێی ڕازی بێ) یازدەساڵ و یازدە مانگ و نۆ ڕۆژ.

**چوارەم**: عەلی (خوا لێی ڕازی بێ) چوار ساڵ و نۆ مانگ و حەوت ڕۆژ.

حەسەن (خوا لێی ڕازی بێ) نزیكەی شەشە مانگ و دەكاتە (٢٧) ساڵ و (٣٥) مانگ و (٣٤) ڕۆژ كەبەوەش دەكاتە سی ساڵ وچوار پێنج ڕۆژ كەئەوەش ڕەنگە تەداخلی ڕۆژەكان بێت، بەراستی موعجیزەیەكی گەورەیە هەزاران دروود بۆ گیانی پاكی پێغەمبەری ئیسلام (ﷺ).

---

[٣٧] (حديث حسن رواه أبوداود)

## موعجیزەی (٣٩) هەواڵ دانی پێغەمبەر (ﷺ) لەبارەی نامەكەی (حاطه بی كورِی أبو بلتعه ) وە:

حاتەبی كوڕی ئەبو بەلتەعە نامەیەكی بەئافرەتێكدا نارد بۆكافرەكانی مەككە هەواڵی ئەوەی تیادابوو كە پێغەمبەر (ﷺ) بەنیازە بەرەو مەككە بكەوێتە ڕێ وئازادی بكات،بەڵام خوای گەورە بە وەحی پێغەمبەرەكەی خۆی لەو پلانە ئاگادار كردەوە،عەلی كوڕی ئەبو تالیب ( خوا لیی رازی بی ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) من و زووبەیرو میقدادی ناردو فەرمووی:بڕۆن تادەگەنە باخچەی خاخ ،ئافرەتێكی لێ یە لەكەژاوەیەكدا،نامەیەكی پێ یە لێی بستێنن،بەسواری ئەسپەكانمان بەپەلە ڕۆیشتین تاگەیشتینە باخچەكە،ئافرەتەكە لەكەژاوەكەدا لەوێ بوو،ووتمان نامەكە دە ربێنە،وتی:هیچ نامەیەكم پێ نی یە، پێمان وت:نامەكە دەردێنی یان جلەكانت دەپشكنین ،

لەناو پۆشینەكەیدا دەری هێنا هێنامانەوە بۆ پێغەمبەری خوا (ﷺ) تیایدا نووسرابوو لەحاتەبی كوری ئەبی بەلتەحەوە بۆكەسانێك لەموشریكانی مەككە هەواڵیان لەبارەی هەندی كارو باری پێغەمبەر (ﷺ) دەداتێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی ئەمە چی یە حاتەب ؟وتی پەلەم لێ مەكە ئەی پێغەمبەری خوا ،من پیاوێكم لەناو قورەیشدا بووم و لەوانیش نیم،هەركەست لەگەڵدایە لە هاوەڵان لەمەككە خزمایەتی یەكی لەگەڵیان هەیە كەس وكاری سامانی بۆ بپارێزێت،من كەخزمایەتیم نەبوو لەناویاندا ،ویستم چاكەیەكیان لەگەڵدا بكەم تاكو كەسەكانم بپارێزن،ئەوەم لەبێباوەری یان پەشیمان بوونەوە لەئایینەكەم نەكردووە، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی:ئەو ڕاستدەكات لەگەڵتان ،عومەر خوا لێی رازی بێ وتی: لێمگەری ئەی پێغەمبەری خوا بابدەم لەگەردنی،فەرمووی:ئاخر ئەو هاوبەشی بەدری كردووە ،تۆ چووزانی؟ بەڵكو خوای گەورەو بالآدەست تەماشای ئەهلی بەدری كردبێت و فەرموویێتی:چی دەكەن بیكەن،من چاو پۆشیم لێكردوون،راوییەكە دەڵێت:ئایەتی:﴿ یا أَيُّهَا

الَّذِينَ آمَنُوا لا تَتَّخذوا عَدُوِّي وَعَدُوَّكُمْ أَوْلِيَاءَ﴾ واته :ئەی باوەرداران دوژمنی من و خۆتان بەدۆست مەگرن دەربارەی ئەو هاتووەته خوارەوە.[٣٨]

## موعجیزەی (٤٠) هەواڵدانی پێغەمبەر(ﷺ) بەوەی كە ( ثابتی كوری قیس )شەهید دەبێ:

**كاتێك ئەونایەتە هاتە خوارەوە لەسوورەتی الحجرات كەدەفەرمووێ:﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَرۡفَعُوٓاْ أَصۡوَٰتَكُمۡ فَوۡقَ صَوۡتِ ٱلنَّبِيِّ وَلَا تَجۡهَرُواْ لَهُۥ بِٱلۡقَوۡلِ كَجَهۡرِ بَعۡضِكُمۡ لِبَعۡضٍ أَن تَحۡبَطَ أَعۡمَٰلُكُمۡ وَأَنتُمۡ لَا تَشۡعُرُونَ﴾ الحجرات (٢) واته: ئەی ئەوانەی باوەرتان هێناوە دەنگتان بەسەر دەنگی پێغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم ) بەرز مەكەنەوەلەكاتی گفتوگۆدا ،هەروەك چۆن بەدەنگی بەرز قسە لەگەڵ یەكدا دەكەن،نەوەكو كردەوەتان پووچ بێتەوەو هەستیشی پێنەكەن،كە پێغەمبەر (ﷺ) ئەم ئایەتەی بۆهاوەلان خوێندەوە ماوەیەك ثابیتی كوری قەیسی نەبینی وئەحواڵی پرسی هاوەلێك ووتی:من هەواڵیت بۆدەپرسم ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) كاتێ پرسیاری كرد بۆی دەركەوت لەماڵ ئایەتە دەرەوە ،كەچووبۆلایی و ئەحواڵی پرسی ،لەوەلآمدا ووتی:من حاڵم باشم نی یەو دەنگم بەرزكردۆتەوە لەسەر پێغەمبەرداو كاروكردەوەم پووچ بۆتەوەو لەئەهلی دۆزەخم،كاتێ ئەوقسەیەیان گەیاندەوە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی:برۆن مژدەی بدەنێ ،كەئەهلی دۆزەخ نی یە بەڵكو ئەهلی بەهەشتە.[٣٩]**

---

[٣٨] بوختەی صەحیحی بوخاری لاپە رە (٩٠٠)

[٣٩] أخرجه البخاری كتاب التفسیر )

هەروەها بەیهەقی و حاکمیش بەسەنەدی صەحیح ڕیوایەتیان کردووە کە پێغەمبەر (ﷺ) بەثابیتی فەرموو: ﴿**يا ثابت الا ترضى أن تعيش حميداً وتقتل شهيداً وتدخل الجنة**﴾ واتە: ئەی ثابت بۆ حەزناکەی کەبەسەربەرزی و سوپاس کراوی بژیت وبەشەهیدی سەر بنێیتەوەو بچیتە بەهەشتەوە؟ ثابت ووتی: بەڵێ حەزدەکەم، جەنگی یەمامە زۆر نارەحەت و قورس بوو موسڵمانان لەسەرەتاوە حالیان باش نەبوو، ثابت کەئەوەی دی وتی: ئێمە لەسەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ) ئاوا نەدەجەنگاین، ئێوە خراپ هاوەڵەکانتان ڕاهێناوە، خوایە من بەریم لەوەی کەئەو بڕوادارانە دەیکەن، ئینجا زۆر قارەمانانە جەنگا هەتا شەهید بوو....

## موعجیزەی (٤١) پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەنگ و باسی غەزای موئتە بۆ یەعلای کوڕی ئومییە باس دەکات:

پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەلایەن خوای پەروەردگارەوە ئاگاداری ئەو جەنگە ناهەموارەی موئتە کرا، خوای گەورە ڕەزامەندی نواند تا پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەمەدینەوە سەیری جەنگی موئتە بکات و ئاگارداری شەهیدبوونی هەرسێ فەرماندەکەو ئالآهەڵگرتنی خالیدبێ ئەوەش یەکێکە لەموعجیزە گەورە بەناوبانگەکانی پێغەمبەری ئیسلام (ﷺ)، بوخاری لەئەنەسی کوڕی مالیکەوە ڕیوایەتی ئەوەی کردووە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەرلەوەی هەواڵی بۆ بێت باسی شەهیدبوونی زەیدو جەعفەرو کوڕی ڕەواحەی بۆ خەڵکەکە کردووە کەفەرمووی: ﴿**أخذ الراية زيد فأصيب، ثم أخذها جعفر فأصيب، ثم أخذها إبن رواحة فأصيب - وعيناه تذرفان حتى أخذ الراية سيف من سيوف الله حتى فتح الله عليهم**﴾ لەڕیوایەتەکەی بەیهەقی دا کەناوی هەرسێ فەرماندەکە

دەبات کەشەهید بوون، لەخوای گەورە داوای لێ خۆش بوونیان بۆ دەکەت، دەربارەی خالیدیش دەفەرموێت: ﴿اللهم إنه سيف من سيوفك أنت تنصره﴾ ئیتر لەوکاتەوە خالید ناونرا ﴿سيف الله﴾ واقیدیش دەڵێت: موحەممەدی کوڕی صاڵح لەعاصیمی کوری عومەری کوڕی قەتادەومو عەبدولجەباری کوری عومارەی کوڕی عەبدوڵلای کوڕی ئەبوبەکر بۆیان گێڕامەوە و وتیان: کەخەڵکەکە لەموئتە بەیەك گەیشتن پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) لەسەر مینبەر دانیشت ونێوان خۆی و شامی بۆ دەرخرا وسەیری خەڵکەکەی دەرکرد پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) فەرمووی: ﴿اخذ الراية زيد بن حارثة ،فجاءه الشيطان فحبب اليه الحياة وكره الموت،وحبب اليه الدنيا فقال:الآن حين استحكم الأيمان فى قلوب المؤمنين تحبب إلى الدنيا﴾ واتە: فەرمووی: زەید ئاڵاکەی هەڵگرت شەیتان هاتە لای وژیانی بەلایەوە خۆشەویست کردو مردنی بەلاوە ناشرین کردوو دنیای بەلاوە خۆشەویست کرد ،ئەویش وتی: ئێستا دێیتە لام ودنیام بەلاوە خۆشەویست دەکەی، کاتێك کەئیمان لەدڵی ئیمانداران داریشکی داکوتاوە بەرەو پێشەوە ڕۆیی و پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) نوێژی لەسەرکردو فەرمووی: ﴿إستغفروا له فقد دخل الجنة وهو يسعى،ثم أخذ الراية جعفر بن أبي طالب فجاءه الشيطان فعناه الحياة وكره إليه الموت ومناه الدنيا فقال:الأن حين استحكم الإيمان في قلوب المؤمنين تمنيني الدنيا﴾ واتە: فەرمووی داوای لێخۆش بوون بۆ زەیدبکەن ئەو بەهەڵمەتەوە چووە بەهەشت، پاشان جەعفەری کوڕی ئەبو تالیب ئاڵاکەی هەڵگرت وشەیتان هاتە لای وژیان و دنیای بەلاوە خۆشەویست کردو مردنیشی لەلا ناشرین کرد، ئەویش ووتی: ئێستا دڵم بەدنیا خۆش دەکەیت، کاتێك کەئیمان لەدڵی ئیمانداران داریشکی داکوتاوە ،بەرەو پێشەوە ڕۆیی هەتا

شەهید بوو، پێغەمبەری خوا (ﷺ) نوێژی لەسەر کردو بۆشی پارایەوەو پاشان فەرمووی: ﴿إستغفروا لأخيكم فإنه شهيد دخل الجنة،فهو يطير في الجنة بجنا حين من ياقوت حيث يشاء من الجنة، ثم أخذ الراية بعده عبدالله بن رواحة فا ستشهد ودخل الجنة معترضاً﴾ واتە:فەرمووی:داوای لێخۆش بوون بۆ براکەتان بکەن ،ئەو شەهیدەو چۆتە بەهەشت،ئەو بەدووبالی لەیاقوت دروستکراوەوە بۆ هەر شوێنێکی بەهەشت بیەوێ دەفڕێت، پاشان دوای ئەو عەبدوللای کوری ڕەواحە ئالاکەی هەڵگرت وشەهیدبووو بە ئیعترازەوە چووە بەهەشتەوە.

ئەنصارەکان ئەوەیان بەلاوە گران بوو، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی:﴿**أصابة الجراح**﴾ واتە:لەچەندین لاوە زامدار بووبوو وترا:ئەی پێغەمبەری خوا ئیعتراضی چی بوو ؟ فەرمووی:﴿ **لما أصابته الجراح نكل فعاتب نفسه فشحح،فستشهد فدخل الجنة** ﴾فەرمووی:کاتێك کەزامدار بوو ساردبوویەوەو ئەویش لۆمەی دەروونی خۆی کردو غیرەتی بەبەردا هات وشەهیدبووو چووە بەهەشتەوە،ڕاوی دەڵێت:بەوە خەفەتی خزمەکانی ڕەویەوە،لەریوایەتەکەی ئیبن ئسحاقدا وەها هاتوە کە کاتێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) دێتە سەرباسی عەبدوللای کوڕی ڕەواحە ماوەیەك بێ دەنگ دەبێ،بەرادەیەك کەڕەنگی دەم وچاوی ئەنصارەکان دەگۆڕێ و وەهایان بەبیردا دێت کە عەبدوللا شتێکی خرا پی ئەنجامدابێ پاشان فەرمووی:﴿ثم أخذها عبدالله بن رواحة فقاتل بها حتى قتل شهيداً﴾واتە فەرمووی: پاشان عەبدوللا ئالاکەی هەڵگرت وپێیەوە خەریکی کوشتار بوو هەتا شەهید کرا، پاشان فەرمووی:

﴿**لقد رفعوا الى الجنة فما يرى الفائم،على سرر من زهب ،فرأيت في سرير عبدالله بن رواحة اِز ورارأ عن سريري**

صاحبه،فقلت:عمَّ هذا ؟ فقيل لي:مضيا وتردد،ثم مضى﴾
واتە :فەرمووی بەشێوەی کەسێك کە خەو ببینێ لەبەهەشتدا،بەسەر قەرەوێڵەی زێرەوە پیشانم دران،دەبینم قەرەوێڵەکەی عەبدوڵلا بەچاو هەردوو قەرەوێڵەکەی تردا خواربوونەوەیەکی تیادایە وتم: ئەمە بۆچی وەهایە؟پێمیان فەرموو:ئەوان هەردووکیان چوونە پێشەوە ،بەڵام عەبدوڵلا دوودڵیەکی کرد پاشان چووە پێشەوە،لەکتێبی ﴿إصابه﴾ی ئیبن حەجەریشدا هاتووە کەئیبن عەبباس خوا لێیان ڕازی بێت ووتوویەتی:لەکاتێکدا پێغەمبەری خوا (ﷺ) دانیشتبوو و ئەسمائی کچی عومەیس هاوسەری جەعفەر لەنزیکیدا دانیشتبوو ،فەرمووی:﴿يا اسماء هذا جعفر بن ابي طالب قد مرمع جبريل وميكائيل فردي عليه السلام ﴾واتە:فەرمووی ئەسما ئەوە جەعفەرە لەگەڵ جبریل و میکائیل تێ پەڕین،تۆش وەڵامی سەلامەکەی بدەرەوە هەروەها فەرمووی:﴿فعوضه الله من يديه جناحين يطير بها حيث يشاء﴾ واتە:خوای گەورە لەبری دوودەستەکەی دووباڵی پێ بەخشیوە بۆهەر کوێ بیەوێ پێی دەفڕێ،یەعلای کوری ئومەییەش بەهەواڵی جەنگی موئتەوە دێتە خزمەتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەویش پێی دەفەرمووێ :﴿إن شئت فأخبرني،وإن شئت أخبرك﴾ واتە: فەرمووی ئەگەر پێت خۆشە تۆ هەواڵم پێ بدەو وەئەگەر پێت خۆشە من هەواڵ بەتۆدەدەم،وتی:تۆ هەواڵم بدەرێ ئەی پێغەمبەری خوا ،دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەواڵی موسڵمانەکانی هەرهەموو بۆگێڕانەوەو وەصفیشی کرد بۆیان،یەعلای کوری ئومەییە وتی:بەوخوایەی بەدینی حەق ڕەوانەی کردووی پیتێك لەباسەکەی ئەوانت بەجێ نەهێشتووەو کاری موسڵمانانیش هەروایە کەباست کرد،ئەویش فەرمووی:﴿إن الله رفع لي الأرض حتى رأيت معركتهم﴾
واتە: فەرمووی:خوای گەورە زەوی ئەوەندە بەرزکردەوە بۆم هەتا شوێنی جەنگەکەیانم

بینی،الله اكبر لەو موعجیزە گەورەو بەناوبانگە بەڕاستی ئەوانە موعجیزەی ئەوەندە گەورەن كەبەقەدتۆزقاڵێك گومان و دوودڵی ناهێڵن لەناودڵەكاندا و وەك ڕۆژی ڕووناك پێغەمبەرایەتی پێغەمبەری ئیسلام دەسەلمێنن.بەراستی موعجیزە بەلگەیەكی ئێجگار گەورەو شتێكی هەرە سەرەكی یە بۆ ڕێنمایی مرۆڤ بەرەو ڕاستە ڕێگای ژیان و مایەی بەخشینی ئارامی و دڵنیایی یە بەدڵ و دەروون، سوپاس بۆخوای گەورەو پەروەردگار ودروود بۆ گیانی پاكی پێغەمبەری پایەداری ئیسلام (ﷺ)...

## موعجیزەی (٤٢) هەواڵدانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەعەدی كوڕی حاتەم لەبارەی سێ ڕووداوی گەورە:

عەدی كوری حاتەم دەڵێ:باوەڕناكەم لەناو عەرەبدا هیچ پیاوێك هەبووبێت ئەوەندەی من ڕقی لە پێغەمبەر(ﷺ) بووبێت،دەڵێ من پیاوماقوڵێكی ناو خێڵەكەی خۆم بووم و گاور بووم،ئەوەندەیان ڕێزلێ دەگرتم كردبوویانە سەرۆكی خۆیان و چواریەكی مەڕو ماڵاتی خۆیان دەدامێ ، عەدی دەڵێت:كەهەواڵی پێغەمبەری خوام (ﷺ) بیست و ڕقم لێی بوو،خزمەت گوزارێكی عەرەبیم هەبوو كەووشتری بۆم بەخێو دەكرد پێم وت:ماڵت كاول بێ لەناو ووشترەكانم كۆمەڵە ووشترێكی تیژڕەو و قەڵەوم بۆ جیابكەرەوە و لەنزیكمدا بیانبەستەرەوە ،جائەگەر بیستت سوپای موحەممەد ڕووی لەم ناوە كردووە ئەوا ئاگادارم بكە،ئەوەبوو نیوەڕۆیەكیان هاتە لام و وتی:ئەی عەدی هەركارێك نیازت بوو بی كەی ئەگەر سوارچاكانی موحەممەد دایان بەسەرتدا ئێستە بیكە،چونكە من چەند ئاڵایەكەم بینین و دەربارەیان پرسیارم كردو ووتیان:ئەمە سوپای موحەممەدە،دەڵێ وتم: دەی ووشترەكان بێنە پێشەوە ئەویش هێنانیە پێشەوە ئەوە بوو كەسو كارو ماڵ و منداڵم سواركردن، پاشان

وتم: خۆم دەگەیەنمە نەصارا هاو دینەکانم لەشام ،ڕێگەی جەوشەبەم گرتە بەرو لەشوێنی خۆمان کچێکی حاتەم بەجێ هێشت،سوپای ئیسلام هێرشی کردە سەر طه ی و خەڵکێکی زۆر بەدیل گیرا،بەتایبەت سەفانەی خوشکی عەدی،ئەویش هێنرایەوە مەدینەو پێغەمبەری خوا( ﷺ ) هەواڵی عەدی دەزانی کەبەرەو شام هەڵاتووەو خوشکەکەشی لەگەڵ ئافرەتە دیلەکاندا لەژوورێکی نزیك دەرگای مزگەوتدا بەند دەکرێن،کاتێك کە پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) تێپەڕی سەفانە کەئافرەتێکی ژیری سەلیقەدار بوو هەستاو ووتی:ئەی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) باوکم کۆچی دوایی کردوو خاوەنەکەشم دیار نی یە،چاکەم لەگەڵدا بکەو ئازادم بکە خوا چاکەت بۆ بکات،فەرمووی: ومن و ا فد ك ؟ واتە:خاوەنەکەت کێ یە؟ ووتی عەدی کوڕی حاتەم ،فەرمووی: ﴿**الفار من الله ورسوله**﴾؟ واتە ئەوەی کەلەبەر خواو پێغەمبەرەکەی هەڵاتووە؟ ئیتر بەجێی ئەهێڵێ،بۆ سبەینی ' بەهەمان شێوە لەبەردەمیا دەوەستێ وهەمان ووتووێژ ڕوودەداتەوەو بەجێی ئەهێڵێ،بۆ دوو سبەی سەفانە دەست لەتکا کردن دەشوا،بەلام پیاوێك لەدوای پێغەمبەرەوە ئاماژەی بۆدەکات هەتا قسە بکات،ئیتر هەڵدەستێت و دەڵێت: ئەی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) باوکم کۆچی دوایی کردوو خاوەنەکەشم دیار نی یە، چاکەم لەگەڵدا بکەو ئازادم بکە خوا چاکەت بۆ بکات،فەرمووی:﴿**قد فعلت ،فلا تعجلي بخروج حتى تجدي من قومك من يكون لك ثقة،حتى يبلغك إلى بلادك،ثم أذنيني**﴾ فەرمووی: باشە بەلام پەلە مەکە بۆدەرچوون هەتا خزمێکی متمانە پێکراوت دەست دەکەوێ وبتگەیەنێتە وولاتی خۆت،ئەوسا ئاگادارم بکە،سەفانە پرسیاری ئەو کەسە دەکات کە ئاماژەی بۆ دەکات،دەڵێن عەلی کوڕی ئەبو تالیب بووە ،دوای ماوەیەك کەس و کارو ناسراوانی پەیدا دەبن و پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم ) ئاگادار دەکات وکە پیاوی متمانە پێکراوی دەست کەوتوون، پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) پۆشتەی دەکات و وولاغی بۆ سواربوون دەداتێ وپارەی بۆ مەسرەف دەداتێ ولەگەڵ پیاوە ناسراوەکان

دێت هەتا ئەگاتە شام، لەکاتێکدا کەعەدی لەناو ماڵ ومنداڵی دانیشتبوو، سەیردەکات وا نافرەتێك لەناو کەژاوەیەکدا بەرەو لای ئەوان هات، دەڵێن کچەکەی حاتیمە، سەیردەکات دەبینێ ئەوە، کەدەگاتە بەرەوە دەست بەگلەیی و لۆمەی عەدی دەکات ودەڵێت: هەی ڕەحم بڕی ستەمکار ژن و ماڵ ومناڵەکەی خۆت ڕزگار کردو شەرەف و نامووسی باوکتت بەجێ هێشت، وتی: خوشکە گیان من کردم تۆ نەکەی، ماوەیەك لای ئەبێت، ئەوسا لێی ئەپرسێ: ئەو پیاوەت چۆن دێتە بەرچاو؟ دەڵێت: بەخوا من وای بەچاك دەزانم بەزووترین کات خۆت بگەیەنیتە لای، خۆ ئەگەر پێغەمبەر بێت ئەوا هەرکەس زووتر دوای بکەوێ فەزڵ و پایەی زیاتر دەست دەکەوێ ، ئەگەر پادشایش بێت پیاوی وەك تۆ هەرگیز بەلایەوە بێ ناز نابێت، دەڵێت: بەخوا ئەم بۆچوونە ڕاستە، عەدی بەرەو مەدینە دەکەوێتە ڕێ وخۆی ئەگەیەنێتە خزمەتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەکاتێکدا کەلە مزگەوت دادەبێ و سەلامی لێ ئەکات وئەویش دەپرسێ کەئەم پیاوە کێ یە؟ دەڵێت: عەدی کوڕی حاتیمم، بۆ زیادە ڕێزگرتن لەعەدی دەیباتەوە ماڵەوە، لەڕێگا پیرەژنێکی لاواز ڕێ بە پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەگرێت و ماوەیەکی زۆر ئەی وەستێنێ وباسی پێویستی خۆی دەکات بۆی، عەدی لەدڵی خۆیدا دەڵێت: بەخوا ئەمە پادشانی یە، پاشان پێکەوە چوونەوە بۆ ماڵەوە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەماڵەوە تەنها پشتییەکیان هەبوو کەلەچەرم دروستکرابوو بەڕیشاڵیش پڕکرابووەووە، دای نا بۆ عەدی تالەسەری دابنیشێ وفەرمووی: ﴿إجلس على هذه﴾ دەڵێت: بەڵکو تۆ لەسەری دابنیشە، فەرمووی: بەڵکو تۆ لەسەری دانیشە، ئیتر عەدی لەسەری دائەنیشێ و پێغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) خۆی لەسەر ئەرزەکە دائەنیشێ ودیسان عەدی بەخۆی دەڵێ: بەخوا ئەمە کاری پادشا نی یە، لەڕیوایەتێکدا عەدی دەڵێ: شایەتی دەدەم کەتۆ بەرزی ودەسەڵات و خراپکاری سەرزەویت ناوێت کەهاوەڵان بینیان پشتی یەکەی بەعەدی داو خۆی لەسەر زەویەکە دانیشت وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ئەوەی بەتۆوە دیمان تائێستا

بەکەسمانەوە نەدیوە،فەرمووی:﴿**هذا كريم قوم ،فإذا أتاكم كريم قوم فاكرموه**﴾واتە:عەدی سەردارو پایەداری کۆمەڵێکە،هەرکە گەورەی کۆمەڵێك هاتە لاتان رێزی لێبگرن، پاشان پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی:﴿**أيه يا عدي إبن حاتم،الم تكون ركوسيا**﴾

واتە:ئەی عەدی ئایا تۆ لەسەر دینی رەکووسی نەبوویت؟رکووسی:دینێك بووە لەناو نەصاراو صابیئەدا ئەویش دەڵێ:بەڵێ:ئە پرسێ:﴿**أولم تكن تسير في قومك بالمرباع**﴾ دەفەرمووێ: ئەی تۆ چواریەکی دەستکەوتەکانی قەومەکەت نەدەبرد بۆخۆت؟ئەویش دەڵێ :بەڵێ ،دەفەرمووێ:﴿**فإن ذلك لم يكن يحل لك في دينك**﴾ واتە:ئەوە لەدینەکەتدا بۆت حەلاڵ نەبوو.دەڵێت:ئەرێ بەخوا،ئیتر بەمە بۆعەدی ساغ دەبێتەوە کە پێغەمبەرەو ئەوەی خەڵك نای زانێ ئەو دەیزانێ...پاشان پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی:﴿**لعلك ياعدي يمنعك من دخول في هذا الدين ماترى من حاجتهم ،فوالله ليوشكن المال أن يفيض فيهم فلا يوجد من يأخذه،ولعلك إنما يمنعك من دخول فيه ماترى من كثرة عدوهم وقلة عددهم،فوالله ليوشكن أن تسمع بالمرأة تخرج من القادسية على بعيرها حتى تزور هذا البيت لا تخاف،ولعلك إنما يمنعك من دخول فيه أنك ترى أن الملك والسلطان في غيرهم،وأيم الله ليوشكن أن تسمع بالقصور البيض من أرض بابل قد فتحت عليهم**﴾واتە:ئەی عەدی ئەو دەست کورتی یەی کەبەموسڵمانەکانەوە ئەیبینی لەموسڵمان بوون قەدەغەت بکات،دەبەخوا هاکا سامان لەناویاندا ئەوەندە زور بوو کەکەس وەری نەگرێ،لەوانەشە ئەو زۆریەی دوژمنان و کەمی یەی موسڵمانان کەئەیبینی لەموسڵمان بوون قەدەغەت

بکات،دەبەخوا هاکا بەرگوێت کەوت وەنافرەتێك لەقادسیەوە بەتەنیا سواری ووشترەکەی بێت وبێت زیارەتی ماڵی خوا بکات و لەهیچ نەترسێ،لەوانەشە کەئەیبینی وا موڵك و دسەلآت لەدەستی غەیری موسڵمانان دایە لەموسڵمان بوونەکەت قەدەغەت بکات،دەبەخوا هاکا بیستت کۆشکە سپی یەکانی بابل بەدەستی موسڵمانان فەتح کراون،ئیتر عەدی موسڵمان دەبێت لەرپوایەتی ئیبن جەریردا هاتووە کە عەدی دەڵێ:هاتمە خزمەتی پێغەمبەری خوا (ﷺ)و خاچێکی زێرین لەملم دابوو،فەرمووی: ﴿**یاعدي**:**أطرح هذا الوثن من عنقك**﴾واتە :ئەی عەدی ئەو بتە لەملتدا فرێدەو منیش فرێم داکەگەیشتمە لای سورەتی ( براءة ) قورئانی ئەخوێند،ئەوە بوو ئایەتی﴿**أتخذوا احبارهم ورهبانهم أربابآ من دون الله**﴾ ی دەخوێند منیش وتم:ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئێمە قەشەکان ناپەرستین،فەرمووی:﴿ **أليس يحرمون ما أحل الله فتحرمونه ويحلون ماحرم الله فتحلونه**؟﴾واتە: ئەی شتێ کەخوا حەلآلی کردبێ ئەوان حەرامی ناکەن و ئێوەش حەرامی بکەن وشتێکیش کەخوا حەرامی کردبێت ئەوان حەلآلی ناکەن و ئێوەش حەلآلی بکەن؟ دەڵێ:وتم:بەڵێ،فەرمووی:﴿**فتلك عبادتهم**﴾واتە:فەرمووی: دەی ئەوە پەرستنیانە لەرپوایەتێکی تردا بەڵێنی دەست خستنی گەنج وگەوهەرو زێرو زیوی کیسرای کوری هورمزی پێ دا لەلایەن موسڵمانەکانەوە ،عەدیش بەسەرسورمانەوە دەپرسێ:کیسرای کوری هورمز؟دەفەرمووێ:کیسرای کوری هورموز سێ جار ئەوەی فەرموو:

فەرمووی: ﴿**وليوشكن أن يبتغي من يقبل ما له منه صدقة فلا يجد**﴾ واتە:هاکا رۆژێ هات کابرا بگەرێ بەدوای کەسێکا زەکاتەکەی لێوەربگرێ کەچی

دەستی نەکەوێ،جا عەدی دەری دەبڕێ کەلەوسێ بەڵێنە ،بەڵێنی هاتنی ئافرەت لەحیرەوە یان قادسیەوە بەتەنیا بۆ حەج ودەستکەوتنی گەنج و گەوهەری کیسراو زۆر بوونی پارە کەهیچ کەس زەکات وەرنەگرێ دووانیان هاتوونەتە دی :ئافرەت بەتەنیا لەحیرەوە دەچێ بۆ حەج وعەدی بۆخۆشی لەگەڵ ئەو ئەسپ سوارانەدا بووە کەهێرشیان کردۆتە سەر مەدائینی پایتەختی ساسانی،دوای ئەوە سوێند ئەخوا کەسێ هەم بەڵێنیش دێتەدی ،چونکە فەرمایشتی پێغەمبەری خوایە ( ﷺ ) . (٤٠)

بەراستی موعجیزەیەکی گەورەیە:سەرنج بدە ئەو عەدی کوری حاتەمە کەچەند رقی لە پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) بووەو خۆی دوورە پەرێزگرتووە لەهاتنە ناو ئایینی ئیسلام بەلاَم بەبینینی چەند موعجیزەیەك لەو پێغەمبەرە پایە بەرزە وەرچەرخانێکی گەورە لەژیانیدا رووی داو بەتەواوی دڵنیابوو کەئەو پێغەمبەرە بەڕاست و درووستی پێغەمبەری خوایە ،ئیمانی هێناو ڕێگەی سەرفرازی وبەختەوەری گرتەبەر،بەراستی پێویستە ئیمانداران ئەو موعجیزە گەورەو ناودارانەی پێغەمبەری ئیسلام ( ﷺ ) پێشکەش بەمرۆڤی سەرگەردان بکەن کەگەورەترین دیاری یەو مایە سەرفرازی دونیاو قیامەتە.

---

(٤٠) ژیانی ئازیزمان ( صلی الله علیه وسلم ) بەرگی دووەم -لاپەرە ٦٨١ - ٦٨٧

## موعجیزەی (٤٣) هەواڵدانی پیغەمبەر (ﷺ) لەبارەی ئەبوو زەری غەففاری کەپێی فەرموو: بەتەنهایی دەڕۆیت و بەتەنهایی دەمریت و بەتەنهاییش زیندوو دەکرێیتەوە:

له غەزای تەبووکدا هەندێك دەیان ووت فلاکەس دواکەوت، پیغەمبەری خوا (ﷺ) دەی فەرموو: وازی لێبێنن ئەگەر خێری تیادابێت ئەوە پێتان دەگاتەوە، وەئەگەر واش نەبێت ئەوە خوا لەکوڵتانی کردۆتەوە، ئەبو زەڕ سواری ووشترێك دەبێت بەلام كه ووشترەكەی پەكی دەكەوێ، دێتەخوارەوە کەل و پەلەکەی لەسەر پشتی دادەنێ وبەدوای شوێنی پیغەمبەری خوا (ﷺ) ڕێگا دەگرێتە بەر، وەپیغەمبەری خواو هاوەلانی لەشوێنێك دادەبەزن، یەکێك لەموسلمانان تەماشادەكات و دەڵێت: ئەی پیغەمبەری خوا ئەو پیاوە بەڕێگادا دەڕوا بەتەنها، پیغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: دەی ئەبو زەڕبە، کەخەڵکەکە لێی ووردبوونەوە وتیان بەخوا ئەبوزەرە، پیغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: خوا رەحم بە ئەبوزەر بکات بەتەنها بەڕێگادا دەڕواو بەتەنها دەمرێت وبەتەنهاش زیندوو دەکرێتەوە.[٤١] ئەوەبوو ڕۆژگار تێپەری و سەردەمی خەلیفە عوسمان هاتە بەرەوەو هەندێك ڕووداو ڕوویانداو ئەبوزەڕیش ڕەوانەی ڕەبزە کرا، کەکەوتە سەرەمەرگ وەسیەتی بۆژنەکەی وخزمەتکارەکەی کردو ووتی: ئەگەر مردم بمشۆن و کەفەنم بکەن، پاشان هەڵمبگرن و لەسەر ڕێگاکە دام بنێن کەیەکەم کاروان بەلاتاندا تێپەڕی بلێن: ئەوە ئەبو زەرە کەمرد، بەوشێوەیان کرد، ئەوە بوو کاروانێك دەرکەوت وپێیان نەزانی تاخەریك بوو وولاخەكانیان بنیشنە سەرجەنازەكەی، دەبینن وا عەبدوڵلای کوری مەسعودەو لەگەڵ کۆمەڵێك خەڵکی کوفەدا، پرسی ئەمە چی یە؟ووترا: جەنازەی ئەبوزەڕە، عەبدوڵلای کوری مەسعود دەستی بەگریان کردو وتی: پیغەمبەری خوا (ﷺ)

---

[٤١] (زاد المعاد ص ٢٨١)

ڕاستی فەرمووە: ﴿**یرحم الله أباذر، یمشي وحده، ویموت وحده، ویبعث وحده**﴾ ئیتر عەبدوللاّ دابەزی وخۆی سەروکاری کرد هەتا ناشتی، بەڕاستی موعجیزەیەکی گەورەیە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) چۆن هەواڵی دابوو ئاوا ڕاست و دروست هاتەدی، ئەوەش گەورەترین بەڵگەیە لەسەر ڕاستی ودرووستی پێغەمبەرایەتی پێغەمبەری ئیسلام (ﷺ).

## موعجیزەی (٤٤) هەواڵدانی پێغەمبەر (ﷺ) بەوەی کە ئوکەیدەری پادشای (دوقه الجندل) لەکاتی ڕاوی گاکێویدا دەستگیر دەکرێت:

کاتێك کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) خالیدی کوری‌وەلیدی نارد بۆجەنگکردن لەگەڵ ئوکەیدەری سەروکی (دوقه الجندل) پێ فەرموو: ﴿**إنك ستجده یصید البقر**﴾.[٤٢]
واتە: کەدەگەیتە لای، دەبینیت خەریکی ڕاوی گاکێوی یە، هەروەها هەواڵی پێدا کە بەبێ هیچ بەرگری کردنێك دیلی دەکات و دەیهێنێت، کەخالید ڕۆیشت و گەیشتە ئەوێ، بینی وەك پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەواڵی دا خەریکی ڕاو بوو، یەکسەر دیلی کردو هێنای بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا (ﷺ).

سوپاس بۆ ئەو خوایەی کەلە بارەی ئەو پێغەمبەرەوە (ﷺ) لەقورئانەکەیدا فەرموویەتی: ﴿وَمَا يَنطِقُ عَنِ ٱلْهَوَىٰٓ * إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْيٌ يُوحَىٰ﴾ النجم (٣-٤) واتە: لەهەواو هەوەسەوە قسەناکات کەقورئان دەخوێنێت هەرچی دەیلێ قورئانەو سروشت دەکرێ بۆی...

---

[٤٢] رواه أبو اسحاق و البیهقي ،بروانه :[ الشفا ١ / ٣٤٤ ، زاد المعاد المحقق ٥ / ٥٦٨ ـ ٦٣٩ )

## موعجیزەی (٤٥) هەواڵدانی پێغەمبەر (ﷺ)بەوەی کە قورەیش دوای جەنگی ئەحزاب هێرش ناهێننە سەر موسڵمانان:

بوخاری دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) لەجەنگی ئەحزابدا فەرمووی ئیتر ئێمە هێرش دەبەینە سەریان وئەوان ناتوانن بێنە سەر ئێمە﴿**نغزوهم ولا يغزوننا**﴾ئەوهەواڵەش هەواڵێکی غەیبییەو خوای گەورە پێغەمبەرەکەی خۆی لەوە ئاگادارکردبوو، هەرواش دەرچوو، ئیبن حەجەر دەڵێ:ئەو فەرموودەیە بەڵگەیەکە لەبەڵگەکانی پێغەمبەرایەتی پێغەمبەر (ﷺ) چونکە پاش ساڵێك پێغەمبەر (ﷺ) چوو بۆ عەمرە بۆمەککەو ڕێیان لێگرت وسوڵحی حودەیبیە هاتە کایەوە، لەساڵی دواتردا عەمرەیان کرد، لە پاش ئەوەش فەتحی مەککە کراو بەوەش دەوری قوڕەیش و مەککە تەواو بوو لەهاتنە سەر مەدینە لە پاش جەنگی ئەحزاب، بەڕاستی موعجیزەیەکی گەورەیە هەزاران درووود بۆگیانی پاکی پێغەمبەری ڕاستگۆی ئیسلام (ﷺ).

## موعجیزەی (٤٦) هەواڵدانی پێغەمبەر (ﷺ) بەفەتحی مەدائین:

مسلم ریوایەتی کردووە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی:﴿**لتفتحن العصبة من المسلمين أو من المؤمنين كنوز كسرى التي في القصر الأبيض**﴾حديث صحيح، واتە:کۆمەڵێ لەبرواداران فەتحی مەدائین دەکەن ودەست دەگرن بەسەر زێڕو زیوو موجەوهەراتی کیسرادا کەلەکۆشکی سپی دایە.ئەم هەواڵەش هاتەدی لەساڵی شازدەی کۆچی دا.کەسەعدی کوڕی ئەبی وەققاص فەتحی شاری مەدائینی کردو

فارسەكانی شكاندو كۆشكی سپی كیسراش هەرچی تیایدا بوو لەسامان وزێڕو زیوو بووە غەنیمەتی موسڵمانان...

## موعجیزەی (٤٧) هەواڵدانی پێغەمبەر (ﷺ) بەڕێكەوتنی حەسەن و معاویە:

پێغەمبەر (ﷺ) لەسەر مینبەر بوو، حەسەنیش لەلایەوە بوو، جارێك سەیری خەڵكەكەی كردو جارێكیش سەیری حەسەن و فەرمووی:﴿**ابني هذا سيد ولعل الله أن يصلح بين فئتين من المسلمين**﴾ رواه البخاري، واتە :ئەم كوڕەی من سەیدەو ڕەنگە خوا سوڵحی نێوان دوو دەستەی گەورەی موسڵمانانی پێبكات، ئەم هەواڵەش دەقاو دەق وەك ڕۆژی ڕووناك هاتەدی لەساڵی چلی كۆچیدا، بەوەی كەكاتێك پێشەوای ئیمانداران( عەلی كوری ئەبوتاڵیب )خوا لێی ڕازی بێت، شەهیدكراو پێشەوا حەسەن( خوا لێی ڕازی بێت ) هاتە جێگای ئەو، دەستی لەخەلافەت هەڵگرت بۆ معاویە كەكاربەدەستی شام بوو، ئەو ساڵەش ناونرا ساڵی یەك ڕیزی موسڵمانان...

## موعجیزەی (٤٨) هەواڵدانی پێغەمبەر (ﷺ) بە فەتحی ئیسلامی:

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی:زەمانێك دێت كۆمەڵێكی زۆر لەخەڵكی غەزا دەكەن، دەووترێت :هاوەڵی پێغەمبەرتان تیادایە، دەڵێن :بەڵێ، بەهۆی ئەوەوە فەتح دەكەن و سەردەكەون، ئینجا زەمانێك دێت دەووترێت كەسێكتان تیدایە هاوەڵیەتی هاوەڵانی پێغەمبەری كردبێت، دەووترێت :بەڵێ، بەهۆی ئەو كەسەوە فەتحیان بۆدەكرێت، ئینجا زەمانێك دێت دەووترێت كەسێكتان تیدایە هاوەڵیەتی هاوەڵانی پێغەمبەری كردبێت

دەووترێت:بەڵێ، بەهۆی ئەو کەسەوە فەتحیان بۆدەکرێت،[٤٣] ئەم هەواڵەش دەقاودەق هاتە دی لەپاش وەفاتی پێغەمبەر (ﷺ) بەوەی کەغەزاو بلاوکردنەوەی ئیسلام بەردەوام بوو،ئینجا لەجەنگەکاندا بەهۆی هاوەلانی پێغەمبەر(ﷺ) یان هاوەڵی هاوەلانی پێغەمبەر (ﷺ) یان هاوەڵی هاوەلانی یارانی پێغەمبەر (ﷺ)خوای گەورە یارمەتی دەدان و فەتحیان بۆدەکرا،کاتێك عەمری کوڕی عاص لەگەڵ (مقوقس ) ڕووبەڕوو بووەوە لەمیسر،زۆر لەموسڵمانان شکان و خۆیان نەگرت،عەمر لۆمەی کردن وهانی دان لەسەر خۆڕاگری،ئینجا بانگی کردە یارانی پێغەمبەر (ﷺ) کەکۆبوونەوە پێی ووتن:پێشکەون خوا لەسەردەستی ئێوە سەرکەوتن دەدات بەموسڵمانان،ئەوانیش پیاوانە جەنگان وخوا سەرکەوتنی دانێ...

## موعجیزەی ( ٤٩ ) هەواڵدانی پێغەمبەر (ﷺ) بەوەی کە فاتیمەی کچی یەکەم کەس دەبێت لەئالی بەیت لەدوای پێغەمبەر (ﷺ) کۆچی دوایی دەکات:

بەریوایەتی صەحیح چەسپاوە کە پێغەمبەر (ﷺ) بەفاتیمەی کچی ڕاگەیاندووە کەئەو﴿ **أول أهله لحوقا به**﴾.[٤٤] واتە: فاتیمە یەکەم کەس دەبێت لەئالی بەیت لەدوای پێغەمبەر (ﷺ) کۆچی دوایی دەکات، پاش تێپەڕبوونی شەش مانگ بەسەر کۆچی دوایی پێغەمبەر (ﷺ) فاتیمە( خوا لێی رازی بێت )وەفاتی کرد.

---

[٤٣] أخرجه البخاري والمسلم

[٤٤] صحيح رواه البخاري ومسلم وأحمد والترمذي

## موعجیزەی(٥٠) هەواڵدان لەبارەی زەیدی کوری صووحان بەوەی کەئەندامێکی پێش خۆی دەچێتە بەهەشت:

لەبارەی زەیدی کوری صووحانەوە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ﴿ **یسبقه عضو الی الجنة**﴾.[٤٥] واتە:ئەندامێکی پێش خۆی دەچێتە بەهەشت،ئەو هەواڵەش دەقاودەق هاتە دی،ئەوەبوو لەجەنگی نەهاوەند دا دەستی قرتاو شەهید بوو،بەوجۆرەش دەستی پێش خۆی ڕۆی بۆ بەهەشت..

## موعجیزەی (٥١) خرێی یەکێتان لەدۆزەخدا هێندەی چیای ئوحود دەبێت:

پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەکۆمەڵێکی فەرموو کەئەبو هورەیرەو حوزەیفەشیان لەناوادبوون﴿**ضرس أحدکم من النار مثل أحد**﴾.[٤٦]

واتە: خرێی یەکێتان لەدۆزەخدا هێندەی چیای ئوحود دەبێت،ئابەوە پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەواڵی پاشگەزبوونەوەی یەکێك لەوانەی لە ئیسلام ڕاگەیاندو پاشەڕۆژی سامناکی ئەوی دەرخست،ئەبوهورەیرە دەڵێ:ئەو کۆمەڵە هەموویان مردن و من وپیاوێك ماینەوە،ئەویش لەجەنگی یەمامەدا بەمورتەددی و بێ باوەری کوژرا،بەوجۆرەش هەواڵدانەکەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەقاودەق وەك ڕۆژی ڕووناك ڕاست دەرچوو،ئەوەش بەڵگەیەکی زۆر گەورەیە لەسەر ڕاست ودروستی پێغەمبەرایەتی پێغەمبەری ئیسلام(ﷺ)...

---

[٤٥] الشفاء ( ١/ ٣٤٣ )
[٤٦] ( رواه الطبرانی بسند صحیح )

# موعجیزەی (٥٢) هەواڵدانی لەبارەی پیاوێك كە دۆزەخی یە:

ئەبو هورەیرە دەڵێ:لەگەڵ پێغەمبەری خوا(ﷺ)ئامادەی جەنگی خەیبەر بووین،ووترا دەربارەی پیاوێك كەوا پیشان دەدرا موسڵمانە ووترا ئەوەئەهلی ئاگرە،ئەبو هورەیرە دەڵێ:جاكاتێك لەوێ ئامادەبووین ئەو پیاوە شەڕێكی زۆر ئازایانەی كردو پێكرا،بریندار بوو،ووترا ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ)ئەو پیاوەی كەتۆ لەبارەتەوە فەرموو:ئەهلی دۆزەخەو شەڕێكی زۆرئازایانەی كردو مرد، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی:بۆلای ئاگر ڕۆیی، خەریك بوو هەندێك لەخەڵكەكە تووشی گومانودوودڵی بن، كەئەوان لەو حاڵەدا بوون،هەواڵ هات و ووترا كەئەو نەمرد،بەلام بەسەختی بریندار بووبوو،كاتێك كەشەو داهات دانی بەخۆیدا نەگرت لەسەر برینداریەكەی وخۆی كوشت،كەئەوهەواڵە درا بە پێغەمبەر (ﷺ) لەو بارەوە فەرمووی: الله اكبر شاهێدی دەدەم كەمن بەندەو پێغەمبەری خوام،ئەوجار فەرمانی كرد بە بیلال كەبانگەواز بكات بەناو خەڵكیدا،كەناچێتە بەهەشتەوە تەنها موسڵمان نەبێت،واتە:تەنها موسڵمان دەچێتە بەهەشتەوە،وەخوای گەورە پشتیوانی و یارمەتی ئاینەكەی دەدات،بە پیاوێكی خراپیش... [٤٧]

ئەوەش گەورەترین بەڵگەیە لەسەر ئەوەی كەهەرچی پێغەمبەری خوا دەفەرمووێ:هەمووی لەلایەن خوای گەورەوە پێی وتراوە لەڕێگای وەحیەوە وەك قورئان دەفەرمووێ:﴿ وَمَا يَنطِقُ عَنِ ٱلْهَوَىٰٓ * إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْىٌ يُوحَىٰ ﴾النجم (٣-٤) واتە: لە هەواو هەوەسەوە قسە ناكات كەقورئان دەخوێنێت هەرچی دەیلێ قورئانەو سرووشت دەكرێ بۆی .

---

[٤٧] ( أخرجه البخاري والمسلم )

# موعجیزەی (٥٣) هەواڵدانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەبارەی شوێنی تیاچوونی بتپەرستانی قورەیش لەجەنگی بەدردا:

لەئەنەسەوە – خوا لێی رازی بێ – دەڵێ: پێغەمبەری خواو هاوەڵانی بەرێکەوتن بەرەو بەدر لەرێگا تووشی بەندەیەکی ڕەش بوون هی کورانی حەجاج گرتیان وهێنایان پرسیاریان لێکرد: ئەبو سوفیان لەکوێ یە؟ئەویش دەی گووت:بەخوا من لەکاروباری ئەبوسوفیان ئاگادارنیم بەڵام ئەوە قورەیشە کەهاتووە ئەبوجەهل وعوتبەو شەیبەی کورانی رەبیعە وە ئومەییەی کوری خەلەف،ئەگەر وای دەووت لێیان دەدا،ئەویش دەی ووت:وازم لێبێنن وازم لێبێنن هەواڵتان پێدەدەم،کەوازیان لێدەهێنا دەی ووت: بەخوا من ئاگام لە کاروباری ئەبوسوفیان نی یە،بەڵام ئەوە قورەیشە کەبەرەو رووتان دێن و لەناویان دایە ئەبوجەهل وعوتبەو شەیبەی کورانی رەبیعە وە ئومەییەی کوری خەلەف،لەو کاتەدا پێغەمبەری خوا (ﷺ) نوێژی دەکردو گوێی لەو باسە بوو،کاتێك لەنوێژەکەی بووەوە فەرمووی:سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە ئێوە لێتان دەدا کاتێك کە ڕاستی دەووت،وەوازتان لێدەهێنا کاتێك کە درۆی لەگەڵ دەکردن،ئەوە قورەیشە هاتووە بۆ یارمەتی کاروانەکەی ئەبوسوفیان،ئەنەس ووتی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی:ئەوە شوێنی تیاچوونی فلان کەسە بەیانی وەدەستی موبارەکی دادەنا لەسەر زەوی یەکە وەدەی فەرموو:ئەوەش شوێنی تیاچوونی فلان کەسە بەیانی وە دەستی موبارەکی دادەنا لەسەر زەوی یەکە وەدەی فەرموو:ئەوەش شوێنی تیاچوونی فلان کەسەو دەستی موبارەکی دەخستە سەر زەویەکە،دەڵێ:سوێند بەوخوایەی کەگیانی منی بەدەستە هیچ یەکێك لەوانەی کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئاماژەی بەشوێنی تیاچوونیانی کردبوو،لەو شوێنەی کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەستی خسبووە سەر هەر ئالەو شوێنانە تیاچوون وبەبێ باوەڕی بەرەو دۆزەخ

بەرێ کەوتن،وە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمانی فەرمووو:هەڵدرانە ناو چاڵی قولەیب لەبەدردا.[٤٨]

بەراستی موعجیزەیەکی گەورەیە ،ئەو هەواڵە دوو موعجیزەیە :

یەکەم:هەواڵدانە بەکوژرانی گەورەو سەرانی قورەیش ،کەئەوەش دیارە خوا هەواڵی داوەتێ ئەگینا کێ وادەی مردنی کێ دەزانێ.

دووەم:هەواڵدانە بە شوێنی کوژرانی ئەو کەسانە کەدیارە ئەوەش هەر غەیبەو خوا پێغەمبەرکەی خۆی لێ ئاگادارکردووە...

## موعجیزەی (٥٤) هەواڵدانی لەبارەی مردنی نەجاشی:

لە ئەبو هورەیرەوە – خوا لێی رازی بێت – دەڵێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەواڵی دا لەبارەی نەجاشی لەبارەی ئەو رۆژەی کەتیایدا مرد،چووە دەرەوە بەرەو شوێنی نوێژکردن خەڵکەکەی ریز کرد،وە چوار ( الله اکبر ) ی فەرموو،[٤٩]

وەهەروەها عیمرانی کوری حوصەین دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێی ووتین:براکەتان نەجاشی مردووە ،هەستن نوێژی لەسەربکەن،دەڵێ:هەستاین ریزمان بەست هەروەك چۆن بۆ نوێژ ریزدەبەستری لەسەر مردوو،وەعیمران دەڵێ: نوێژمان لەسەرکرد،هەروەك چۆن نوێژ دەکرێ لەسەرمردوو.[٥٠]

زانای بەناوبانگ ( المبارك الکفوری ) دەڵێ:ئەوە نیشانەیەکە لەسەر نیشانەکانی پێغەمبەرایەتی پێغەمبەر (ﷺ) لەبەر ئەوەی هەواڵی دا بەمردنی نەجاشی لەو رۆژەی

---

[٤٨] رواه البخاري في كتاب الجهاد ( ٢٦٨١ )

[٤٩] رواه البخاري في الجنائز ( ١١٨٨ ) وفى سنن النسائي ( ١٩٧٢ )- ( ١٩٨٠ ) وسنن أبي داود ( ٣٢٠٤ ) وسنن ابن ماجه ( ١٥٣٤ ) .

[٥٠] صحيح رواه الترمذي ( ١٠٣٩ ) وفي سنن ابن ماجه ( ١٥٣٥ )

تیایدا مرد، لەگەڵ دووری لەنێوان زەوی حەبەشەو مەدینەدا، [٥١] بەراستی ئەوانە موعجیزەی ئەوەندە گەورەن كەبەقەد تۆزقاڵێك گومان و دوودڵی ناهێڵن، لەناو دڵەكاندا و وەك ڕۆژی ڕووناك پێغەمبەرایەتی پێغەمبەری ئیسلام دەسەلمێنن هەزاران درووود بۆگیانی پاكی ئەو پێغەمبەرە پایەدارە (ﷺ).

## موعجیزەی (٥٥) هەواڵدانی پێغەمبەر (ﷺ) لەبارەی تەمەنی عەبدوللای كوری بەسر بەوەی كە صەد ساڵ دەژی:

لە عەبدوللای كوری بەسەرەوە دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێی فەرمووم: ئەو منداڵە یەك قەرن واتە صەد ساڵ دەژی، هەروەك چۆن پێغەمبەر فەرمووی، صەد ساڵی تەواو ژیا، الله اكبر بەراستی تەنها ئەو موعجیزە گەورەیە بەسە كەببێتە بەڵگەیەكی ڕاست و درووست لەسەر پێغەمبەرایەتی پێغەمبەری ئیسلام ئەگینا كێ دەزانێ تەمەنی خەڵك دیاری بكات، بەڵێ ئەوە خوای گەورە خاوەنی زانست و زانیاری بێسنوورەو هەواڵەی بەوەحی بە پێغەمبەرەكەی خۆی ڕاگەیاندووە، تاكو ببێتە بەڵگەیەكی ئاشكرا لەسەر هەموو ئەو شتانەی كە پێغەمبەری خوا ڕایان دەگەیەنێ و هەواڵیان لەبارەوە دەدات ، سوپاس بۆ ئەو خوایەی كەلەبارەی ئەو پێغەمبەرە ڕاستگۆیە لەقورئانە پیرۆزەكەیدا فەرموویەتی: ﴿وَمَا يَنطِقُ عَنِ ٱلْهَوَىٰٓ * إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْيٌ يُوحَىٰ﴾ النجم (٣-٤) واتە: لەهەواو هەوەسەوە قسە ناكات كەقورئان دەخوێنێت هەرچی دەیلێ قورئانەو سرووشت دەكرێ بۆی. [٥٢]

---

[٥١] ( تحفة الأحوذي ١١٥/٤ )

[٥٢] (صحيح :قال الألباني في السلسلة الصحيحة ٦/ (٣٤٣) (٢٦٦٠) أخرجه البخاري في التاريخ الكبير ( ١/١/ ٣٢٣ وفي الصغير (ص ٩٣) والحاكم( ٥٠٠/٤) والبيهقي في ( الدلائل النبوة)( ٦ / ٥٠٣) والطبرني في المسند الشامين( ٨٣٦) وابن عساكر في تاريخ دمشق ( ٩ / ٤ / ٢ )

## موعجیزەی (٥٦) هەواڵدانەکەی سەر شاخی ئوحود:

لە ئەنەسەوە –خوا لێی رازی بێ – دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) سەرکەوتە سەرشاخی ئوحود، ئەبوبەکرو عومەرو عوسمانیشی لەگەڵ بوون، شاخی ئوحود کەوتە لەرزە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: جێگیربەو مەلەرزە ئەی ئوحود لەبەرئەوەی ئەوەی لەسەر پشتتە پێغەمبەرێکەو راستگۆیەکەو دوو شەهیدن، چۆنی فەرمووبوو، لەدواییدا وادەرچوو، هەواڵدانەکە بەراست و دروست هاتەدی لە پاش وەفاتی پێغەمبەر (ﷺ) ئەبوبەکر بوو بوجێنشینی موسڵمانان وماوەی خەلافەتی ئەبوبەکر-خوا لێی رازی بێت- دوو ساڵ و سێمانگ و دە رۆژ بوو، لەدوایدا وەفاتی کرد، لەدوای ئەو عومەری کوری خەتتاب بوو بەجێنشینی موسڵمانان ،ماوەی خەلافەتی عومەریش –خوالێی رازی بێ- دە ساڵ و شەش مانگ و هەشت رۆژ بوو، وەلەدواییدا شەهید کرا، لەدوای ئەویش عوسمانی کوردی عەففان- خوا لێی رازی بێ- بوو بەجێنشینی موسڵمانان و ماوەی خەلافەتی عوسمانیش :یازدە ساڵ ویازدە مانگ و نۆ رۆژ بوو، ئەویش شەهیدکراو هەواڵدانەکەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) وەك رۆژی رووناك دەقا ودەق راست دەرچوو. [٥٣]

---

[٥٣] أخرجه البخاري في فضائيل (٣٦٧٥)

## موعجیزەی (٥٧) هەواڵدانەکەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەبارەی جەنگی حونەین دا:

پێغەمبەرو موسڵمانان بەرێکەوتن بەرەو حونەین، تانزیك کەوتنەوە ، پیاوێکی فارس هات و ووتی: ئەی پێغەمبەری خوا: لەشکری هەوازین بە ڕەگ وریشەیان وژن و منداڵ و ئاژەڵیانەوە لە شیوی حونەین کۆبوونەتەوە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) زەردەخەنەی کردوو پێکەنی و فەرمووی: ﴿**تلك غنيمة المسلمين غداً إن شاء الله تعالى**﴾.[٥٤] واتە: ئەوانەدەبنە غەنیمەتی موسڵمانان ئینشا الله تعالى بەیانی چۆنی فەرموویوو ئاوا دەقاودەق وەك ڕۆژی ڕووناك هاتەدی، خوای گەورە پێغەمبەرکەی خۆی سەرخست لەغەزای حونەینداو دەستی کەوت دەستکەوت و غەنیمەتی زۆر لەدوژمنەکانی داو دابەشی کرد بەسەر موسڵماناندا.

## موعجیزەی (٥٨) هەواڵدانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەبارەی کەسێك کەزەوی ڕاگیری ناکات:

ئەنەس-ڕەزای خوای لێ بێ- وتی: پیاوێك هەبوو وەحی دەنووسی بۆ پێغەمبەر (ﷺ) هەڵگەرایەوە لەئایینی ئیسلام وپەیوەندی کرد بەبت پەرستان ، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ﴿**إن الأرض لا تقبله**﴾واتە: زەوی لەناو خۆیدا ڕاگیری ناکات، ئەبو طه لْحه دەڵێت: ئەو زەوییە کەئەوکەسەی لەسەر مرد کەناشتیان زەوی فڕێی دایە دەرەوە وتی: ئەوە بۆ

---

[٥٤] صحيح أخرجه أبوداود (٢٥٠١)، والحاكم (٩٣/٢)، (والطبراني في الكبير (٦٩/٦) والبيهقي في السنن (١٤٩/٩)، (صحيح الترغيب والترهيب (١٢٣٥).

ئەوای لێهاتووە؟ووتیان چەند جارێك ئاوا ناشتوویانە بەڵام زەوی فرێی داوەتە دەرەوەو ڕاگیری نەکردووە...[٥٥]

## موعجیزەی (٥٩) هەواڵدانی دەربارەی کەسێك کە دزی لە دەستکەوتی غەزاکردبوو:

یقول عبدالله بن عمرو (كان على ثقل النبي (ﷺ) رجل يقال له :كركرة فمات فقال رسول الله (ﷺ) هو في النار فذهبوا ينظرون اليه فوجدوا عباءةً قد غلّها )[٥٦]

واتە: پیاوێك ناوی (کرکرە) بوو مرد، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی:ئەو لەئاگردایە،ڕۆیشتن تەماشایان کرد عەبایەکی لابوو بۆخۆی پەنای دابوو لەدەستکەوتی غەزا...

## موعجیزەی (٦٠) هەواڵدانی لەبارەی پیاوێك وخێزانەکەی سەبارەت بەڕێزگرتنی میوانێکی پێغەمبەر (ﷺ) :

ئەبو هورەیرە- ڕەزای خوای لێ بێ – وتی: پیاوێك هات بۆلای پێغەمبەری خوا (ﷺ) وتی:من ماندوویەتی و برسیەتی تینی بۆ هێناوم- پێغەمبەری خوا ناردی بۆ لای هەندێك لەخێزانەکانی وتیان:سوێند بەو خوایەی بەهەق تۆی ناردووە هیچمان لانی یە تەنها ئاو نەبێت،ئەوجار ناردی بۆلای ئەوانی کەش،ئەوانیش وتیان سوێند بەوخوایەی کەتۆی بەهەق

---

[٥٥] (صحيح :أخرجه أحمد ( ٣/ ١٢١-١٢٢ ) وابن حبان(٧٤١) ( الموسوعة الحديثية ).

[٥٦] (صحيح:أخرجه البخاري)( ٣٠٧٤ )

ناردووه هیچمان نی یه تەنها ئاومان هەیە،تاهەر هەموویان وتیان تەنها ئاومان هەیە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی:کێ میوانداری ئەو پیاوه دەکات ئەمشەو ،خوا رەحمی پێ بکات،پیاوێك لەئەنصارەکان هەستاو وتی:من میوانداری دەکەم ئەی پێغەمبەری خوا، پێکەوه لەگەڵ پیاوەکە بەرێکەوتن بەرەو ماڵەوه،بەژنەکەی وت:ئەرێ هیچت لایە لە خواردن؟ژنه وتی:نا تەنها بەشی منداڵەکانم لایە،وتی:ئافرەت بیان خافڵێنه بەشتێك،کاتێك خواردنت هێنا بۆ میوانەکەمان چرایەکە بکوژێنەرەوه بۆئەوەی وا بزانێ کەمنیش لەگەڵی دەخۆم ،دەڵێ:پیاوەکه تێری خواردو ئەو ژن و پیاوەش بە برسیەتی ئەو شەوەیان بەرێ کرد،بەیانی کەچوونەوه بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا (ﷺ)فەرمووی:بەراستی خوای گەوره زۆر موعجیب بوو لە میوانداریەکەی ئەمشەوتان.[٥٧]

خۆ پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەگەڵیان نەبوو،تابزانێ میوانداریان چۆن لەو پیاوه کردووه،بەڵکو ئەوه لەئاسمانەوه هەواڵی پێدرابوو ،وەخوای گەوره ئاگاداری کردبووەوه لەو بارەوه.

## موعجیزەی (٦١) هەواڵدانی لەبارەی ووشترەکەی لەغەزای تەبووکدا:

ئیبن ئیسحاق دەڵێت:خەڵکی لەغەزای تەبووکدا بەیانیان کردەوەو ئاویان پێنەبوو،باسی حاڵی خۆیان کرد لای پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێغەمبەریش دووعای کرد،خوای گەوره هەورێکی ناردوو بارانی باراند تا خەڵکەکه تێر ئاوبوون وکەل و پەلەکەی خۆیان پرکرد لەئاو،ئەوجار پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەستی بەرۆیشتن کرد،جالەشوێنێك ووشترەکەی لێ ون

---

[٥٧] ( صحيح :أخرجه مسلم )( ٢٠٥٤ )

بوو،زەیدی کوری لەصیت کەیەکێك بوو لە مونافیقەکان وتی:وا خۆ پیشان دەدا دەڵێت پێغەمبەرم وهەواڵتان دەداتێ لەهەواڵەکانی ئاسمان بەلآم نازانێ ووشترەکەی لەکوێ یە؟ پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی پیاوێك ئاوای ووتووە، باسی قسەکەی ئەو مونافیقەی کرد، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی:سوێند بەخوا هەرشتێك خوا فێرم نەکات نای زانم،وا خوای گەورەش پیشانی دام لەکوێ یە،وا لەو دۆڵەدا لەفلان شیودا درەختێك بەهۆی رەشوەکەیەوە بەندی کردووە،کەرۆیشتن پێغەمبەری خوا (ﷺ) چۆنی فەرموبوو ئاوا بوو،ووشترەکەیان هێنایەوە.[٥٨]

## موعجیزەی (٦٢) هەواڵدانی پێغەمبەر (ﷺ) لەبارەی قسەو باسی مونافیقان لەغەزای تەبووکدا:

قەتادە لەریوایەتێکی دەڵێ:لەکاتێکدا کە پێغەمبەر (ﷺ) بۆغەزای تەبووك ئەرۆیشت وچەند کەسێکی مونافیقی لە پێشەوە دەرۆیشتن و وتیان:ئەو پیاوە بەتەمایە کۆشك و قەلآکانی تەبووکی بۆ فەتح بکرێت؟ئەی هوو،ئەی هوو ،ئەوە بوو خوای گەورە پێغەمبەرەکەی لەوە ئاگادار کردوو ئەویش فەرمووی:﴿**إحبسوا على هؤلاء الركب**﴾فەرمانی دا ئەوانە بوەستێنن،گەیشتە لایان و فەرمووی:﴿**قلتم كذا قلتم كذا**﴾واتە:فەرمووی:وەهاو وەهاتان وت:وتیان:ئەی پێغەمبەری خوا گاڵتەو گەپمان دەکرد،ئەوەی کەدەیبیستن دەربارەیان هاتە خوارەوە ،خوای بالآدەست ئەو ئایەتەی ناردە خوارەوە:﴿ يَحْذَرُ الْمُنَافِقُونَ أَن تُنَزَّلَ عَلَيْهِمْ سُورَةٌ تُنَبِّئُهُم بِمَا فِي قُلُوبِهِمْ قُلِ اسْتَهْزِءُوا إِنَّ

---

[٥٨] زاد المعاد، ص ٢٨١

ٱللَّهَ مُخۡرِجٞ مَّا تَحۡذَرُونَ * وَلَئِن سَأَلۡتَهُمۡ لَيَقُولُنَّ إِنَّمَا كُنَّا نَخُوضُ وَنَلۡعَبُۚ قُلۡ أَبِٱللَّهِ وَءَايَٰتِهِۦ وَرَسُولِهِۦ كُنتُمۡ تَسۡتَهۡزِءُونَ ﴾**التوبە (٦٤-٦٥)**

**واتە:دوو ڕووەکان مەترسی دەکەن لەوەی کەسورەتێك دەربارەیان بنێردرێتە خوارەوە کەهەواڵیان پێبدا بەوەی کەلەدڵیان دایە،ئەی موحەممەد (ﷺ)بڵێ:گاڵتەولاقرتێ بکەن بەراستی خوا دەرخەرو ئاشکراکاری ئەوەیە کەمەترسی لێدەکەن.سوێند بێ ئەگەر پرسیاریان لێبکەیت بەراستی دەڵێن دڵنیا بن ئێمە هەر دەمەتەقێ و گاڵتە دەکەین،تۆش بڵێ:ئایا بەخوا وبەڵگەکانی وپێغەمبەرەکەی ئێوە گاڵتەو لاقرتێتان دەکرد،پاشان خوای پاك وبێگەرد بۆی ڕوونکردنەوە کەئەو گاڵتە کردنەیان بەرەو کوفر بردوونی**﴿لَا تَعۡتَذِرُواْ قَدۡ كَفَرۡتُم بَعۡدَ إِيمَٰنِكُمۡۚ إِن نَّعۡفُ عَن طَآئِفَةٖ مِّنكُمۡ نُعَذِّبۡ طَآئِفَةَۢ بِأَنَّهُمۡ كَانُواْ مُجۡرِمِينَ ﴾**التوبە (٦٦) واتە:بەهانە مەهێننەوە بەراستی ئێوە بێ بڕوا بوونەوە پاش بڕوا هێنانتان ئەگەر ببورین وچاوپۆشی بکەین لەکۆمەڵ و تاقمێکتان بەهۆی گەڕانەوەتانەوە سزای کۆمەڵ و تاقمێکی تردەدەین،لەبەر ئەوەی بێگومان ئەوانە تاوانباربوون، وەهەروەها دەربارەی ئەو مونافیق و دوو ڕووانە ئەم ئایەتەش هاتە خوارەوە:**﴿ يَحۡلِفُونَ بِٱللَّهِ مَا قَالُواْ وَلَقَدۡ قَالُواْ كَلِمَةَ ٱلۡكُفۡرِ وَكَفَرُواْ بَعۡدَ إِسۡلَٰمِهِمۡ وَهَمُّواْ بِمَا لَمۡ يَنَالُواْۚ وَمَا نَقَمُوٓاْ إِلَّآ أَنۡ أَغۡنَىٰهُمُ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ مِن فَضۡلِهِۦۚ فَإِن يَتُوبُواْ يَكُ خَيۡرٗا لَّهُمۡۖ وَإِن يَتَوَلَّوۡاْ يُعَذِّبۡهُمُ ٱللَّهُ عَذَابًا أَلِيمٗا فِي ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةِۚ وَمَا لَهُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ مِن وَلِيّٖ وَلَا نَصِيرٖ ﴾ **التوبە (٧٤) واتە: دوو ڕووەکان سوێند دەخۆن بەخوا ئەو وتانەی دراونەتە پاڵیان نەیان ووتوە،سوێند بەخوا بێگومان ووتەی بێباوەڕیان ووتوە وە بێ بڕوا بوونەوەتەوە لەپاش موسڵمان بوونیان و نیازی شتێکیان بووبەڵام بۆیان نەکرا، پیلانی کوشتنی پێغەمبەریان هەبوو کاتی گەڕانەوەی لەتەبووك وە هیچ ڕەخنەو رقێکیان نەبوو تەنها ئەوە نەبێ کەخواو پێغەمبەرەکەی بڕوادارانیان**

دەوڵەمەند کردووە لەبەهرەی خۆی ئینجا ئەگەر ئەوان بگەڕێنەوە و پەشیمان ببنەوە ئەوە چاکترە بۆیان وەئەگەر ڕوو وەرگێڕن ئەوە خوا سزایان ئەدات بەسزایەکی سەخت لە دونیاو پاشەڕۆژ دا وەلەزەویدا نی یە بۆئەوان هیچ دۆست و یارمەتی دەرێك ،ئیبن کەثیر ووتوویەتی:ضە حاك ووتوویەتی:کۆمەڵێك لەمونافیقان دەیانەوێت دەست لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) بوەشێنن ئەوەش لەشەوداو لەکاتی ڕۆیشتندا،ئەوانە دەوئەوەندە کەسە بوون وئەوئایەتەی سەرەوە دەربارەیان هاتە خوارەوە.واحیدیش لە ضە حاکەوە دەگێڕێتەوە :،مونافیقان لەگەڵ پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەرەو تەبووك کەوتنە ڕێ،کەهەندێکیان تاك ئەکەوتنەوە جنێویان بە پێغەمبەرو هاوەڵانی ئەداو تانەیان لەدین ئەدا،ئەوە بوو حوذەیفە ئەو قسانەیانی گەیاندە پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەویش پێی فەرموون:﴿**یا أهل النفاق ماهذا الذي بلغني عنکم**﴾ واتە:فەرمووی ئەی ئەهلی نیفاق ئەمە چی یە کە لێتانەوە پێم گەیشتووە؟دەستیان بەسوێند خواردن کرد کەهیچی لەوەیان نەووتووە،کەچی قورئان بۆ بەدرۆخستنەوەیان هاتە خوارەوە،سوپای ئیسلام،سوپاس بۆخوا بەسەلامەتی وبەسەرکەوتنەوە بەرەو مەدینەی پایتەخت گەڕایەوە،لەکاتی گەڕانەوەدا کۆمەڵێك مونافیق ویستیان پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە شوێنێکی بەرزەوە هەڵدێرن،بەیەهقی لە حوذەیفەی کوری یەمانەوە ڕیوایەتی کردووە کەووتوویەتی:من دەستم بەلغاوی ووشترەکەی پێغەمبەری خواوە گرتبوو،عەممارێش لە ووشترەکەی دەخوڕیی،هەتا کەگەیشتینە کۆسپەکە،دەبینین وا لەوێ دوازدە پیاو ڕێیان پێگرتووە،دەڵێ:منیش پێغەمبەری خوام (ﷺ) ئاگادارکردو قیڕاندی بەسەریانداو ئەوانیش هەڵاتن،فەرمووی:﴿**هل عرفتم القوم**؟﴾فەرمووی:ئەو خەڵکەتان ناسین؟ وتمان :نەخێر ئەی پێغەمبەری خوا دەم و لووتیان هەڵبەستبوو،فەرمووی:﴿**هؤلاء المنافقون یوم القیامة،وهل تدرون ما**

**أرادوا؟**﴾واتە :فەرمووی:ئەوانە موونافیقەکانی ڕۆژی قیامەتن،ئەی ئەزانن چیان ئەویست؟ وتمان نەخێر،فەرمووی:﴿**ارادوا یزحموا رسول الله في العقبة فیلقوه منها**﴾ واتە :فەرمووی: ویستیان تەنگ بە پێغەمبەری خوا هەڵبچنن و لە کۆسپەکەوە بیخەنە خوارەوە، وتمان :ئەی نانێری بۆلای کەس وکاریان تا هەریەکەیان سەری خزمەکەیان بنێرن بۆت؟ فەرمووی:﴿**لا أکره أن یتحدث العرب أن، محمداً قاتل بقومە حتی إذا أظهره الله بهم أقبل علیهم یقتلهم**﴾واتە :فەرمووی:نەخێر پێم ناخۆشە عەرەب باسی ئەوە بکەن کەموحەممەد بەقەومەکەی جەنگی کرد هەتا کەخوا سەری خست،دەستی داوەتە کوشتنی پیاوانی قەومەکەی ،دوا ئەوە دووعای لەموونافیقەکان کرد...

## موعجیزەی (٦٣) هەواڵدانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەهەڵکردنی بایەکی بەهێز لەغەزای تەبووکدا:

لەئەبو حەمیدەوە-خوا لێی ڕازی بێ – وتی:دەرچووین لەگەڵ پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەغەزای تەبووك گەیشتینە(**وادي القری**) بەلای باخێکی ئافرەتێکدا ڕۆیشتین فەرمووی:بیقەرسێنن ،دەڵێ:ئێمەش قرساندمان،وە پێغەمبەری خوا (ﷺ) قرساندی فەرمووی:دەویسقە وە فەرمووی:بەئافرەتەکە بیژمێرە،هەتا ئێمە دەگەڕێینەوە بە پشتیوانی خوا،دەڵێ ڕۆیشتین هەتا گەیشتینە تەبووك ، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی:ئەمشەو بایەکی بەهێز بەسەرتاندا هەڵدەکات باکەستان لەشوێنی خۆی هەڵنەستێتەوە،وەهەر یەکێك لەئێوە ئەگەر ووشترێکی پێ یە با توونید بە ڕیشوەکەوە بیبەستێتەوە، با بەهێزەکە

هەڵی کرد هەروەك چۆن پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەواڵی لەبارەوە دابوو، پیاوێك هەستا بایەکە هەڵی گرت و فڕاندی تا بردیە سەر شاخی (طه ی) دەڵێ:دوایی کەگەڕاینەوە کەگەیشتینەوە (وادي القرى) پێغەمبەری خوا (ﷺ) پرسیاری لەئافرەتەکە کرد، لەبارەی بەرووبومی باخەکەی کەچەند بووە؟ وتی: دەویسق بووە...[٥٩]

بەراستی موعجیزەیەکی گەورەیە، بەراستی پێویستە ئیمانداران ئەو موعجیزە گەورەو ناودارانە پێشکەش بەمرۆڤی سەرگەردان بکەن کەگەورەترین دیاری یەو مایەی سەرفرازی دونیا وقیامەتە...

## موعجیزەی (٦٤) هەواڵدانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەپەیدا بوونی دووکۆمەڵ کەئەهلی ئاگرن:

عن أبي هريرة قال :قال رسول الله (ﷺ) صنفان من أهل النار لم أرهما :قوم معهم سياط كأذناب البقر يضربوون بها الناس ونساء كاسيات عاريات، مميلات مائلات رأوسهن كأسنمة البخت المائلة، لايدخلن الجنة ولا يجدن ريحها وإن ريحها ليوجد من مسيرة كذا كذا .[٦٠]

ئەبوو هورەیرە خوای لێ رازی بێ دەڵێ : پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی : دوو جۆر لە خەڵکی هەن دەچنە دۆزەخ کە ئەم دیون خەڵکانێ کە قامچیان پێە هەروەك کلکی مانگاو لەخەڵکی دەدەن و ئافرەتانێ کە پۆشتەن بەلاَم وەك ڕووت بن جلەکانیان یان تەنگە یان تەنکە یان کورتە و ڕووتن لادەرن لەڕاستی و هاندەری ئافرەتانی تریشن و بە فیزو لارو لەنجەوە دەڕۆن بەرێوە قژیان وەك کۆپارەی حوشتر بەرز کردۆتەوە کە کۆپارەکە ئەوەندە

---

[٥٩] (أخرجه مسلم في فضائيل نووي ١٥ / ٤١ ، ٤٣ )

[٦٠] ( پووختەی صەحیحی موسلیم بەرگی ٢ لاپەرە ٦٨٢ )

قەبەیە لە قەڵەویدا لار دەبێتەوە ئەوانە نە دەچنە بە هەشت و نە بۆنیشی دەکەن لە کاتێکدا کە بۆنی بەهەشت لە دووری ئەوەندە و ئەوەندەوە دێت.

## موعجیزەی (٦٥) هەواڵدانی لەبارەی بەفیڕودانی ئەمانەت:

لە عەطائی کوڕی یەسارەوە لەئەبو هەرەیرەوە دەڵێ:لەکاتێکدا کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەکۆڕێکدا قسەی دەکرد بۆخەڵك:عەرەبێکی دەشتەکی هات وتی:کەی قیامەت دادێ؟ پێغەمبەری خوا بەردەوام بوو لەسەر قسەکردنەکەی هەندێك لەخەڵکەکە ووتیان گوێی لێ بوو،هەندێکی تریان ووتیان گوێی لێنەبوو،تا پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەفەرمایشتەکەی بووەوە،فەرمووی: لەکوێ یەو ئەو کەسەی کە پرسیاری کرد لەبارەی قیامەتەوە؟کابرا ئەعرابیەکە وتی:ئائەوە من بووم ئەی پێغەمبەری خوا، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی:﴿ **فإذا ضيعت الأمانة فانتظر الساعة قال:كيف إضاعتها؟ قال إذا وسد الأمر الى غير أهله فانتظير الساعة**﴾.[٦١] واتە: فەرمووی:ئەگەر ئەمانەت بەفیڕۆ درا چاوەڕوانی قیامەت بکە، پیاوەکە وتی:چۆن ئەمانەت بەفیڕۆ دەدرێ؟ پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی:ئەگەر کاروبار درایە دەستی کەسێك کەشیاوی ئەوە نەبێت کەکارو باری بدرێتە دەست چاوەڕوانی قیامەت بکە.

هەزاران درود بۆگیانی پاکی پێغەمبەری ئیسلام بەراستی هەروەك ئەو فەرموویەتی لەو ڕۆژگارەدا ئاوای لێهاتووە،کەسێك کەموسڵمانەوڕاستەو ئەمانەت پارێزەو لەخوا ترسەو دەست پاکە خەڵکی نایکەن بەبرا گەورە بەسەر خۆیانەوە.

---

[٦١] ( صحيح:رواه البخاري )

## موعجیزەی (٦٦) هەواڵدانی بەنەمانی حوكمی ئیسلامی و پاشان نوێژكردن:

پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرمووێت:﴿ **لينقضن عرى الاسلام عروة فكلما انتقضت عروة تشبث الناس بلتي تليها وأولهن نقضا الحكم وأخرهن الصلاة**﴾.[٦٢] واتە: قوڵفەكانی خێمەی ئیسلامەتی یەك یەك دەپچڕێت،هەركاتێك یەكێكیان پچڕا خەڵك دەست بەوی تریانەوە دەگرێت،یەكەمیان حوكمەودواهەمینیان نوێژە،بەراستی هەروا دەرچوو خەلافەتی ئیسلامی ڕوخێنراو دووژمنانی ئیسلام هەر ڕۆژەی بیانوویەك بە ئیسلام دەگرن وخەڵكانێكی زۆریش وازیان لەنوێژكردن هێناوە..

## موعجیزەی (٦٧) هەواڵدانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەهێرشی دووژمنان بۆ سەر موسڵمانان:

پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرمووێت:﴿ **يوشك الامم أن تداعي عليكم كما تداعي الاكلة الى قصعتها ،فقال قائل :ومن قلة نحن يومئذ ؟ قال :بل أنتم يومئذ كثير ولكنكم غثاء كغثاء السيل،ولينز عن الله من صدور عدوكم المها بة منكم ،وليقذفن الله في قلوبكم الوهن،فقال قائل:يارسول الله وما الوهن ؟ قال:حب الدنيا وكراهية الموت** ﴾[٦٣]

---

[٦٢] ( حديث حسن رواه الأمام أحمد )

[٦٣] حديث حسن رواه أبو داود .

واته : ڕۆژێك دێت گەلان هێرش دەکەنە سەرتان، چۆن کۆمەڵە ووشترێکی برسی هێرش دەبەنە سەر ئالف و خواردنیان، یەکێ وتی:لەو ڕۆژەدا لەبەر کەمیمانە وامان لێدێت؟ فەرمووی:نەخێر بەڵکو ئێوە لەو ڕۆژەدا زۆرن، بەلاَم وەك کەف وپۆش وپەلاَشی سەر لافاو وان وخوای گەورە ترستان و هەیبەتتان لەدڵی دوژمن دەردەکات ولاوازن ( الوهن ) دەخاتە دڵتانەوە، یەکێ وتی:ئەی پێغەمبەری خوا ئەو لاوازی یە (الوهن) چی یە؟ فەرمووی:خۆشەویستی دنیاو حەزنەکردنە لەمردن ، بەراستی ئەم فەرموودەیەش وەك ئەوانی تر زۆر بەراست ودروستی هاتۆتە دی ،ئەوە حاڵی موسڵمانانە کەچۆن دنیا غافڵیان دەکات وحەزناکەن گیان فیدا بن و حەزناکەن بمرن لەڕێی خوادا، ئەوەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) داهاتووی ئوممەتەکەیی وقۆناغەکانی ژیانیانی پیشان دراوە لەلایەن خوای گەورەو پەروەردگارەوە کەزانایە بەنهێنی و ئاشکرا، ئەو ڕێنماییانەی پێغەمبەریش (ﷺ) بۆ ئەوە بووە کەموسڵمانان لەخۆیان تێبگەن وشارەزای دەردو نەخۆشی یەکان بن ودوژمنان باشتر بناسن ونەخەڵەتێن بەفاك و فیکی ناحەزان وپڕوپاگەندەی پیاوانی شەیتان...

## موعجیزەی (٦٨) هەواڵدانی بەشوێنکەوتن و چاولێکردنی گاورو جولەکە:

پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرمووێ:﴿ **لتتبعن سنن من كان قبلكم شبراً بشبر ذراعاً بذراع حتى لو سلكو جحرضب لسلكتموه قلنا**

**یارسول الله اليهود والنصارى؟؟ قال فمن﴾**[٦٤] واتە: بەراستی شوێنی ڕێبازی ئەوانەی پێش خۆتان دەکەون بست بەبست وبال بەبال،تەنانەت ئەگەر بچنە کونی بزن مژەشەوە دەچن بەدوایاندا،ووتمان پێغەمبەری خوا (ﷺ) مەبەستت جولەکەو گاورە؟ فەرمووی:ئەی گوایە کێ؟ئائەوە هەواڵدانە لەداهاتوو،کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێش زیاتر لە ١٤٠٠ ساڵ ئاماژەی پێکردووە دەقاو دەق ئەوە هاتۆتە دی،ئەوەتا جولەکەو گاور کۆڵنادەن و وازناهێنن،وەخوای گەورەش لەقورئانە پیرۆزەکەیدا ئاماژەی بۆ ئەمە کردووە بۆ ئەو شوێن کەوتنەش بە ملیارەها دۆلار سەرف دەکرێ وهەرچی هۆکاریش هەیە خراونەتەکار لەکەناڵە ئاسمانی یەکان ورۆژنامەو گۆڤارەکان وپڕوپاگەندەی ئەڵقە لەگوێ یەکان وکڕینی خەڵکان وگومڕا کردنیان...

## موعجیزەی (٦٩) هەواڵدانی بەبڵاوبوونەوەی سوو خواردن:

پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرمووێت:﴿ **لياتين على الناس زمان لايبقى منهم أحد إلا أكل الربا فمن لم يأكل اصا بة من غبار﴾**[٦٥]واتە: ڕۆژێك دێت کەس نامێنێت سووی نەخواردبێت ئەوەش کەسووی نەخواردبێ پریشکی بەرکەوتووە یان تۆزی سووی لێ نیشتووە،بەراستی ئەوەش موعجیزەیەکی زۆر گەورەیە ،چونکە لەسەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ) سووخواردن هەبووە بەڵام بەهۆی ئەوەی کەئیسلام جەنگێکی گەورەی بەرپاکرد دژی سوو خۆری وحەرامی کرد، باشە کێ دەڵێ سەرهەڵدەداتەوە ؟ باشە ئەگەر سەریشی هەڵدایەوە چۆن ئاوا زۆر بڵاو دەبێتەوەو هەموو کەس دەگرێتەوە؟ ئەگەر

---

[٦٤] (حديث صحيح :أخرجه البخاري والمسلم)

[٦٥] (حديث صحيح:رواه ابن ماجه )

سەیری ئەم سەردەمەی خۆمان بکەین ڕاستێتی ئەم فەرموودەیە بە چاکی دەبینین ئەوەتا کاروباری بانقەکان لەسەر سووخواردن بەندە و خەڵکانێکی زۆر کە ترسی خوای گەورە لە دڵیاندا نیە سڵ لە سووخواردن ناکەنەوە و زۆر کەسیش ئەگەر ڕاستەو خۆ سوو نەخوات پرپیشکی بەردەکەوێت ....

## موعجیزەی (٧٠) هەواڵدانی پێغەمبەر (ﷺ) بەوەی کە شوانەوێڵەو پێخواسەکان دەبنە خاوەنی کۆشك و تەلار :

جیبریل پرسیاری کرد لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە بارەی هاتنی کاتی قیامەت ، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی : پرسیار لێکراو زاناتر نیە لە پرسیارکەر لەبارەی ئەو ڕۆژەوە ، جیبریل : فەرمووی : هەواڵم بدەرێ لە نیشا نەکانی : فەرمووی : دەبینی ڕووت و قوت و پێخواس و شوانەوێڵە بینای بەرز بەرز دروست دەکەن و دەبنە خاوەنی کۆشك و تەلار[٦٦] هەزاران درووود بۆ گیانی پاکی ئەو پێغەمبەرە ڕاستگۆیە چۆنی فەرمووە پێش زیاتر لە ١٤ سەدە ئێستا ئەوە زۆر بە ئاشکرا دیارەو هەیە ......

## موعجیزەی (٧١) هەواڵدانی لە بارەی فرۆشتنی ئاین بە کەل وپەلی دنیا :

پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرمووێ : بادروا بالأعمال فتناً كقطع الليل المظلم ، يصبح الرجل مؤمنا ويمسي كافراً ، أو يمسي مؤمناً و يصبح كافراً ، يبيع دينه بعرض من الدنيا [٦٧]

---

[٦٦] ( صحيح : اخرجه البخاري ( ٥٠ ) ومسلم ( ٨،٩،١٠ ) .

[٦٧] ( صحيح : اخرجه مسلم ( ١١٨ ) .

واتە : پیشبڕکێ بکەن بۆ کردەوەی چاکە چونکە لەوەو دوا فتینەو ئاژاوە پەیدا دەبن وەك پارچەیەك لەشەوی تاریك ، پیاو هەیە بەیانی ئیماندارە ، ئێوارە کافربووە ، هەیە ئێوارە ئیماندارە بەیانی کافر بووە ، لەبەر ئەوەی دینەکەی خۆی بە کەل و پەلی دنیا دەفرۆشێ ، بەڕاستی هەروەك چۆن پێغەمبەری خوا فەرموویەتی : ئەوەش بە تەواوی هاتۆتە دی ،کەسی وا هەیە خۆی بەکەسێکی زانا دەزانێ لەجیاتی ئەوەی ڕێزی خۆی ڕابگرێ و نەخەڵەتێ کەچی بە فاك و فیکی کەسانێکی دوور لە دین ولە خوا نەترس دەخەڵەتێ و لە پێناو دەستکەوتنی چەند دینارێك ئاینەکەی خۆی دەدۆڕێنێ و بەشان و باڵی ستەمکارو ملهوران هەڵدەڵێ و خۆی تووشی ڕق وتووڕەیی خوای پەروەردگار دەکات و ئیمانەکەی لە دەست دەچێ ......

## موعجیزەی (٧٢) هەواڵدانی لەبارەی پەیدابوونی پۆلیسی خراپ و ستەمکار:

پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) دەفەرمووێ : وعن أبي أمامة –رضى الله عنه – أن النبي ( ﷺ ) قال (سيكون في أخر الزمان شرطة يغدون في غضب الله ويروحون في سخط الله )[٦٨] واتە : لە ئەبی ئومامەوە – خوای لێ ڕازی بێ – دەڵێ : پێغەمبەر ( ﷺ ) فەرمووی : لە ئاخیری زەماندا پۆلیسانێك پەیدا دەبن بەیانی دەکەنەوە لە کاتێکدا کە خوای گەورە غەزەبی لێ گرتوون ، وە ئێوارە دەکەنەوە لەناو تووڕەبوونی خوادا واتە : خوای گەورە لێیان تووڕەیە ، هەزاران درورد بۆ گیانی پاکی ئەو پێغەمبەرە پایەدارە بە ڕاستی هەرچی کە فەرمویەتی : هەمووی تەواوە و دەقاو دەق هاتۆتە دی خوای گەورە لە بارەی پێغەمبەرەکەی خۆی لە قورئاندا

---

[٦٨] ( حديث صحيح : انظر صحيح الجامع ( ٣٦٦٦ ) .

فەرموویەتی : (وما ینطق عن الهوی ان هو الا وحی یوحی ) النجم ٣-٤ واتە : لە هەوا و هەوەسەوە قسەناکات کە قورئان دەخوێنێت هەرچی دەیڵێ قورئانە و سروشت دەکرێ بۆی ....

## موعجیزەی (٧٣) هەواڵدانی لە بارەی ڕۆیشتن بە ناو مزگەوتدا و نوێژ تیایدا نەکردنی :

عن ابن مسعود – رضي الله عنه- ان النبي (ﷺ) قال : من أشراط الساعة ان يمر الرجل في المسجد لا يصلي فيه ركعتين وان لايسلم الرجال الا على من يعرف [٦٩] واتە : لە نیشانەکانی هاتنی قیامەت ئەوەیە ، کە پیاو بە ناو مزگەوتدا دەڕوات دووڕکات نوێژی تیادا ناکات ، وەپیاو سەلام تەنها لە کەسێك دەکات کە بیناسێ ئەوەی کە نایناسێ سەلامی لێ ناکات ، بەڵێ خوێنەری بەڕێز ئێستا ئەوە زۆر بەئاشکرا دەبینرێ کەسی واهەیە دێتە ناو مزگەوت بەلاّم دووڕکات نوێژی تیادا ناکات ، وەهەروەها چەندەها خەڵك هەیە ئەگەر کەسێك نەناسێ هەرگیز ئامادە نیە سەلامی لێبکات ......

## موعجیزەی (٧٤) هەواڵدانی لەبارەی نزیك بوونەوەی زەمان و کەمی بەرەکەت لەکاتدا :

عن أنس بن مالك – رضى الله عنه- أن النبي (ﷺ) قال : لا تقوم الساعة حتى يتقارب الزمان فتكون السنة كالشهر ، والشهر كالجمعة ، وتكون الجمعة كاليوم ، ويكون اليوم

[٦٩] ( صحيح (انظر حديث رقم (٥٨٩٦) في صحيح الجامع ) .

كالساعة كالضمرة بالنار ) [٧٠]واتە : لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە –خوای لێ ڕازی بێ– لە پێغەمبەرەوە ( صلى الله عليه وسلم ) دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی قیامەت هەڵناستێ هەتا زەمانە نزیك بوونەوە بە خۆیەوە نەبینێ وای لێ دێ ساڵێك وەك مانگێکی لێ دێ واتە : لە ڕووی تێپەڕیندا ، وە مانگێك وەك جومعەیەکی لێ دێ ، وە جومعە وەك ڕۆژێکی لێ دێ ، وە ڕۆژێکیش وەك سەعاتێکی لێ دێ وەزانایان دەربارەی ئەو فەرمووده پیرۆزەی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ئاوا دەڵێن : مەبەست لێی زوو تێپەڕینی کاتە ، کەمبوونەوەی بەرەکەتە تیایدا وەکەم بوونەوەی دووری ڕێگاکانە بە هۆی پێشکەوتنی کەل و پەل و هۆکارەکانی گواستنەوەوە .... بە ڕاستی موعجیزەیەکی گەورەیە هەزاران دروود بۆ گیانی پاکی ئەو پێغەمبەر پایەدارە ( ﷺ ) .

## موعجیزەی (٧٥) هەواڵدانی بەوەی کە ئەبوبەکر وعومەر دەبنە جێنشین:

بە ڕیوایەتی صحیح چەسپاوە و دەرکەوتووە کە چەندین جار پێغەمبەر ( ﷺ ) فەرمویەتی : ( اقتدوا باللذ ين من بعدي أبي بكر وعمر ) صحيح : رواه الترمذي وابن ماجه والحاكم وأحمد والبيهقي واتە: لە پاش خۆم شوێن ئەودوانە بکەون کەلە دوای من دێن ،کە ئەبوبەکر و عومەرن واتە : هەواڵی ئەوەی داوە کە ئەم دوانە دوای خۆی دەمێنن و دەبن بەجێنشین و بە چەشنێك کە خوای گەورە پێی ڕازی بێت ، ئەرکی جێنشینی ئەنجام دەدەن و ،ئەبوبەکر ماوەیەکی کەم جێنشین دەبێت ، بەلآم عومەر ماوەیەکی زیاتر چەندین فتوحاتی زۆریش دەکات .

---

[٧٠] ( صحيح انظر الحديث رقم ( ٧٤٢٢ ) في صحيح الجامع ).

## موعجیزەی (٧٦) هەواڵدانی بەوەی کە خەلافەت لە دوای خۆی سی ساڵ بەردەوام دەبێت پاشان دەبێتە بەپاشایەتی یەکی گەزندە :

لە فەرموودەی صحیح دا هاتووە پێغەمبەر ( ﷺ ) هەواڵی داوە کە خەلافەت لە دوای خۆی سی ساڵ بەردەوام دەبێت ، پاشان دەبێت ، بە پاشایەتی یەکی گەزندە ، رواه أحمد والترمذي والدارمي و أبو يعلى وابن حبان . وەهەروەها فەرموویەتی (وان هذا الامر بدأ نبوة ورحمة ، ثم يكون رحمة وخلافة ، ثم يكون ملكاً عضوضاً ، ثم يكون عتواً وجبروتاً وفساداً في الأمة ) صحيح: رواه أحمد والبزار والطبراني في الأوسط بەوەش ماوەی جێنشینی خەلافەتی ڕاشیدی بە سێ ساڵ دەستنیشان کرد ، کە بەشەش مانگەکەی خەلافەتی حەسەنی کوڕی عەلی – خوالێیان ڕازی بێ هەر سێ ساڵەکە پڕ دەبێتەوە ،ئینجا پادشایەتی و ستەمکاری و فەساد لەناو نەتەوەی ئیسلامدا یەك لەدوای یەك دێن پەیدا دەبن هەر بەو جۆرەش هاتەدی کە ئەو فەرموویەتی .....

## موعجیزەی (٧٧) فەرمووی بازرگانیەکەت قازانجی کرد :

حاکم لە عیکریمەوە دەگێڕێتەوە وە دەفەرموێت : کاتی سوهەیب کۆچی کرد لە مەککەوە بۆ مەدینە بێ باوەڕانی مەککە شوێنی کەوتن ئەویش لەوەی تیرەکانی تێدا بوو چل تیری دەرهێناو وتی : سوێند بەخوا ناگەن بەمن هەتا هەر یەکەتان تیرێك لەم تیرانەی لێ نەدەم پاشان بەشمشێر کەم دەجەنگم لەگەڵتانداو ئێوەش دەزانن من چۆن پیاوێکم لەشەڕدا ، وە من

لەمەککەدا سامانەکەم لە دوو دەفردا بەجێ هێشتووە هەردووکیان بۆئێوە ئەگەر ڕێگرم نەبن لە ڕۆیشتنم بۆ مەدینەو ئەوانیش ڕێگەیان پێدا جا ئەم ئایەتە دابەزی بۆ سەر پێغەمبەر (ﷺ ) کە دەفەرمووێ: ( ومن الناس من يشري نفسه ابتغاء مرضات الله ) جاکاتێ گەیشتە مەدینەو پێغەمبەر (ﷺ ) بینی فەرمووی ئەبوو یەحیا بازرگانیەکەت قازانجی کرد پاشان پێغەمبەر (ﷺ ) ئایەتەکەی بۆ خوێندەوە وەهەروەها کاتێك پێغەمبەر (ﷺ ) سوهەیبی بینی فەرمووی ئەی ئەبوو یەحیا بازرگانیەکەت قازانجی کرد سێ جار وای فەرموو : سوهەیب دەڵێ : وتم : ئەی پێغەمبەری خوا هیچ کەسێك پێشم نەکەوتووە بۆخزمەتت هیچ کەسێکیش هەواڵی پێ نەداوی تەنها جبریل -سەلامی خوای لێ بێ- هەواڵی پێ داوی [٧١]

## موعجیزەی (٧٨) هەواڵ دانێکی ڕاست ودرووست لەحەجیماڵئاوایدا:

لە جابرەوە -خوای لێ ڕازی بێ- دەڵێ : پێغەمبەرم بینی (ﷺ ) بەردی پێ بوو شەیتانی پێ رەجم دەکرد لە ڕۆژی جەژنی قوربانندا دەی فەرموو : کاروباری حەج و مەناسیکەکانی لەمن وەرگرن وفێربن ، چونکە نازانم لەوەیە دوای ئەو حەجە ئیتر جارێکی تر نەگەڕێمەوە بۆ ئەنجامدانی فەریزەی حەج [٧٢] لەو فەرموودە یەدا هەواڵدانی غەیبی تیایدایە ئەویش وەفاتی پێغەمبەر بوو (ﷺ ) پێش هاتنەوەی وادەی حەجی داهاتوو ئەوەش دەقاو دەق هاتەدی وە پێغەمبەری خوا (ﷺ ) ڕاستی فەرموو خوای گەورە لەبارەی پێغەمبەرەکەی

---

[٧١] ( حديث صحيح واخرجه البيهقي في الدلائل (٢/ ٢٤٥ ، ٢٤٦ ) بلفظه .

[٧٢] ( حديث صحيح رواه مسلم ) .

فەرموویەتی (وما ینطق عن الهوی ان هو الا وحی یوحی) النجم ٣-٤ واتە: لەهەواو هەوەسەوە قسە ناکات کەقورئان دەخوێنێت هەرچی دەیڵێ قورئانە و سرووش دەکرێ بۆی .

## موعجیزەی(٧٩)هەواڵدانی لەبارەی چارەنووسی عومەیری کوڕی حومام:

ئەنەسی کوڕی مالیك –خوای لێ ڕازی بێ – دەڵێ : پێغەمبەری خوا (ﷺ) (بسیسة) ی بەهەوالگری نارد تاسەیربکات بزانێ حوشترە بارهەڵگرەکانی ئەبوسوفیان چیان بەسەر هاتووە ، هاتەوەو ماڵەکە کەسێکی تری تێدا نەبوو جگە لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) (بسیسة) هەواڵەکەی گەیاند ، پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕۆیشتە دەرەوە و کەوتە ئاخاوتن و فەرموو : (ئێمە داخوازیەکمان هەیە و بۆی دەچین هەرکەسێ ولاغەکەی ئامادەیە با لەگەڵمان سواربێ ) هەندێ کەس داوای مۆڵەتیان لێکرد تا بچن لەسەرووی مەدینەوە ولاغەکانیان بهێننەوە فەرمووی : (نەخێر با تەنها کەسێ بێت کە ولاغەکەی ئامادەیە ) پێغەمبەری خوا (ﷺ) و هاوەڵانی ڕۆیشتن و لە پێش گەیشتنی بێباوەڕان گەیشتنە بەدر دواتر بێباوەڕان هاتن پێغەمبەری خوا (ﷺ فەرمووی : (کەس بۆ هیچ دەست بەکار نەبێ تا من پێی نەڵێم ) ئینجا بێباوەڕان نزیك کەوتنەوە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی : (هەستن بۆ دەست خستنی ئەو بەهەشتەی کە پانتاییەکەی بەقەد ئاسمانەکان و زەوی یە ) ئەنەس وتی : عومەیری کوڕی حومامی ئەنصاری – خوای لێ ڕازی بێ – دەیوت : بەخ بەخ ، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی : (چی وات لێدەکات بڵێیت بەخ بەخ ) وتی : بەخوا ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) تەنها ئەوە وای لێکردم کە حەزدەکەم شایستەی ئەو بەهەشتە بم فەرمووی : (تۆ لەخەڵکی

بەهەشتیت) ئینجا چەند دنکە خورمایەکی لە تیرخانەکەی دەرهێناو کەوتە خواردنیان پاشان وتی :

ئەگەر من بژیم تا ئەم چەند خورمایە دەخۆم بەڕاستی ئەوە ژینێکی دوورو درێژە ، ئەنەس وتی : هەموو ئەو خورمایانەی کە پێی بوون فڕێی دان پاشان جەنگا لەگەڵ بێباوەڕان دا هەتا شەهید کرا[٧٢]

## موعجیزەی (٨٠) هەواڵدانی پێغەمبەر (ﷺ) لەبارەی چارەنووسی کافرە موشریکەکان لە غەزای بەدردا :

ئەبو تەلحە -خوای لێ ڕازی بێ- وتی : پێغەمبەر (ﷺ) لە ڕۆژی بەدردا ، فەرمانی فەرموو لاشەی بیست و چوار کەسیان لەگەورە پیاوە کافرەکانی قوڕەیش ، کەلە بەدردا کوژرابوون ، فڕێ دایە ناو بیرێ لە بیرەکانی بەدرەوە کە بەبەرد هەڵچنرابوون ، بەڕاستی تابلێی بیرێکی پیس و چەپەڵ بوو ، پێغەمبەر (ﷺ) دەستوری وابوو کەخوا سەری دەخست بەسەر هۆزێکدا سێ شەو لەو مەیدانەدا لەدەشتایی بەرماڵان دەمایەوە لەغەزای بەدریش دا لەڕۆژی سێیەمی زاڵبوونی دا ، فەرمانی فەرموو وشترەکەیان بۆ کۆپان کرد ، ئەوسا سواری بوو و ڕۆیشت ویارانی شوێنی کەوتن و وتیان : لەوەیە بۆکارێکی تاییەتی خۆی بچێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) سواربوو ، ڕۆیشت هەتا چووە سەرلێواری بیرەکەو لەوێ ڕاوەستا ودەستی کرد بەبانگ کردنی کافرە کوژراوەکانی ناو بیرەکەو یەکەیەکە ناوی خۆیان و بەناوی باوکیانەوە بانگی دەکردن ودەیفەرموو : (ئەی فیساری کوڕی فیسار ئەی ئەوەو ئەی ئەوە پەشیمانیتان

---

[٧٢] (پوختەی صحیحی موسلیم لا پەڕە ٥٦٤ ) .

حاسڵ کردو ئێستا خۆزگە دەخوازن کە ئەو پەندەتان بەخۆتان نەدا بایە ، وەلە دنیادا موسڵمان بوونایەو لەفەرمانی خوای گەورەو پێغەمبەرەکەی دەرنەچوونایەو، ئەو ڕۆژە ڕەشەتان بەسەر خۆتان نەهێنا بایە ، دەی بزانن ئەوا ئێمە لەسایەی خوای گەورەوە بەئاواتی خۆمان گەیشتین و ئەو مژدەو بەڵێنەی کە خوای خۆمان وادەی پێ دابووین دەستمان کەوت و بەچاوی خۆمان دیمان ، دیارە کە ئێوەش بەتۆڵەی سەختی کاری بەدی خۆتان گەیشتوون و ئەو هەڕەشەو ئێش وئازارەی کە خوا وادەی ئەوەی پێتان دابووی بە چاوی خۆتان بینیتان ، عومەر –خوای لێ ڕازی بێ – وتی : قسەی چی لەگەڵ لاشەی بێ گیاندا دەکەی ؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی : بەو خوایەی کەگیانی منی لەدەستدایە ،ئەوانیش وەك ئێوە ئاوا گوێیان لەم قسانەی منە ، بەلاَم ئەوەندە هەیە کەناتوانن وەلاَم بدەنەوە[٧٤]

## موعجیزەی (٨١) هەواڵ دانی پێغەمبەر (ﷺ) لەبارەی شەهید بوونی خوبەیبی کوڕی عەدیی :

لە مانگی صەفەری ساڵی چوارەم دا کۆمەڵێك لە هۆزی عەضە ل و قارە هاتنە مەدینە خزمەتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) و خۆیان بە موسڵمان خستە پێش چاو وتیان : ئەی پێغەمبەری خوا خەڵك لەلای ئێمە موسڵمان بووە ، جا چەند کەسێك لە هاوەلاَنت بنێرە لەگەڵمان تا لەدین شارەزامان بکەن و قورئانمان پێ بڵێن و شەریعەتی ئیسلاممان فێر بکەن ، بۆ ئەم داوایە پێغەمبەری خوا (ﷺ) نۆ هاوەڵی هەڵ بژارد و وەك لەلای بوخاری هاتووە و صەحیح تریشە ، مورثیدی کوڕی ئەبو مورثیدی غەنەویی کردە سەرۆکیان ، کەیەکێ لەو هاوەلاَنەش عاصیمی کوڕی ثابیتی کوڕی ئەبوئەفلەح بوو، کەلەتیر هاویشتن دا پاڵەوانێکی

---

[٧٤] (اخرجه مسلم في الجنة وصفة نعيمها واهلها ، باب : عرض مقعد الميت من الجنة والنار عليه رقم : ٢٨٧٥ ) .

بەناوبانگ بوو ، لەڕۆژی ئوحودیش دا یەکێ لە ئەرکانی جەنگی سوپای ئیسلام بوو و بەتیری ئەویش دوان لە هەڵ گرانی ئالای قورەیش لەو جەنگەدا کوژرابوون لە ڕیواتێکی تردا دەڵێ : عاصیم سەرۆکی هاوەڵەکان بووە . ئەو دەستە قورئان خوێنە لەگەڵ ئەو کۆمەڵە ناپاکەدا بەرەو مەککە کەوتنە ڕێ ، هەتا گەیشتنە سەر ئاوی رەجیع کەناوچەی هوذەیلە ، لەنێوان عوسفان و مەککەدا ، موسڵمانەکان لەسەر ئاوەکەدا لایان داو هیچ خەمیان نەبوو ، کەچی مونافیقەکان ناپاکیان لەگەڵیان دا کردن ، یەك لەدوای یەك خۆیان دزیەوە و بەرەو ڕووی هۆزی هوذەیل چوون و هاواریان لێ کردن تابێنە سەر موسڵمانەکان ، ئەوەبوو دووصەد پیاوێکیان هاتن و هێرشیان کردە سەر موسڵمانەکان ، موسڵمانەکان کەسەیریان کرد ، چوار دەوریان بەپیاوی شمشێر بەدەست گیراوە خێرا هەردە موسڵمانەکە دەستیان دایە شمشێرەکانیان تابەرگری لە خۆیان بکەن جەنگ گەرم بوو کە کافران دەست و شمشێری موسڵمانەکانیان بینی زانیان چاریان ناکەن ، بۆیە کەوتنە فڕوفێڵ و داوای وەستانی جەنگیان کرد و وتیان : ئێمە بەخوا نامانەوێ بتان کوژین عەهدو پەیمانی خوا بێت کەناتان کوژین موسڵمانەکان کە ئەمەیان بیست دووڕایان هەبوو بەشی زۆریان دەریان بڕیی کەبەهیچ شێوەیەك بە بەڵێن و پەیمانی کافر بڕوا ناکەن حەوتیان ئەوە ڕایان بوو ، بۆیە هەڵمەتیان داو دەستیان بەکوشتاری کافران کرد ، بەڵام کافران یەکجار زۆر بوون هێرشیان کردە سەر ئەو بەرێزەپاك و خاوێنانە و هەموویان شەهید کردن بەڵام سیانەکەی تر کەبینیان بەرگری ئەوان کەڵکێکی نیەو هەر ئەیان کوژن ، بڕوایان بەبەڵێنەکەیان کردو خۆیان بەدەستەوە دا ئەو سیانەش زەیدی کوڕی دەثینە و، خوبەیبی کوڕی عەدیی و عەبدوڵلای کوڕی طاریق بوون خۆیان بەدەستەوەدا ، ئەو ناپاکانە قۆڵ بەستیان کردن و بەپەلە بەرەو مەککە دایاننەبەر ، تا لەوێ بیان فرۆشن بە کافرانی مەککە ، کەدەیان زانی قورەیش یەکجار شادمان دەبن هاوەڵانیان دەست بکەون ، کە عەبدوڵلای کوڕی طاریق ناپاکی

ئەو بت پەرستانەی بینی خێرا پەشیمانی خۆبەدەستەوەدانەکەی بوومەوە ، کەگەیشتنە ظه هران لەسەر ڕێی مەککە عەبدوڵلاّ دەستی خۆی داماڵی وشمشێرەکەی فڕاندو دەستی دایە جەنگ پت پەرستەکان نەیان وێرا بچنە مەیدانی شەڕە شمشێری عەبدوڵلاّ وە ناچار هەر لەدوورەوە بەردیان تیّ دەگرت ، هەتا شەهیدیان کرد و گیانی سپارد . -خوای لیّ ڕازی بێت- پاشان هوذەیل خوبەیب و زەیدی یان بردن بۆمەککە جالەبەر ئەوەی مەککەو مەدینە ناکۆك بوون سەردارانی قوڕەیش ئەم کارەی هوذەیلیان زۆر بەدلّ بوو کەوتنە سەرو خوار لەگەلّ هۆزەیل دا تا لەسەر نرخەکەیان ڕێك بکەون و بەکوشتنیان تۆڵەی کوژراوەکانیان وەربگرنەوە سەرەنجام قوڕەیش دیل بەدیل لەگەلّ هوذەیل ڕێککەوتن خوبەیب و زەیدی یان دایە دەست قوڕەیش جا ئیبن سەعد باسی ئەوەی کردووە کە صەفوانی کوڕی ئومەییەی جوممەحیی زەیدی کڕیوە ، تا لە بری ئومەییەی کوڕی خەلەفی باوکی دا ، کە موسڵمانەکان لەجەنگی بەدردا کوشتبویان بی کوژێتەوە ، حوجەیری کوڕی ئەبو ئیهابیش خوبەیبی کڕی و دایە دەست عوقبەی کوڕی حاریثی خوشکەزای تا لەبریی باوکی دا کەموسڵمانەکان کوشتبویان بی کوژێتەوە ئەو ڕووداوە لە مانگەکانی حەرام دا ڕووی دا ، بۆیە دانیشتوانی مەککە جیّ بەجیّ کردنی لە سێدارەدانی ئەم دوو هاوەڵەیان دواخست ، تا ئەو مانگانە بەسەر بچن و پاشان بەشێوەیەکی دڕندانە شەهیدیان کردن لەو ماوەیەدا خوبەیب لە ماڵێکی ئەوەی حارث دا بەند کرابوو ، کەماوەی شەهیدکردنەکەی نزیك بوویەوە لە کەنیزەکێکی ماڵەکە گوێزانێکی وەرگرت تا خۆی پاك بکاتەوە ، ئیتر کەنیزەکەکە بەشتی ترەوە پەشۆکا و منداڵێکی ساوای ماڵی ئاغاکەی لەیاد چوو و منداڵەکەش ڕۆیشت بۆلای خوبەیب و ئەویش منداڵەکەی لەسەر ڕانی خۆی دانا کەکەنیزەکەکە ئەوەی دی داچڵکا و بەترس و لەرزێکەوە لە دڵی خۆیدا وتی : بەخوا کابرا بەکوشتنی منداڵەکە تۆڵەی خۆی سەند خوبەیب هەستی بەترس و پەشۆکانی ئافرەتەکە و ئەوەش کەبەدڵی داهات کرد ، بۆیە پێی وت : ئەترسیت بی کوژم ؟ انشاءالله

شتی وەها ناکەم ، کەنیزەکەکە دوای ئەوەی موسڵمان بوو بوو باسی ئەکرد ، هەرگیز دیلی چاکی وەك خوبەیبم نەدیوە ، چاوم لێ بووە کەلە هێشووە ترێی خواردووە و ئەو ڕۆژەش لە مەککەدا هیچ میوەیەك نەبووە و کۆت و زەنجیریش لە دەست و پێی دا بووە و ئەوەش ڕزقێك بوو کە خوا پێی بەخشی بوو قورەیش هەروەك لەمانگە حەرامەکان دا خوێنیان نە ئەڕێژا ، هەروەها لەناوچەی حەرەمی مەککیش خوێنیان نەئەڕێژا بۆیە هەردوو هاوەڵەکەیان لەحەرەم بردنە دەرەوە و لە ناوچەی تەنعیم شەهیدیان کردن کاتێك کەهەردوو دیلەکە بەرەو ئەو شوێنە ئەبران ، زۆرێك لە دانیشتوانی مەککە لە ژن و پیاو و منداڵ وبەندە ، هەتا ئەبوسوفیانی سەرداری مەککە ، دوایان کەوتبوون ، بۆیە لەم هەڵوێستەدا پێویست بوو هەردوو هاوەڵە مەزنەکە ، ئەوپەڕی ئازایەتی و چاونەترسی بنوێنن ، تا ئاستی سەربازی موسڵمان بە بەرزو بڵند بێتە بەرچاوی خەڵکێك کە دوژمنی دینەکەیانن خوا پاداشتیان بداتەوە هەردوکیان نمونەی پاڵەوانی بە جەرگ بوون ئەوە بوو صەفوان زەیدی دایە دەست بەندەیەکی کەناوی ( نسطاس ) بوو فەرمانی بەسەردا دا کە بی کوژێ ، کاتێك کەزەیدی کوڕی دەثینە هێنرایە پێشەوە تا بی کوژن ، بۆ تاقیکردنەوەی ئەبوسوفیان لێی پرسی : ئەی زەید بۆ خوا لێت ئەپرسم ، ئایا پێت خۆش ئەبوو ئێستا موحەممەد لە جێی تۆدا بوایە ، بدرایە لەملی و تۆش لەناوماڵ و منداڵی خۆت دا بوویتایە ؟ زەید – خوای لێ ڕازی بێ –وەڵامی دایەوە : نابەخوا پێم خۆش نیە ئێستە موحەممەد لەو شوێنەی خۆیدا دڕکێکی پیابچێ و ئازاری بدات و منیش لەناوکەس و کاری خۆم دا دانیشتبم ، ئەبوسوفیان وتی : ئەم دیوە هیچ کەس کەسێکی خۆش بووێ وەك هاوەڵانی موحەممەد موحەممەدیان خۆش ئەوێ بەر لەوەی ( نسطاس ) بێتە پێشەوە بۆ شەهید کردنی زەید ، بت پەرستەکان دەستیان کرد بەئازاردانی بەستیانەوە و دەستیان کرد بە تیر هاویشتن بۆی ، بەلام لەشوێنی وەهایان ئەئەدا کەبی کوژێ ، بەو هیوایەی بەڵکو پەشیمان بێتەوە و لەدین وەربگەڕێ ، کەچی تائەهات ئیمانی

دامەزراو تر دەبوو وزیاتر خۆی تەسلیمی خوای گەورە ئەکرد ، بەڵام خوبەیبی شەهید ، قورەیش ئاهەنگێکی یەکجار گەورەیان بۆ شەهید کردنی سازدا ، خەڵکێکی زۆر هاتبووە تەماشای پارچە پارچەکردنی لاشەی مرۆڤی ئیمان دار ، پێش ئەوەی بی کوژن بەسێدارەوە هەڵیان واسی ، دەستیان کرد بەهەڕەشەکردن لێی بەڵکو واز لە دینەکەی بهێنێ ، بەڵێنیان پێ دا کەئەگەر لەدینی موحەممەد پاشگەز بێتەوە ، ئازادی بکەن و لەکوشتن ڕزگاری ببێ ، جا کەوازی نەئەهێنا بە ڕم لێیان دەدا ، ئەویش – خوای لێی ڕازی بێ – وەك ئیماندارێکی ڕاستگۆ کەشەهیدبوونی بەلاوە شیرین بێ دەی وت : کوشتنی من لە پێناو خوادا کارێکی یەکجار کەمە ، شایانی باسە کەخوبەیب پێش هەڵواسینی داوای لە کافرانی قورەیش کرد کەمۆڵەتی بدەن دوو رەکعەت نوێژ بۆ خوا بەجێ بهێنێ ، ئەونیش ڕێگەیان دا ئەویش – خوای لێ ڕازی بێ - دوو ڕکاتی بەجوانی و بەخشووعەوە بۆ خوا بەجێ هێنا ، وەك بڵێ : خوای پەروەردگارم واهاتم بۆ خزمەتت خوایە هەر تۆم لێ ڕازی بێ ئیتر هیچی ترم ناوێ ، خوایە بەوپەڕی زەلیلی یەوە لەدەرگای تۆدا وەستاوم نائومێدم نەکەی لە ڕەحمەتی خۆت بێ بەشم نەکەی خوایە ، کەلێ بوویەوە ، ڕووی لە موشریکەکان کردو وتی : بەخوا لەبەر ئەوە نەبوایە کە ئەترسم وابزانن لەترسی مردن درێژە بە نوێژەکەم ئەدەم نوێژی زۆرم بەجێ ئەهێنا ئیبن ئیسحاق ووتوویەتی : خوبەیبی کوری عەدیی یەکەم کەسێکە کەبەجێهێنانی ئەو دوو ڕکاتەی لەکاتی کوشتن دا کردە سوننەت ، کاتێك کەخوبەیب بەسەر سێدارەکەوە هەڵواسرا بوو لە خوای گەورە پاڕایەوە و وتی : خوایە هیچ کەس لێرە نیە هەتا سەلامم بە پێغەمبەرکەت ڕابگەیەنێ ، خۆت سەلامی منی پێ ڕابگەیەنەو ، پێشی ڕابگەیەنە کەچیمان پێ ئەکرێ ، خوای گەورە بەسۆزو شەفەقەتی فراوانی دووعای شەهیدی ستەم لێکراوی گیرا کردو ، پێغەمبەری دەربارەی خوبەیب ئاگادار کرد کەچی پێ ئەکرێ ، ئوسامە –خوای لێ ڕازی بێ – گێڕاویەتەوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەو ڕۆژەدا کە خوبەیب لە سێدارەدرا بوو لەناو

هاوەڵەکانی دا دانیشتبوو و ئەو حاڵەتەی کەلەکاتی وەحی دا بەسەردا ئەهات ، بەسەری هات و گوێمان لێ بوو ئەی فەرموو : (وعلیه السلام ورحمةالله وبرکاته) پاشان فەرمووی : (هذا جبریل یقرئني السلام خبیب قتلته قریش) دوای وەڵامدانەوەی سەلامەکە فەرمووی : ئەوە جبریلە هاتووە و سەلامم لێ ئەکات قورەیش خوبەیبیان کوشتووە [٧٥] پاشان خوبەیب لەخوا پاڕایەوە تا قورەیش لەناوبەرێت و ئەی وت : (اللهم احصهم عدداً، واقتلهم بدداً ، ولاتغادر منهم احداً) .

## موعجیزەی (٨٢) هەواڵدانی پێغەمبەر (ﷺ) لەبارەی چارەنوسی عەبدوڵڵای کوڕی عمروی کوڕی حرام :

جابیری کوڕی عەبدوڵڵا-خوا لێ ی ڕازی بێ – دەڵێ : باوکم لە ڕۆژی ئوحوددا پێکرا، جلەکەم لەسەر ڕوومەتی لادەبرد و دەگریام ئەهیان لێ دەکردم لە گریان، پێغەمبەر (ﷺ) نەهی لێ نەکردم، دەڵێ: فاتیمەی کچی عمرو بۆی دەگریا ، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی : بۆ دەگریت یان بۆی ناگریت لەوکاتەوە فریشتەکان سێبەریان بۆدەکرد ، بە باڵەکانیان هەتا هەڵتان گرت [٧٦] هەروەها جابیر -خوای لێ ڕازی بێ—وتی : پێغەمبەرم (ﷺ) پێ گەیشت پێی فەرمووم : ئەی جابیر دەتبینم قوپاویت چیتە ؟ جابیر دەڵێ : وتم ئەی پێغەمبەری خوا کەڕۆژی ئوحود باوکم شەهید بوو ، خێزان و قەرزێکی زۆری بەسەردا بەجێ هێشتووم بیر لەوە دەکەمەوە فەرمووی : حەز دەکەی باسی ئەوەت بۆ بکەم کە خوا چەند بەخۆشی پێشوازی لە باوکت کرد ؟ وتم : فەرموو : ئەی پێغەمبەری خوا فەرمووی : هەرگیز خوای گەورە لە پشتی

---

[٧٥] (ژیانی نازیزمان (ﷺ) لاپەڕە ١٢ تا ١٦ .
[٧٦] ( بخاري الجنائز( ١٢٣١)) .

پەردەوە نەبێ قسەی لەگەڵ کەسێ نەکردووە بەڵام باوکتی زیندوو کردەوە و بەبێ پەردەو ڕوویەڕوو ، قسەو گفتوگۆی لەگەڵ دا کرد ، فەرمووی : پێی : ئەی بەندەی خۆم دڵت چی دەخوازێت داوای بکە لێم دەیدەم پێت ئەویش وتی : ئەی پەروەردگارم زیندووم بکەرەوە هەتا دیسانەوە لە پێناوی تۆدا دەکوژرێمەوە پەروەدگاری گەورەو سەروەریش فەرمووی : لەمێژەوە بڕیارەو داوەمە ئەوەی لەم دنیایە دەرچوو جارێکی تر ناگەڕێتەوە بۆ جیهان جابیر وتی : جاخوا ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە ( ولا تحسبن الذين قتلوا في سبيل الله امواتا بل احياء عند ربهم يرزقون ) ال عمران ( ١٦٨ ) [٧٧] واتە : هەرگیز وا گومان مەبەن ئەوانەی کەکوژران لە ڕێی خوادا مردوون نەخێر وانیە بەڵکو ئەوانە زیندوون لای پەروەردگاریان ڕۆزی دەدرێن....

## موعجیزەی (٨٣) هەواڵدانی لەبارەی قسەکردنی ئەبوهورەیرە لەگەڵ شەیتان:

ئەبوهورەیرە – خوای لێ ڕازی بێ – دەڵێت پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) چاودێری کردنی زەکاتی سەرفیترەی ڕەمەزانی خستە ئەستۆی من ، لەشەودا زەلامێك هات بۆ لام سەیر دەکەم بەمشت خەریکە دزە لە خۆراکەکە ئەکات ، منیش گرتم و وتم : بەخوا ئەبێت بتدەمە دەست پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ئەویش وتی : من کابرایەکی ئاتاج و نەدارم و ماڵ و منداڵێکی زۆرم کەوتووە بەسەردا و زۆر پێویستیم پێ یەتی : دەڵێت : ئیتر وازم لێ هێنا بە بەیانیدا پێغەمبەر ( ﷺ ) فەرمووی ئەی ئەبوو هورەیرە ئەسیرەکەی ئەم شەوت چی لێ بەسەر هات ؟ وتم : ئەی پێغەمبەری خوا کابرا سکاڵای ئاتاجی ونەداری ماڵ ومنداڵی زۆری کرد ، منیش

---

[٧٧] ( حديث حسن عند الترمذي ) .

بەزەیم پێدا هاتەوەو وازم لێ هێنا فەرمووی : دەچاك بزانە ئەو درۆی لەگەڵ کردوویت ئەیش گەڕێتەوە منیش زانیم ئەگەڕێتەوە لەبەر ئەوەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی : ئەگەڕێتەوە منیش بەووردی فەرمونم لێ گرت ئەوەندەم زانی هاتەوە دەستی دایەوە خۆراکەکە و دزەی لێ ئەکرد منیش گرتم و وتم : ئەبێ بتبەم بۆ لای پێغەمبەری خوا (ﷺ) وتی لێم گەڕێ من ئاتاج و نەدارم ماڵ منداڵم کەوتووە بەسەرا ئیتر نایەمەوە منیش بەزەیم پێدا هاتەوە و وازم لێ هێنا بەبەیانیدا پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێی وتم : ئەی ئەبوهورەیرە دیلەکەت چی لێ بەسەر هات وتم : ئەی پێغەمبەری خوا سکالای هەژاری و نەداری و منداڵ زۆری خۆی زۆر بۆکردم منیش بەزەییم پێدا هاتەوە و وازم لێ هێنا فەرمووی چاك بزانە کەئەو درۆی لەگەڵ کردوویت و ئەویش ئەگەڕێتەوە منیش بۆجاری سێهەم هەم دیسان خۆمم لێ مەڵاس دایەوە ئەوەندەم نەزانی هاتەوە و دەستی کردەوە بەدزەکردن لە خۆراکەکە منیش گرتم و وتم : ئەتبەم بۆلای پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەمەیش دواهەمین جارەو سێ جار دووبارەت کردەوە و دەشڵێی نایەمەوە هەر درۆدەکەیت و هەر ئەیش گەڕێتەوە وتی : لێم گەڕێ باچەند وشەیەکت فێرکەم کەبەهۆیەوە خوا سوودت پێ دەگەیەنێت وتم : ئەو وشانە چین ؟ وتی : کاتێ چوویت بۆناو جێگەکەت (أیة الکرسی) بخوێنە ئەوە ئیتر بەردەوام لەلایەن خواوە چاودێریت لەسەر ئەبێت و ئەت پارێزێ و شەیتان توخنت ناکەوێت تابەیانی منیش وازم لێ هێنا بەبەیانیدا پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێی وتم : ئەسیرەکەت چی لێ هات وتم : ئەی پێغەمبەری خوا بە بیانووی ئەوەی گوایا چەند وشەیەکم فێردەکات کە بەهۆیەوە خوا سودم پێ دەگەیەنێت ، وازم لێ هێنا فەرمووی : جا ئەوانە چی بوون ؟ وتم : پێی وتم : کاتێ چوویتە ناو جێگا (أیة الکرسی) بخوێنە وەپێشی وتم : بەردەوام لەخواوە چاودێریت لەسەر ئەبێت و شەیتان توخنت ناکەوێت تا رۆژ ئەبێتەوە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی : چاك بزانە ئەو ڕاستی لەگەڵ کردوویت هەرچەندە خۆی درۆزنە دەزانی سێ شەوی ڕەبەقە تۆ لەگەڵ

کێ قسە ئەکەیت ئەی ئەبوهورەیرە وتم : نەخێر فەرمووی : ئەوە شەیتان بوو . پوختەی صەحیحی بوخاری لاپەڕە ٤٥٤ - ٤٥٥

## موعجیزەی (٨٤) هەواڵدانی بەبوونی شەیتان لە ماڵی قەتادەی کوڕی نوعمان دا :

ئیمامی ئەحمەد ئەم فەرموودە صەحیحەی لە ئەبوو سەعیدی خودر یەوە —خوای لێ ڕازی بێ —گێڕاویەتیەوە کە : لەشەوێکی بارانی تاریکدا قەتادەی کوڕی نوعمان نوێژی خەوتنانی لەخزمەتی پێغەمبەر دا (ﷺ) بەجێ هێنا ، پاشان پێغەمبەر (ﷺ) دار عەسایەکی کورتی پێدا فەرمووی بڕۆ ئەم دار عەسایە دەگەز لە پێش خۆتەوە و دەگەزیش لە پشتەوە ڕووناك دەکاتەوە کاتێکیش گەیشتە ماڵەوە شتێکی ڕەش دەبینیت ، ئەوە شەیتانە و هەر بەم دارە لێی بدە تا دەڕواتە دەرەوە ، قەتادەش ڕۆیشت و تا گەیشتە ماڵەوە شتە ڕەشەکەی بینی و بەدارەکەی دەستی لێی دا تاکو ڕۆشتە دەرەوە [٧٨] بەڕاستی موعجیزەیەکی گەورەیە هەزارن دروود بۆ گیانی پاکی پێغەمبەری ئیسلام (ﷺ) .

---

[٧٨] ( رواه أحمد وابن خزيمة والحاكم ، وقال : صحيح الاسناد على شرط الشيخين ولم يخرجاه و وافقه الذهبي ) .

# موعجیزەی (٨٥) هەواڵدانی پێغەمبەر (ﷺ) بەوەی کەفریشتە گوێی لەقورئان خوێندنی ئوسەیدی کوڕی حوضە یر گرتووە :

بوخاری وموسلم دەقەکە هی ئەوە لەئەبو سەعیدی خودریەوە هێناویانە ئوسەیدی کوڕی حوضە یر –خوای لێ ڕازی بێ– لەشەوێکدا لەحەوشەکەی دا قورئانی دەخوێند کەئەسپەکەی هەڵبەزی وکەوتە حیلە هەمدی وایکرد دووبارە وایکرد ئوسەید وتی : ترسام یەحیا بشێلێ بۆیە هەستام بۆلای ئەسپەکە سەیرم کرد شتێ وەك سێبەر لەسەر سەرمە لەئاسمان دا بەرزبویەوە تا ئەمدی بەیانی چووم بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)وتم:ئەی پێغەمبەری خوا من دوێنێ لەتاریکی شەودا لەحەوشەکەم قورئانم دەخوێند

کەئەسپەکەم هەڵبەزی پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی : کوڕی حوزەیر بخوێنە منیش خوێندم هەمدی وایکرد پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی : کوڕی حوزەیر بخوێنە وتی: خوێندم هەمدی هەڵبەزی پێغەمبەر (ﷺ) هەمان شتی وت و منیش لاچووم چونکە یەحیا لێوەی نزیك بوو ترسام بیشێلێت شتێ وەك سێبەرم دی بەسەرمەوە بەرەو ئاسمان بەرز بویەوە تا ئەمدی پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی : ئەوە فریشتە بوو گوێی لێدەگرتیت ئەگەر بتخوێندایە بەیانیت دەکردەوە خەڵکی فریشتەکەیان دەبینی و لێیان دا پۆشراو شاراوە نەدەبوو حاکم بەو شێوەیە بەکورتی هێناویەتی و دەڵێ : لەسەر مەرجی موسلیم صەحیحە تیایدا دەڵێ: لایکردەوە شێوەی چرا گەلی بینی وتی: لەنێوان ئاسمان و زەویدا بوو وتی : ئەی پێغەمبەری خوا نەمتوانی بچم فەرمووی : ئەوە فریشتە بوو دابەزی بۆ قورئان خوێندن ئەگەر تۆ بچوو تیایە

شتی سەرسورهێنەرت دەبینی [٧٩] بەڕاستی ئەوانە موعجیزەی ئەوەندە گەورەن كە دڵنیایی تەواو دەبەخشن بە دڵ و دەروونە ساغەكان سوپاس و ستایش بۆ خوای گەورە و پەروەردگار وە دروود بۆ گیانی پێغەمبەری ئیسلام (ﷺ) .

## موعجیزەی (٨٦) هەواڵدانی لەبارەی شۆردنی حەنزەڵە لایەن فریشتەكان لەجەنگی ئوحوددا :

حەنزە لەگەنجێكی خواناس و سەر ڕاست بوو لەشەوی جەنگی ئوحوددا حەنزە لەیەكەم شەوی زاوایەتی بوو ، هەر ئەو شەوە جەمیلەی كچی ئوبەی كوڕی سەلوولی گواستبووەو ، حەنزە لە پیاوانە بەشداری جەنگی ئوحودی كرد حەنزە لە ئەو پیاوەیە كەناونراوە ( غسیل الملائكة ) چونكە كەشەهیدكرا لەشی گران بوو وبەفەرمانی خوا مەلائیكە شۆردیان كەبەیانی زوو جاڕدرا بۆجیهاد بووكی بەجێ هێشت و دەستی دایە كەرەسەی جەنگ و بێ ئەوەی ماوەی هەبێ خۆی بشوا ، بە پەلە خۆی گەیاندە پێغەمبەری خوا (ﷺ) كەجەنگ دەستی پێكرد حەنزە لەخۆی كرد بەناوی ریزەكان داو گەیشتە ناو جەرگەی مەیدانی جەنگ و گەیشتە لای ئەبوسوفیانی فەرماندەی گشتی سوپای مەككە و هەڵمەتێكی دایەو چوارپەلی ئەسپەكەی قرتاندو ئەبوسوفیان لەسەری كەوتە خوارەوە كە ئەبوسوفیان كەوتە زەوی حەنزە لە هەڵمەتی دا و پەڕی یە سەرسەری و ویستی سەری ببڕێ، بەلام بەفەرمانی خوا ڕۆژی ئەبوسوفیان تەواو نەبوو بوو وئەبوا نەمرێ هەتا ئیمان بهێنێ و پلەی هاوەڵێتی دەست

---

[٧٩] ( لە الترغیب والترهیب ج ٢، ص١٣ ) دا هاتووە ئیبن حبان و تەبەڕانی و بەیهەقی لە ئوسەیدی كوڕی حوزەیرەوە بەهەمان شێوە گێڕانەوەكەی حاكمیان هێناوە وەلە كنز العمال ج٧ ص٧ داهاتووە ، ئەبوو عوبەید لە الفضائل وئەحمەد و بوخاری بە موعەللەقی و نەسائی و جگە لەوانیش بەكورتی لێیانەوە هێناوە تیایدا دەفەرمووێت ( تلك الملائكة دنیت لصوتك ولو قرأت لاصبح الناس حتی ینظروا الیها لاتتواری منهم ) .

بکەوێ ، ئەوەبوو یەکێ لە پیاوەکانی دەوروبەری ئەبوسوفیان کەناوی شەددادی کوڕی ئەسوەد بوو بەنازناوی (ابن شعوب) ناسرا بوو بەپەلە هەڵمەتی دا تا ئەبوسوفیان ڕزگار بکات بەشمشێر حەنزە لەی داگرتەوە و شەهیدی کرد ، دوای شەهیدبوونی حەنزە لەی پاڵەوان پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی : (ان صاحبکم لتغسله الملائکة فاسالوا اهله ماشانه) فەرمووی : مەلائیکە حەنزە لە ئەشۆن ، لەهاوسەرەکەی پرسیار بکەن بزانن هۆی ئەمە چی یە ؟ کە پرسیار لەهاوسەرەکەی کرا ، وتی : کاتێك کەدەنگی جارچی جیهادی بیست بەلەشی گرانەوە کەوتە ڕێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی :(لذلك غسلته الملائکة) فەرمووی : لەبەر ئەوە مەلائیکەت شۆردوویانە [٨٠].

## موعجیزەی (٨٧) هەواڵدانی پێغەمبەر (ﷺ) لەبارەی دابەزینی فریشتەکان لەبەر خاتری سەعدی کوڕی موعاذ :

ئیبن سەعد (ج٣،ص٤٢٧) لەمەحمودەوە هێناویەتی کاتێ باڵی سەعد لە ڕۆژی خەندەق پێکرا باری قورس بوو ، بۆلای ئافرەتێ بردیان کە پێی دەوترا (رفیده) فەرموودەکە بەو شێوە دێنێ تیایدا هاتووە پێغەمبەر (ﷺ) دەرچوو و ئێمەش لەگەڵی دەرچووین خێرا دەچوو تاقایشی نەعلەکانمان پچڕان و عەبای سەرشانمان کەوت ، هاوەڵانی سکاڵای ئەوەیان کرد ئەی پێغەمبەری خوا لە ڕۆیشتندا ماندووبووین ، فەرمووی : (اني اخاف ان تسبقنا الملائکة الیه فتغسله کما غسلت حنظلة) فەرمووی : من دەترسم فریشتەکان پێشمان بکەون بۆی و بیشۆن وەك حەنزەلە یان شۆرد هەروەها (لەج٣ ، ٤٢٣) لەعاصی کوڕی عومەری کوڕی

---

[٨٠] ژیانی ئازیزمان (صلی الله علیه وسلم) بەرگی یەکەم لاپەڕە ٧٥٠-٧٥١ ) .

قەتادەوە هێناویەتی دەڵێت : فریشتەیەك هات بۆلای یان وتی : جبریل (سەلامی خوای لێ بێ) هات بۆلای کاتێ لەخەو هەستا وتی : کام کەس لە ئوممەتت ئەمشەو مرد خەڵکی ئاسمان بەمردنی موژدە بەخش بووین ؟ فەرمووی نازانم بەلاّم سەعد ئێوارە نەخۆش بوو سەعد چی کرد ؟ وتیان ئەی پێغەمبەری خوا مرد وهۆزەکەی هاتن و بردیان بۆ شوێنی خۆیان ، پێغەمبەر (ﷺ) نوێژی بەیانی کرد پاشان لەگەڵ خەڵك چوو و خەڵکیش بە پێ دەچوون تاقایشی نەعلەکانیان دڕاو عەبایان لەشانیان دەکەوت، کەسێ پێی وت : ئەی پێغەمبەری خوا خەڵکی ماندوو بوون ، فەرمووی : (اني اخشي ان تسبقنا اليه الملائكة كما سبقتنا الى حنظلة) فەرمووی : دەترسم فریشتەکان پێشمان بکەون بۆلای وەك بۆ حەنزە لە پێشمان کەوتن.

هەروەها ئیبن سەعد (ج٣ ، ٤٢٨) لەسەلەمەی کوڕی ئەسلەمەوە هێناویەتی دەڵێت من پێغەمبەرم (ﷺ) بینی و لەبەردەرگادا بووین دەمان ویست بەدوایدا بچین پێغەمبەر (ﷺ) چوویە ژوورو کەس لەماڵ دا نەبوو جگە لە سەعد بەکەوتوویی ، بینیم هەنگاوی دەنا ، کەبینینم وەستام و ئاماژەی بۆکردم بوەستە ، منیش وەستام و بەدوای خۆمدا گەڕامەوە ، ماوەیەك دانیشت پاشان دەرچوو ، وتم : ئەی پێغەمبەری خوا ، کەسم نەبینی لەماڵ کەچی هەنگاوت دەنا و ئەملاو ئەولات دەکرد ، فەرمووی : (ماقدرت على مجلس حتى قبض لي ملك من الملائكة أحد جناحية فجلست) واتە : شوێنێکم بەدی نەکرد تایەکێ لەفریشتەکان دووباڵەکەی داخست بۆم و منیش دانیشتم ئینجا فەرمووی : (هنيئالك ابا عمر) سێ جار فەرمووی: پیرۆزت بێ ئەبوعەمر ، هەروەها بەزار لە ئیبن عومەرەوە هێناویەتی : دەڵێت پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی : حەفتا هەزار فریشتە دابەزین بۆ سەعدی کوڕی موعاذ کە پێشتر کەسیان پێیان نەکەوتبووە سەر زەوی کاتێ سەعد خرایە ژێر خاك فەرمووی (سبحان الله)

ئەگەر کەسێ لەگۆڕەوشار ڕزگاری بوایە بەدڵنیاییەوە سەعد لێی دەرباز دەبوو [٨١] هەروەها ئیبن سەعد (ج٣ ، ص٤٣٠) لە ئیبن عومەرەوە –خوایان لێ ڕازی بێ– بەو واتایە هێناویەتی ، ئیبن سەعد ( ج٣، ص٤٢٩) لەسەعدی کوڕی ئیبراهیمەوە هێناویەتی دەڵێت : کاتێ ڕاخەرەکەی سەعد هێنرایە دەر خەڵکی لە دوو ڕوومکان وتیان تەرم یان ڕاخەرەکەی سەعد چەندە سووکە ، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی : بەڕاستی حەفتا هەزار فریشتە دابەزین بەشداری تەرمی سەعد بوون ، کەسیان پێش ئەمڕۆ نەها توونە سەر زەوی وەهەروەها ئیبن سەعد (ج٣ ، ص٤٣٠ ) لەحەسەنەوە هێناویەتی دەڵێت : کاتێ سەعدی کوڕی موعاذ- خوا لێی ڕازی بێ – مرد کەسێکی زەبەلاح بوو ، دووڕوومکان کەلە پشت تەرمەکەیەوە دەچوون دەیان وت : وەك ئەمڕۆ کەسمان هێندە سووك و سادە نەدیوە ، وتیان دەزانن بۆچی؟ لەبەر بڕیاردانی بەرامبەر جولەکەکانی بەنی قورەیزە ، ئەوە باسکرا بۆ پێغەمبەر (ﷺ) ئەویش فەرمووی : (والذي نفسي بيده لقد كانت الملائكة تعمل سرية) واتە : سوێند بەوەی گیانمی بەدەستە فریشتەکان تەرمەکەیان هەڵدەگرت .

## موعجیزەی (٨٨) هەواڵدانی پێغەمبەر (ﷺ) لەبارەی سزاو ئەشکەنجەی ئەبوجەهل لە ژیانی بەرزەخدا :

تەبەرانی لەئیبن عومەرەوە – خوای لێ ڕازی بێ – هێناویەتی دەڵێت : من بەلای بەدردا دەڕۆیشتم کەکەسێ لەچاڵێ هاتە دەرو زەنجیرێك لەملیدا بوو ،هاواری لێکردم ئەی عەبدوڵلا ناوم پێ بدە ،ئەی عەبدوڵلا ناوم پێ بدە،ئەی عەبدوڵلا ناوم پێ بدە ، نازانم ناوی زانیم یان وەك نەریتی عەرەب بانگی کردم،یەکێك لەوانی ناوگۆڕ هاتە دەرو قامچییەك بەدەستیەوە

---

[٨١] (هەیسەمی ( ج٩ ،ص ٣٠٨ ) دەڵێت : بەزار بە دوو سەنەد هێناویەتی و کەسەکانی سەنەدەکەش صحیحن ).

بوو هاواری لێکرد ئەی عەبدوڵلا ناوی پێ مەدە ئەو بێباوەڕە دواتر بە شمشێر لێیداو بردیەوە ناو گۆڕەکەی خێرا هاتمەوە بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ) و بۆم گێڕایەوە ، ئەویش پێی فەرمووم ئایا بینیت ، وتم بەڵێ : فەرمووی : ئەوە دوژمنی خوا ئەبووجەهل بوو وئەوەش سزایەتی تا ڕۆژی دوایی [٨٢]

## موعجیزەی (٨٩) هەواڵدانی پێغەمبەر (ﷺ) لەبارەی بوونی کەسێکی ڕەش پێست کە یەکێك لەقۆڵەکانی وەك مەمکی ئافرەت وایە لەناو کوژراوانی خەواریج دا :

پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەواڵی (ذو الثدية) واتە : (خاوەن مەمك) ی ڕاگەیاندووە و نیشانەیەکی جیاکەرەوەی ئەویشی باسکردووە و هەواڵی داوە کەلە کوژراوەکانی خەواریج دەبێت لە ڕاستیشدا وابوو لەناو کوژراوەکانیان دا بوو ، ئەو نیشانەیەش کە پێغەمبەر (ﷺ) باسی کردبوو ، ئەوە بوو کەفەرموبووی ، پیاوێکی ڕەش پێستەو یەکێك لە قۆڵەکانی وەك مەمکی ئافرەت وایە [٨٣] لەپاشان عەلی کوڕی ئەبوتالیب – خوالێی ڕازی بێ –ئەوەی کرد بەبەڵگە لەسەر ئەوەی کەخۆی لەسەر هەقەو موعجیزەکەی پێغەمبەری خوای ئاشکرا کرد .

---

[٨٢] (هه یثه می ج٦ ، ٨١) دا دەڵێت : تەبەرانی لە (المعجم الاوسط) دا هێناویەتی .

[٨٣] (حديث صحيح رواه البخاري ومسلم ) .

## موعجیزەی (٩٠) هەواڵدانی لەبارەی فەتح کردنی قوستەنتینیە:

پێغەمبەر (ﷺ ) فەرموویەتی: (لتفتحن القسطنطينية فلنعم الامير اميرها ولنعم الجيش ذلك الجيش) [٨٤]واتە : شاری قوستەنتینیە ئەستەمبوڵی ئێستا فەتح دەکرێت و چاکترین ئەو میر وسوپایەن کەفەتحی دەکەن بەو هەواڵدانە ئەوەی ڕاگەیاند کەشاری ئەستەمبوڵ موسڵمانان فەتحی دەکەن و موحەممەدی فاتیحیش پلەیەکی بەرزی دەبێت هەروەهاش دەرچوو کە پێغەمبەر (ﷺ ) فەرمووی بەڕاستی موعجیزەیەکی گەورەیە هەزاران درووود بۆ گیانی پاکی ئەو پێغەمبەرە پایەدارە .

## موعجیزەی (٩١) هەواڵدانی بەوەی فەرمووی : هەتا عومەر لە ژیاندا مابێت فیتنەوە ئاشووب هەڵناگیرسێت :

پێغەمبەری خوا (ﷺ ) فەرموویەتی (ان الفتن لاتظهر مادام عمر حياً) [٨٥]واتە : هەتا عومەر لە ژیاندا مابێت ، فیتنەو ئاشووب هەڵناگیرسێت و سەر هەڵنادات هەروەك فەرمووی وابوو بە ڕاستی ئەوانە موعجیزەی ئەوەندە گەورەن کەبەقەد تۆزقاڵێك گومان و دوودڵی ناهێڵن لەناو دڵەکان داو وەك ڕۆژی ڕووناك پێغەمبەرایەتی پێغەمبەر دەسەلمێنن .

---

[٨٤] (صحيح رواه احمد والحاكم وقال صحيح الاسناد والبخاري في التاريخ الصغير ) .

[٨٥] (صحيح رواه البخاري ومسلم والترمذي وغيرهم ) .

## موعجیزەی (٩٢) لەپاش سێ ساڵ چۆنی فەرمووو وەها هاتە دی:

بەچەشنێکی ڕاست وبێ گومان ئەوەچەسپاوە کە پێغەمبەر (ﷺ) نەتەوەی ئیسلامی بێدار کردۆتەوە کەفەرموویەتی : (اذا مشوا المطيطاء ، وخدمتهم بنات فارس والروم ، رد الله باسهم بينهم وسلط شرارهم على خيارهم ) [٨٦]واتە هەرکات موسڵمانان وایان لێ هات کەبەفیزودەمارەوە بە ڕێگادا بڕۆن و کچانی فارس و ڕۆم خزمەتیان بکەن ، ئەوا خوا دەیانکات بە دوژمنی یەکترو خراپەکارانیان بەسەر چاکەکارانیان دا زاڵ دەکات . لە پاش سی ساڵ چۆنی فەرموو وەها هاتەدی .

## موعجیزەی (٩٣) نەتەوەکەم بەموڵك و دەستەڵاتداری ئەو جێگایانە دەگەن کەهێنرانە پێش چاوم :

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی (ان الله زوى لي الارض فرايت مشارقها ومغار بها وان امتي سيبلغ ملكها مازوي لي منها ) [٨٧]واتە : خوای گەورە زەوی بۆهێنامەوە یەك بە چەشنێ خۆرهەلات وخۆرئاوا یم دی و ، نەتەوەکەشم بەموڵك ودەسەڵاتداری ئەوجێگایانە دەگەن کە هێنرانە پێش چاوم ، هەربەو جۆرەی کەفەرمووی دەقاو دەق ئاوا هاتەدی بەڕاستی ئەوەش سەلمێنەری ئەو ڕاستیە گەورەیە کە ئەو پێغەمبەرە هەرچی کەدەیفەرمووێ هەمووی لەلایەن خوای گەورەوە پێی ڕاگەیەنراوە بەڕاستی جێی سەر سوڕمانە کە بەدبەختانی دوور لەدین ئەم

---

[٨٦] ( صحيح رواه الترمذي بروانه (صحيح الجامع الصغير ٨١٣ )

[٨٧] ( صحيح رواه مسلم والترمذي وابو داود وابن ماجه واحمد )

هەموو بەڵگە ڕوون و ئاشکرایانە دەبینن ، کەچی هانیان نادات بۆ بڕواهێنان بەرەو هەڵدێری گومڕایی هەڵدەخلیسکێن و ئیمان ناهێنن .

## موعجیزەی (٩٤) هەواڵدانی لەبارەی دەست و پێڕی قەدەری یە:

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی :(القدرية مجوس هذه الامة) [٨٨] واتە: دەستەو پێڕی قەدەرییە مەجوسی ئەم نەتەوەیەن ئەمەش ئاماژەیە بۆ کۆمەڵی قەدەری یە کەئینکاری قەدەری خوایان دەکردو لەناو خۆیاندا چەند تاقم و کۆمەڵێك بوون ئا ئەوەش هەروەك فەرموویووی دەقاودەق هاتە دی بەڕاستی جوانی فەرمووە خوای گەورە لە قورئانە پیرۆزەکەیدا لە بارەی پێغەمبەرەکەیەوە کە دەفەرمووێ : (وما ينطق عن الهوى ان هو الا وحي يوحى) النجم ٢-٣،واتە لەهەواو هەوەسەوە قسە ناکات کەقورئان دەخوێنێت هەرچی کە دەیلێ قورئانەو سروشت دەکرێ بۆی .

## موعجیزەی (٩٥) هەواڵدانی لەبارەی چەند پیاوێکی وڵاتی فارس کە شەیدای زانست وزانیارین :

لە فەرموودەی صەحیحدا چەسپاوە کەپێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی (ان الدين لوكانه منوطا بالثريا لتناو له رجال من ابناء فارس) [٨٩]واتە : ئەگەر ئاینی ئیسلام تەنانەت بە ئەستێرەی کۆ (ثريا) یشەوە هەڵبواسرابێت ، چەند پیاوێکی خەڵکی وڵاتی

---

[٨٨] (حسن ، رواه ابو داود والحاكم) .

[٨٩] (صحيح رواه البخاري ومسلم والترمذي واحمد) .

فارس دەستی خۆیانی دەخەن ، ئەوەش ئاماژەیە بۆ ئەوزاناو ئەولیاو پیاوچاکانەی هاوچەشنی ئیمامی ئەبوو حەنیفە –رەحمەتی خوای گەورەی لێ بێ –کەخەڵکی ولاتی فارسە بەراستی ئەوەش موعجیزەیەکی ترە لە موعجیزە گەورەو بەناوبانگەکانی پێغەمبەری پایەداری ئیسلام هەزاران دروود بۆ گیانی پاکی ئەو پێغەمبەرە پایەدارە (ﷺ)

## موعجیزەی (٩٦) هەواڵدانێکی گەورە لەغزای خەندەق دا :

سەلمانی فارسی – خوای لێ ی ڕازی بێ –دەڵێت : لەکاتی چاڵ هەڵکەندندا لە جەنگی خەندەق دا گیرم خوارد بە دەست بەردەلانێکەوە ، چەند هەوڵم دا سوودی نەبوو وەبەردەکان نەدەشکان کەپێغەمبەر (ﷺ) بینیمی پاچەکەی لە دەست وەرگرتم و یەکەم پاچی لێدا پریشکی دایەوە دووەم پاچی لێدا بەهەمان شێوە پریشکی دایەوە و سێیەم پاچی لێدا بەهەمان شێوە بوو ، لێم پرسی دایك وباوکم بەفیدات بن ئەوە چی یە کەپاچی لێدەدەیت ئاوا پریشك دەداتەوە فەرمووی : بۆ ئەوەت بینی ئەی سەلمان ؟ فەرمووی لەیەکەمیاندا خوا یەمەنی بۆ فەتح کردم ، لە دووەمیاندا خوا شام و ڕۆژئاوای بۆ فەتح کردم ، لە سێیەمیشدا خوا ڕۆژهەلاتی بۆ فەتح کردم ، جالەسەردەمی عومەرو عوسماندا – خوایان لێ ڕازی بێ – کاتێ ناوچەیەك لەوانە فەتح دەکرا ئەبو هورەیرە دەی وت : کوێتان دەوێ فەتحی بکەن ، بەو خوایەی گیانی منی بەدەستە ، هەرشارێکتان فەتح کردووە و هەرچیش فەتح دەکرێ خوا پێشتر پێغەمبەری (ﷺ) لێ ئاگادار کردووە [٩٠]

---

[٩٠] (ل ٨٠، ١٧٤ المعجزات المحمدیة ولید الاعظمی ) .

## موعجیزەی (٩٧) سێ هەواڵدانی گەورەی پێغەمبەر (ﷺ) :

پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ : ( تغزون جزيرة العرب فيفتحها الله لكم ، ثم فارس فيتحها الله لكم ، ثم تغزون الروم فيفتها الله ) رواه مسلم واته : غەزای نیوە دوورگەی عەرەب دەکەن و خوا فەتحی دەکات بۆتان، ئینجا غەزای وڵاتی فارس دەکەن و خوا فەتحی دەکات بۆتان ، ئینجا غەزای رۆم دەکەن و خوا فەتحی دەکات ، بێجگە لەوەی خەبەردان بەفەتح کردنی ئەو سێ شوێنە موعجیزەیە ، خاڵێکی گرنگی تریشی تیایدایە بۆ نیوەدوورگەی عەرەب و فارس دەفەرمووێ : خوا بۆتانی فەتح دەکات ( فيفتحا الله لكم ) چونکە ئەم دوانە لەسەر دەستی صەحابەکان دابوو وە ( خطاب ) مکەش بۆ ئەوان بوو ، بەلأم بۆ فەتحی رۆم کەشاری ( قسطنطينية ) کە ( استانبول ) ی ئێستایە دەفەرمووێ ( فيفتحها الله ) خوا فەتحی دەکات و ووشەی ( لكم ) بەکار ناهێنێ چونکە لە زەمانی هاوەلأندا نەبوو هەرچەندە لە زەمانی ( معاويه ) شدا هەوڵ درا ، بەڵکو ئەو فەتحە گەیشتە زەمانی ( محمد فاتح ) دوای چەند سەدەیەك [٩١] بە ڕاستی ئەوانە موعجیزەی ئەوەندە گەورەن کەبەقەد تۆزقاڵێك گومان ودوودڵی ناهێڵن لەناو دڵەکاندا و وەك ڕۆژی ڕووناك پێغەمبەرایەتی پێغەمبەر (ﷺ) دەسەلمێنن بەڕاستی جێی سەرسوڕمانە کەبەدبەختانی دوور لە ئاین ئەم هەموو بەڵگە ڕوون ئاشکرایانە دەبینن کەچی ڕێگای ڕاست ناگرنە بەرو بەرەو هەڵدێر گومڕایی هەڵدەخلیسکێن و ئیمان ناهێنن .

---

[٩١] ( لە خزمەتی قورئاندا نوسینی : ئەندازیار عثمان لاپەڕە ٢٢٩ ) .

# موعجیزەی (٩٨) هەواڵدانی پێغەمبەر (ﷺ) لەبارەی پەیدابوونی ئاگرێك لەخاکی حیجاز کەگەردنی ووشتر لەشاری بوصرای شامەوە ڕووناك دەکاتەوە:

پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموویت : ( لا تقوم الساعة حتى تخرج نار من ارض الحجاز تضئ اعناق الابل ببصري ) [٩٢] واتە: قیامەت نایێت تا ئەوکاتەی ئاگرێك لەخاکی حیجازدا پەیدا دەبێت ، گەردنی ووشتر لە شاری (بوصرا) ی شامەوە ڕووناك دەکاتەوە ، ئەم فەرموودەیەش لەساڵی ٦٥٤ کۆچیدا هاتەدی ، واتە : دوای نزیکەی شەش سەدەونیو ، بەشێوەی بورکانێکی گەورە لە (حرە) نزیك شاری مەدینەی پیرۆز تەقیەوە و چەند شەوو ڕۆژێکی خایاند و شەوی تاریکی کردبووە ڕۆژی ڕووناك و لەدووری چەندەها کیلۆمەترەوە دەبینرا گەردنی ووشتری لە (بصری) شام ڕووناك کردەوە مێژوو نوسانی ئەو ڕۆژگارە بە ووردی باسیان کردووە، وەك ئەبی شامە کەلە ساڵی ٦٦٥ ك وەفاتی کردووە وەئیبن ساعی کەلەساڵی ٦٧١ ك دا وەفاتی کردووە ، وەقورتوبی کەلە ساڵی ٦٧١ ك دا وەفاتی کردووە وە شێخی ئیسلام ئبن تەیمیەش تۆماری کردووە کەدوای چەند ساڵێك لە ڕووداوەکە لە دایك بووە [٩٣] الله اکبر لەو موعجیزە گەورەو بەناوبانگە بەڕاستی بەس بەتەنها ئەو موعجیزەیە بەسە کە گەورەترین بەڵگە بێ بۆ ڕاست ودروستی پێغەمبەرایەتی پێغەمبەری ئیسلام (ﷺ) لەبەرهەمە جوانەکانی موعجیزە :

**یەکەم** : بۆئەوەی بڕوای بڕواداران زیاد بکا .

**دووەم** : یارمەتی دان و سەرخستنی پێغەمبەر (ﷺ) وە بەرگری لێ کردنی .

---

[٩٢] ( صحیح : رواه بخاري ومسلم )

[٩٣] ( کتێبی نبوة محمد من الشك الی الیقین ) .

**سێ یەم :** بۆئەوەی هەموو خەڵك ئەوەبزانێ کە موحەممەد (ﷺ) پێغەمبەری خوایە بەهەق و ڕاستی .

**چوارەم :** وە بۆبانگ کردنی غەیری موسڵمانان تابڕوا بێنن بە پێغەمبەرایەتی پێغەمبەرمان (ﷺ) ئەوەش بۆ وەلاَمدانەوەی ووتەی خوای گەورە کەلەقورئانە پیرۆزەکەیدا فەرموویەتی : (إِنَّا أَرْسَلْنَاكَ شَاهِداً وَمُبَشِّراً وَنَذِيراً {٨} ) الفتح ٨-٩ واتە : بەڕاستی ئەی موحەممەد (ﷺ) تۆمان ناردووە بەشایەت ومژدە دەرو ترسێنەر بۆئەوەی باوەڕ بەخواو پێغەمبەرەکەی بێنن وەپیشتیوانی لێ بکەن و ڕێزی لێ بگرن وەتەسبیحاتی خوا بکەن بەبەیانیان و ئێواران دا .

## موعجیزەی (٩٩) هەواڵدانی لەبارەی ئەوگەلەی چاوو لوت بچکۆلە وروومەت سورن :

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : ( لاتقوم الساعة حتى تقاتلوا الترك صغار الاعين ، حمرالوجوه ، ذلف الانوف ،كان وجوههم المجان المطرقة )[٩٤] واتە : قیامەت نایەت هەتا شەڕ لەگەڵ تووركدا دەكەن چاوولووت بچکۆلە وڕوومەت سوور ، ڕوومەتیان خڕوو گۆشتن ئەڵێ ی قەڵغانێکی دووچینە وئەستورە واتە : قەڵغانێك بەپێستی توراق دا پۆشرابێ و ئەستوور بووبێ ئەمەش لە هێرشی تەتەرەکاندا خۆی دەبینێتەوە ، کەموسڵمانان تەواو نارەحەت بوون بە دەستیانەوە و شەڕێکی درێژخایەنیان لەگەڵ کردن و سەرەنجام موسڵمانان سەرکەوتن و ئەوانیش زۆریان لێ موسڵمان بوون ، ئیبن تەیمیە کەخۆی لەڕووداوەکاندا ژیاوە دەڵێ : ئەگەر

[٩٤] ( صحيح: رواه بخاري ومسلم ) .

خۆت ئەو گەلە ببینی نازانی وەك پێغەمبەر (ﷺ) وەسفیان بکەی ، بەڕاستی ئەوانە موعجیزەی ئەوەندە گەورەن کەبەقەد تۆزقاڵێك گومان و دوودڵی ناهێڵن لەناو دڵەکاندا و وەك ڕۆژی ڕووناك پێغەمبەرایەتی پێغەمبەر (ﷺ) دەسەلمێنن ئەوانەش گەورەترین بەڵگەن لەسەر ئەوەی هەرچی کە ئەو پێغەمبەرە دەفەرمووێ هەمووی لەلایەن خوای گەورەو زاناوە پێی ڕاگەیاندراوە . وەك خوای گەورە دەفەرمووێ : (وما ينطق عن الهوى ان هو الا وحى يوحى) النجم ٢-٣ واتە: وەلەهەواو هەوەسەوە قسەناکات کەقورئان دەخوێنێ هەرچی کەدەیلێ قورئانەو سرووش دەکرێ بۆی .

## موعجیزەی (١٠٠) هەواڵدانی بەوەی کەقەڵای خەیبەر فەتح دەکرێت:

بوخاری لە سەهلی کوڕی سەهلەوە –خوای لێ ڕازی بێ – هێناویەتی کە پێغەمبەر (ﷺ) لە ڕۆژی خەیبەردا فەرمووی : (لاعطين هذه الراية غدا رجلا يفتح الله على يديه يحب الله ورسوله ويحبه الله ورسوله ) واتە: سبەینێ ئەم ئاڵایە دەدەمە دەست کەسێك خوای گەورە لەسەر دەستی ئەو فەتحی دەکات ، ئەو کەسە خواو پێغەمبەری خوای خۆش دەوێت ، خواو پێغەمبەری خواش ئەویان خۆش دەوێت ، خەڵکیش ئەو شەوەیان وابردە سەر تابزانن ئاڵاکە دەداتە دەست کێ ، کەبەیانی بوویەوە خەڵکی دەچوون بەدەوری پێغەمبەردا (ﷺ) هەرکامیان هیواداربوون ئاڵاکە بداتە دەست ئەو ، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی : عەلی کوڕی ئەبوتالیب لەکوێیە ؟ وتیان :ئەوەتا ئەی پێغەمبەری خوا بەدەست چاوی یەوە هاواریەتی ، پێغەمبەری خوا ناردی بەشوێنیدا و ئیمامی عەلی هات و پێغەمبەر (ﷺ) تفی دا لەچاوەکانی نزای بۆکرد، ئیمام عەلی چاك بوویەوە وەك ئەوەی هیچی نەبووبێت ئینجا

پێغەمبەر (ﷺ) ئالاكەی دایە دەستی ئیمامی عەلی ئەویش وتی : ئەی پێغەمبەری خوا لەگەڵیان بەشەڕدێم تاوەك ئێمە بن پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی : (انفذ على رسالتك حتى تنزل بساحتهم ، ثم ادعم الى الاسلام و اخبرهم بما يجب عليهم من الله تعالى فيه ، فوالله لان يهدي الله بك رجلا واحدا خير لك من ان يكون لك حمر النعم )[٩٥]واتە : كاری خۆت بەجێ بگەیەنە تا دەگەیتە مەیدانیان ، دواتر بانگیان بكە بۆ ئیسلام و پێیان بڵێ بە موسڵمان بوونیان چ مافێكی خوایان لەسەر شان دەبێت ، چونكە سوێند بەخوا ئەگەر خوای گەورە بتكاتەهۆكاری موسڵمان بوونی یەك كەس لە ووشتری تەواو گرانبەها بۆت باشترە . هەروەك پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەواڵی دابوو وەها هاتەدی قەلای خەیبەر لەسەردەستی ئیمامی عەلی فەتح كرا،بەڕاستی موعجیزەیەكی گەورەیە هەزاران درووود بۆ گیانی پاكی ئەو پێغەمبەرە پایەدارە (ﷺ).

## موعجیزەی (١٠١) هەواڵدانی بەوەی كەپادشاوسەركردەی ئەمەوییەكان ستەمكار دەبن :

پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەواڵی ئەوەی داوە كە ئەمەوییەكان ماڵی خوا لەناو خۆیاندا دەستاو دەست پێ دەكەن [٩٦]و پادشاو سەركردەكانیان ستەمكار دەبن و چەند كەسێكی وەك یەزید و وەلیدیان تێدا پەیدا دەبێت [٩٧]ئەوەش بەو جۆرە هاتەدی كە پێغەمبەر (ﷺ) هەواڵی دابوو .

---

[٩٥] (مسلیمیش لە ج٢ ص ٢٧٩ بەو جۆرە هێناویەتی) .
[٩٦] (رواه الترمذي والحاكم والبيهقي انظر صحيح الجامع الصغير ٤١٢ ) .
[٩٧] (حديث حسن رواه ابو يعلى انظر صحيح الجامع الصغير ٢٧٥٩ المطالب العالية لابن حجر ٤٥٢٨-٤٥٢٩ ) .

## موعجیزەی(١٠٢)هەواڵدانی کەعەبباسیەکان بەئاڵای ڕەشەوە پەیدا دەبن:

پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەواڵی ئەوەی داوە کە عەبباسیەکان بە ئاڵای ڕەشەوە پەیدا دەبن و ، موڵکیان چەندین ئەوەندەی ئەوانەی پێش خۆیان زیاد دەکات [٩٨]بەمەش ڕایگەیاند کەعەبباسیەکان دوای ئەمەوییەکان پەیدا دەبن و لەئەمەویەکانیش زیاتر لە حوکمدا دەمێننەوە ، هەر بەو جۆرەش ئەو هەواڵەی پێغەمبەر (ﷺ) وەك ڕۆژی ڕووناك هاتەدی بەڕاستی سەیرە جێی سەرسوڕمانە کەبەدبەختانی دوور لەدین ئەو هەموو بەڵگە ڕوون وئاشکرایانە دەبینن کەچی هانیان نادات بۆ ئیمان هێنان بەرەو هەڵدێری گومڕایی هەڵدەخلیسکێن ڕێگای ڕاست ناگرنەبەر .

## موعجیزەی (١٠٣) هەواڵدانی بەوەی کەخلیفە عوسمان لەکاتێکدا شەهید دەکرێت کەقورئان دەخوێنێت :

بەڕیوایەتی صەحیح و بێ گومان ئەوە ڕاگەینراوە کەپێغەمبەر (ﷺ) هەواڵی داوە خەلیفە عوسمان – خوای لێ ڕازی بێ- لەکاتێکدا شەهید دەکرێت کەقورئان دەخوێنێت [٩٩]هەروەها پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی (ان الله عسی ان یلبسه قمیصاً وانهم یریدون خلعه ) [١٠٠]واتە: نزیکە خوا کراسێك بکاتە بەر عوسمان ، بەڵام ئەوان دەیانەوێت لەبەری دابماڵن ، چۆن پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموبووی ئەوەش دەقاودەق هاتە دی .

---

[٩٨] (رواه احمد والطبراني والحاکم و صحیح اسناده العلامة احمد شاکر في المسند ) .

[٩٩] (صحیح : فضائل الصحابة للامام أحمد ٥٠١/١ الحدیث رقم ٨١٧ ) .

[١٠٠] (صحیح رواه الترمذي وابن ماجه ) .

## موعجیزەی (١٠٤) هەواڵدانی لەبارەی چارەنووسی عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیر:

لە ڕیوایەتێکی صەحیحی تردا هاتووە کە لەو کاتەدا پێغەمبەر (ﷺ) کەڵەشاخی دەگرت ، عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیر لەخوێنی پێغەمبەری (ﷺ) بۆ پیرۆزی خواردەوە رۆی نەکردەوە ، پێغەمبەر (ﷺ) پێی فەرموو (ویل للناس منك ، وویل لك من الناس) [101] بەمەش ئەوەی ڕاگەیاند کە عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیر بەئازایەتی یەکی بێ وێنە کاروباری خەڵکی دەخاتە ئەستۆی خۆیەوە و هێرشێکی سەختی دەکرێتە سەر و بەهۆی ئەوەوە بەڵاو موسیبەت توشی خەڵکی دێت ، لەپاشە ڕۆژدا بەو جۆرەی پێغەمبەر (ﷺ) هەواڵی دابوو ، هاتەدی ئەوەبوو لەسەردەمی ئەمەویەکاندا ، عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیر -خوای لێ ڕازی بێ- لەشاری مەککەدا جێنشینی خۆی ڕاگەیاندوو حەججاجی کوڕی یوسفی ستەمکاریش بەسوپایەکی زۆر گەورەوە ئابڵوقەی شاری مەککەی دا ، لەپاش چەند شەڕێکی سەخت و جەنگی خوێناوی وپاش دەرخستنی ئازایەتی یەکی بێ وێنە عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیر شەهیدکرا .

---

(١٠١) (حديث حسن ،رواه الطبراني وابو يعلى والبزار والحاكم)

## موعجیزەی (١٠٥) هەواڵدانی لەبارەی ئاشووربەکانی جەنگیزخان و هۆلاکۆ:

لە فەرموودەی صەحیح دا ئەوەباسکراوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : (ویل للعرب من شر قد اقترب) [١٠٢] واتە : بەدبەختی بۆعەرەب لەبەر ئەو شەڕو ئاشوبەی لێیان نزیك بووەتەوە ئەوەش هەواڵدانی ئاشووبەکانی جەنگیزخان و هۆلاکۆ بوو ، کەدەوڵەتی عەبباسی عەرەب لەناو دەبەن چۆنی فەرموو بەو جۆرە ئەو هەواڵەش دەقاودەق هاتەدی ئەوەش سەلمێنەری ئەو ڕاستییە گەورەیە کەخوای گەورە لە قورئانەکەیدا لەبارەی ئەو پێغەمبەرە (ﷺ) فەرموویەتی (وما ینطق عن الهوی ان هو الا وحی یوحی ) انجم ٢-٣ واتە : لەهەواو هەوەسەوە قسەناکات کەقورئان دەخوێنێ هەرچی کەدەیلێ قورئانەو سرووش دەکرێ بۆی .

## موعجیزەی (١٠٦)هەواڵدانی پێغەمبەر (ﷺ) لەبارەی حوسەینی کوڕی علی کەلە (الطف) واتە کەربەلا شەهید دەکرێت :

پێغەمبەر (ﷺ) هەواڵی داوە وەك ئوم سەلەمە –خوای لێ ڕازی بێ – دەیگێڕێتەوە کە حوسەین – خوای لێ ڕازی بێ – لە (الطف) واتە : لەکەربەلادا شەهید دەکرێت [١٠٣] ئەوە بوو پاش پەنجا ساڵ ئەو ڕووداوە ڕووی داو هەواڵەکەی پێغەمبەری خواش (ﷺ) هاتەدی ...

---

[١٠٢] ( صحیح رواه البخاري ومسلم ) .

[١٠٣] ( حدیث صحیح رواه الامام احمد والطبراني وانظر صحیح الجامع الصغیر ٢١٧ ) .

## موعجیزەی (١٠٧) هەواڵدانی لەبارەی چەند هەرزەیەکی قورەیش کەستەمکارو دڵرەقن :

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : (هلاك امتي على يدي اغليمة من قريش)[١٠٤] واتە : ئەتەوەکەم لەسەر دەستی چەند هەرزەیەکی قورەیشدا تیا دەچن و تووشی ئەشکەنجە دەبن بەو چەشنە هەواڵی یەزیدو وەلیدو هاوچەشنی ئەوانی لەسەرۆکە خراپەکارو زیانبەخشە ئەمەویەکان داوە هەروەك فەرموویووشی ئاوا هەواڵەکە هاتەدی ...

## موعجیزەی (١٠٨) هەواڵدانی پێغەمبەر (ﷺ) لەبارەی سزای جوولەکەکان لەناو گۆڕدا:

في الصحيحين[١٠٥] عن ابي ايوب –رضي الله عنه قال : (خرج النبي (ﷺ) وقد وجبت الشمس ، فسمع صوتا ، فقال يهود تعذب في قبورها ) واتە : پێغەمبەر (ﷺ) لەکاتی رۆژئاوابووندا گویٚ ی لە دەنگێك بوو ، فەرمووی : ئەوە جوولەکەن سزا دەدرێن لەناو گۆڕکانیاندا .

---

[١٠٤] (صحيح رواه البخاري واحمد ) .

[١٠٥] (رواه البخاري برقم ١٣٧٥ واللفظ له ، ومسلم برقم ٢٨٦٩ ) .

# موعجیزەی (١٠٩) پێغەمبەر (ﷺ) ڕای سپاردووم نەمرم تا دەسەڵات دەگرمە دەست :

ئیبن ئەحمەد لە الزوائد وئیبن ئەبی شەیبەو بەزارو حارث و ئەبو نەعیم و بەیهەقی لە (الدلائل) وئیبن عەساکیر لە خوزالەی کوڕی فوزالەی ئەنسارییەوە هێناویانە دەڵێت : لەگەڵ باوکم چووم بۆ (ینبع) بۆ سەردانی عەلی کوڕی ئەبوتالیب – خوای لێ ڕازی بێ – کەلەوێ نەخۆش بوو ، باوکم پێی وت : لێرە چی دەکەیت ؟ ئەگەر بمریت تەنها دەشتەکیەکانی جوهەینەت لەگەڵ دا دەبن سوار بەتا دێیتە مەدینە ، ئەگەر سەرە مەرگت هات هاوەڵانت لەگەڵ دەبن و نوێژت لەسەر دەکەن ، ئەبو فوزالە لەبەشداربووانی غەزای بەدربوو ئیمامی عەلی وتی : من بەم دەردە نامرم ، پێغەمبەر (ﷺ) ڕای سپاردووم نەمرم تا دەسەڵات دەگرمە دەست پاشان ئەممە واتە : ڕیشی تێك ئالاوی خوێنی ئەمە دەبێت واتە : روخسارو تەوێلی[١٠٦] بە ڕاستی ئەوەش یەکێکی ترە لە موعجیزە گەورەو بەناوبانگەکانی پێغەمبەری ئیسلام (ﷺ) هەروەك فەرموویووی ئەو هەواڵەش دەقاودەق هاتەدی ئەوەش سەلمێنەری ئەوەیە کە هەموو ئەو هەواڵانە خوای گەورە پێی ڕاگەیاندووە وەك قورئان دەفەرمووێ : (وما ینطق عن الهوی ان هو الا وحی یوحی) النجم ٢-٣ واتە : لەهەواوهەوەسەوە قسەناکات کەقورئان دەخوێنێ هەرچی کەدەیلێ قورئانەو سرووش دەکرێ بۆی .

---

[١٠٦] ( صحیح لە (المنتخب کنز العمال ص٩٥) داهاتووە و دەڵێت : کەسەکانی سەنەدەکەی جێ متمانەن ) .

## موعجیزەی (١١٠) هەواڵدانەکەی پێغەمبەر (ﷺ) بەزیلجە و شەنی ضەبابی دەقاو دەق دێتەدی :

تەبەرانی لە زیلجەوشەنی ضە بابیەوە دەگێڕێتەوە دەڵێت : پاش ئەوەی پێغەمبەر (ﷺ) لەشەڕی بەدر بوویەوە کوڕی قەرحانم برد بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ) و وتم : ئەی موحەممەد وائل بن قرحانم بۆ هێناویت تا بیگریت ، فەرمووی ( لا حاجة لي فيها ، وان اردت اقضيك بك المختار من دروع بدر فعلت ) واتە : هیچ پێویستیەکم پێی نیە ئەگەریش پێت خۆشە لەجیاتی قەڵغانەکانی بەدر دەتدەمێ منیش وتم : ئەمڕۆ هیچ بایەخێکی بۆم نیە تا بیگۆڕمەوە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی ( لاحاجة لى فيه ) واتە : منیش هیچ پێویستیەکم پێی نیە پاشان فەرمووی : ( ياذا الحوشن الا تسلم فتكون من اول هذا الامر؟ ) واتە :موسڵمان نابێت تا ببێتە یەکەمی ئەم کارەی ؟ وتم : دەبینم هۆزەکەت گیرۆدەت دەکەن ، فەرمووی : ( كيف بلغك عن مصارعهم ببدر؟ ) واتە : لەسەر لەناوچوونیان لەبەدر چۆنت بیستووە ؟ وتم : بیستومەو هەواڵم پێ گەیشتووە ، فەرمووی : ( فانا لهدى لك ) وتم : بابەسەر کەعبەدا زاڵ بیت و لەوێ دابنیشێت فەرمووی : ( لعلك ان عشت ترى ذالك ) واتە : بەڵکو بژیت ئەوە ببینیت پاشان فەرمووی : ( يا فلان خذ حقيبة الرجل فزوده من العجوة ) واتە : فلأن کەس کۆڵەکەی ئەو کابرا بێنن و خورمای زیاتری بۆ دابنێن کاتێك لام کردەوە تا بچم فەرمووی : ( اما انه من خير فرسان بني عامر ) واتە: ئەمە یەکێکە لە چاکترین سوار چاکانی بەنی عامیر ، دەڵێت : سوێند بەخوا لەگەڵ کەس وکارەکەمدا بووم کەسوارێك هات وتم خەڵکی چی دەکەن ؟ وتی : موحەممەد دەستیگرت بەسەر کەعبەداو لەوێ سەقامگیر بووە ، زیلجەوشەن دەڵێ : وتم : دایکم ڕۆڵە ڕۆم بۆ بکات ئەگەر ئەو ڕۆژە موسڵمان بوومایەو دوایی داوای حیرەم لێکردبایە پێی دەدام ، لەگێڕانەوەیەکی دیکەدا پێغەمبەر (ﷺ) پێی فەرموو ( ما يمنعك من ذالك ) چی

وادەکات موسڵمان نەبیت ؟ وتم : دەبینم بڕوایان پێ نەکردوویت ودەریان کردوویت و لەگەڵتان بەشەڕ دێن ، بزانم چیت بەسەر دێت ؟ ئەگەر بەسەریاندا سەرکەوتیت باوەڕت پێ دێنم و شوێنت دەکەوم ، ئەگەریش بەسەرتدا زاڵ بوون شوێنت ناکەوم [١٠٧]

## موعجیزەی (١١١) دووعاکردنی بۆ هۆزی ثە قیف گیرا دەبێ :

وترا ئەی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) دووعا بکە لەهۆزی ثە قیف فە رمووی : ( اللهم اهد ثقيفاً وات بهم ) واتە : خوایە هیدایەتی هۆزی ثە قیف بدەو بیان هێنە بۆ لام ، خوای گەورە وەڵامی نزاکەی پێغەمبەری ( ﷺ ) دایەوە ، هۆزی ثە قیف هاتن و موسڵمان بوون [١٠٨]

## موعجیزەی (١١٢) دووعای پێغەمبەر (ﷺ) گیرا دەبێ لە ستەمکارەکانی قورەیش:

بوخاری لە عەبدوڵڵای کوڕی مەسعودەوە – خوای لێ ڕازی بێ – ڕیوایەتی کردووە کە : جارێکیان پێغەمبەر( ﷺ ) لەنزیك ماڵی خوادا نوێژی دەکردو ، ئەبو جەهل و چەند هاوەڵێکیشی دانیشتبوون ، بە یەکتریان وت : کێتان دەچێ منداڵ دانی ووشتری نەوەی فلان دێنێ و، دەیخاتە سەر پشتی موحەممەد کاتێ لە سەجدەدا دەبێ ؟ بەد بەختی هەموو خەڵکەکە ، عوقبەی کوڕی ئەبو موعیط ، هەڵمەتی داو چوو هێنای ودانی بەخۆدا گرت هەتا پێغەمبەری خوا سەجدەی بردو ئەویش خستیە سەر پشتی لە نێوان هەردوو شانی دا ،

---

(١٠٧) صحیح هەیسەمی لەج٦ ص١٦٢ دا دەڵێت : عەبدوڵڵای کوڕی ئەحمەد دوباوکی گێڕاویانەتەوە و دەقەکەی تەواو نەکردووە ، تەبەرانیش هێناویەتی و پیاوانی سەنەدی هەردووکیان صەحیحن ، ئەبوو داودیش هەندێکی گێڕاوەتەوە ) .

(١٠٨) ( حديث حسن : احرجه احمد ٢/ ٢٤٣ والترمذي ٥ / ٣٩٤٢ عن جابر ) .

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود دەڵێ: منیش سەیرم دەکرد هیچم لێ نەدەهات ، خۆزگە دەسەڵاتم ببوایە ، ئەوانیش پێ دەکەنین و خۆیان دەدا بەسەر یەکتریدا بۆ خۆشی و ڕابواردن و پێغەمبەری خواش (ﷺ) وا لە سەجدەدا و سەر بەرز ناکاتەوە ، هەتا فاتیمە هات و لەسەر پشتی فڕێی داو ، سەری بەرز کردەوە ، پاشان فەرمووی : (اللهم عليك بقريش) سێ جار ، فەرمووی : خوایە تۆڵە لە قورەیش بستێنی ، کە دووعای لێکردن قوڕەیشەکان زۆریان بەلاوە ناڕەحەت بوو،بەلایەنەوە وەها بوو کە دووعاکردن لەو شارەدا گیرا دەبێت پاشان پێغەمبەر ناوی هێنان و فەرمووی : (اللهم عليك بأبي جهل ،وعليك بعتبة بن ربيعة ،وشيبة بن ربيعة،والوليد بن عتبه،وامية بن خلف ،وعقبة بن أبي معيط) واتە خوایە ، تۆڵە لە ئەبو جەهل ،عوتبەو،شەیبەو وەلیدو ،ئومیەو ،عوقبە بسێنی ،حەوتەمیشی ناو هێنا بەلاَم لەبەری نەکردبوو، دەڵێ دە بەو کەسەی کە گیانی منی بە دەستە ،هەموو ئەوانەی کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) ناوی هێنان بەچاوی خۆ دینم بە کوژراوی خرانە بیرەکەی بەدرەوە[١٠٩]

## موعجیزەی (١١٣) داواکارم خوای گەورە شێرەکەیت بۆ بنێرێ:

طه بەرانی بەشێوەی (مرسل) لە قەتادەوە هێناویەتی کە ووتوویەتی : عوتەییەی کوڕی ئەبولەهەب ئوم کلثومی کچی پێغەمبەری خوای (ﷺ) مارە کردبوو ، ڕوقیەش دەستگیرانی عوتبەی کوڕی ئەبولەهەبی برای بوو ، هێشتا نەی گواستبووە وە ، تا ئەوەبوو وەحی بۆ پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) هات ، جا کاتێك کە فەرمایشتی خوای گەورە (تبت يدا أبي لهب وتب) هاتە خوارەوە ، ئەبو لەهەب بە عوتبەو عوتەییەی وت : سەرم لەسەرتان حەرام بێت واتە : پەیوەندیم پێتانەوە نەمێنێ ، ئەگەر هەردوو کچەکەی موحەممەد تەڵاق نەدەن:

---

[١٠٩] (صحيح البخاري : ١/٣٧).

دایکیشیان وتی : کوڕەکانم هەردووکیان تەڵاق بدەن ، ئەوانیش تەڵاقیان دان ، کاتێ کە عوتەییە ئوم کلثومی تەڵاق دا هاتە لای پێغەمبەر (ﷺ) وتی : بە دینەکەت کافرم وکچەکەشتم تەڵاق دا ، نەبێیتە لام ونەبێمە لات ، پاشان هەڵمەتی دایە پێغەمبەر(ﷺ) وکراسەکەی دڕاند ، ئەوەش لە کاتێکدا بوو کە عوتەییە نیازی هەبوو بۆ بازرگانی بەرەو شام بکەوێتە ڕێ ، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی :(أما اني اسأل الله ان يسلط عليك كلبه) واتە: داواکارم خوای گەورە شێرەکەیت بۆ بنێرێ ، ئەوەبوو لەگەڵ کۆمەڵێك بازرگانی قوڕەیش دا کەوتنەڕێ هەتا گەیشتنە شوێنێك کە پێی دەوترێ (الزرقاء) کە شوێنێکە لە شام ونزیك مەعان کەبەدڕندەی زۆرو دڕبەناوبانگە شەو لەوێ باریان خست ، ئەوشەوە شێرێك هات و بەدەوریان دا سووڕایەوەو عوتەییەش دەی وت ، ئەی دایکە ڕۆ بە خوا ئەمە، وەك موحەممەد ووتوویەتی دەم خوات ، موحەممەد وا لەمەککەو منیش لە شام کەچی ئەم کوژێ ، شێرەکە هات و لەناو ئەو خەڵکەدا هەڵمەتی دایە عوتەییەو گازێکی پڕبەپڕی دەمی لێ گرت وکوشتی، زوهەیری کوڕی عەلاء وتوویەتی : هیشامی کوڕی عوروە لە باوکیەوە بۆمانی باسکردووە کە ئەو شەوە شێرەکە بە دەوریان دا سووڕاوەتەوە دوای ئەوە ڕۆیشتووە و،ئەوانیش خەوتوون و ،عوتەییە دەخەنە ناوەڕاستی بازرگانەکانەوە ،کەچی شێرەکە دێتەوە وهەنگاویان بەسەر دادەنێ و،قەپێك بەسەری عوتەییەدا دەکات وتێکی دەشکێنێ ... [110]

---

[110] (شرح حياة الصحابة ١/٤٥٤-٤٥٥) .

## موعجیزەی (١١٤) لەدەستدانی چاویان بەهۆی نزای پێغەمبەر(ﷺ) :

ئەحمەد لە عەبدوڵلای کوڕی مغفلی موزەینەوە هێناوەیەتی دەڵێت: ئێمە لە حودەیبیە لەگەڵ پێغەمبەر (ﷺ) بوین ، فەرموودەی ڕێکەوتنی حودەیبیەدێنێ و تیایدا هاتووە ،لەوبارەدا بووین سی گەنجی چەکدار بە ڕووماندا هاتن پێغەمبەر(ﷺ) نزای لێدەکردن ، خواش کوێری کردن ، ئێمەش چووین بۆیان و بەدیلمان گرتن ، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی : ئایا لە بەڵێنی کەسدا هاتوون یان ئایا کەس پەنایەکی پێداون ،وتیان نا ، ئەویش بەریدان ، خواش ئەم ئایەتەی دابەزاند (وَهُوَ الَّذِي كَفَّ أَيْدِيَهُمْ عَنكُمْ وَأَيْدِيَكُمْ عَنْهُم بِبَطْنِ مَكَّةَ مِن بَعْدِ أَنْ أَظْفَرَكُمْ عَلَيْهِمْ وَكَانَ اللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيراً {٢٤}) الفتح -. واتە: خوا ئەو زاتەیە کەدەستی ئەوانی واتە: کافران لە ئێوە کۆتاکرد ، دەستی ئێوەشی لەوان کۆتاکرد بە ڕێکەوتنی حودەیبیە لە ناو جەرگەی مەککەدا لە پاش ئەوەی ئێوەی بەسەر ئەوان دا زاڵ کردوە خوا بەهەر چی ئێوە دەیکەن بینایە .... [١١١]

## موعجیزەی (١١٥) نزای پێغەمبەر(ﷺ) لە عەبدوڵلای کوڕی قەمیئە گیرا دەبێ:

عەبدوڵلای کوڕی قەمیئە، لەرۆژی ئوحود دا کەڕوخساری پێغەمبەری زامدار کردو ددانە چوارینەی لە لای ڕاستەوە، لەشەویلگەی خوارەوەی شکاند، وتی، هاوەری بگرە ئەم گورزە

[١١١] هەیسەمی لە ج ٦ ،ص١٤٥) دەڵێت کەسەکانی سەنەدەکە صەحیحن ،نەسائی بەهەمان شێوە هێناویەتی ، وەك لە تەفسیری (ئیبن کە ثیر ج٤،ص١٩٣) هاتووە

لەدەستی ئیبنو قەمیئە، پێغەمبەر ( ﷺ ) خوێنەکەی لەڕوخساری سڕی و فەرمووی : ئەوە چیتە بۆ وات کرد :( أقمأك الله ) واتە ( أذلك الله ) خوا داماوو کەساست کا جا خوای گەورە سابرێنە کێوییەك زاڵ دەکا بەسەریدا ، بەقۆچ دەیکوژێت و هەر شۆقی تێ هەڵ دەداهەتا پارچە پارچەی دەکات... [١١٢]

## موعجیزەی (١١٦) دووعا کردنی لە پادشای فارس گیرا دەبێ :

هەواڵ بۆ پێغەمبەر( ﷺ ) هات کە پەروێزی پادشای فارس نامەکەی پێغەمبەری خوای ( ﷺ ) لەت وپەت کردووە ، پێغەمبەر ( ﷺ ) فەرمووی : ( أللهم مزقه ) واتە : خوایە لەت وپەتی بکە ، ئەوە بوو لەت وپەت کرا ، چونکە خوای گەورە شێرۆیەی کوڕی پادشای بەسەر باوکیدا زاڵ کردوو بەخەنجەر کووشتیئینجا سەعدی کوڕی ئەبو وەقاصیش موڵك و دەستەڵاتداریەکەی لەت و پەت کرد و هیچ شوێنەوارێکی ئەو پادشایە و سەرۆکایەتی فارس لە دنیا نەما ، [١١٣]بەلام قەیسەرو پادشاکانی تر موڵك وپادشایەتیان مایەوە ، لەبەر ئەوەی ڕێزی نامەکانی پێغەمبەریان ( ﷺ ) گرت ...

## موعجیزەی (١١٧) دووعاکردنی لەهۆزی (مُضَر) گیرا دەبێ :

پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) دوعای لە هۆزی (مُضَر) کرد کە هۆزێکی گەورەبوون چونکە پێغەمبەریان ( ﷺ ) بە درۆ خستبۆوە، وە باوەڕیان پێ نەکردبوو، ئەوە بووگرانی و بێ

---

[١١٢] ( مختصر صحيح البخاري ص( ٢٨٩ ) ) .

[١١٣] ( صحيح : رواه البخاري ومسلم وأحمد والبيهقي ) .

بارانی تەنگی پێ هەڵچنین ، ناچار قورەیشیەکان لە پێغەمبەر ( ﷺ ) تکایان کرد، دووعای ڕزگاربوونیان بۆبکات ، کەدووعای بۆکردن ، خوا بارانی بۆبارندن .... [114] بە ڕاستی ئەوانە موعجیزەی ئەوەندە گەورەن کە بەقەد تۆزقاڵێك گومان و دوودڵی ناهێڵن لەناو دڵەکاندا هەزاران دروود بۆ گیانی پاکی ئەو پێغەمبەرە دەست پاك وڕاست گۆیەی ئیسلام ( ﷺ )

## موعجیزەی (١١٨) ئەی خوایە لە موحەللیم خۆش مەبە :

پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) سریەیەکی بەسەرکردایەتی عامیری کوڕی ئەزبەت بۆ جێگایەك ناردوو موحەللیمی کوڕی جەثثامەشی لەگەڵ دابوو ، لە ڕێگادا موحەللیم بەغەدر عامیری کوشت ، کە هەواڵ گەیشتە پێغەمبەر ( ﷺ ) تورەبوو فەرمووی : ( اللهم لاتغفر لمحلم ) واتە : خوایە لە موحەللیم خۆش مەبە ، پاش حەوت ڕۆژ موحەللیم مرد ، [115] و ناشتیان کەچی زەوی واتە : قەبرەکەی فڕێی دایە دەرەوە ، پاشان ناشتیانەوە دیسان چەند جارێکی تر فڕێی دایەوە دەرەوە ، تاله ئەنجامدا خستیانە ناو شیوێکەوە و بەبەرد شیوەکەیان لەسەر پڕ کردەوە .. [116]

---

[114] ( صحیح : ( رواه البخاري ومسلم ) .

[115] ( رواه ابو داود وابن ماجه وأحمد والبيهقي ) .

[116] ( رواه ابو القاسم الاصفهاني في دلائل النبوة ) .

## موعجیزەی (١١٩) لەدوای ئەوەی کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دووعای لێکرد دەستی ڕاستی بۆدەمی بەرزنەکردەوە :

جارێکیان پێغەمبەر (ﷺ) پیاوێکی بینی بەدەستی چەپ پارووی دەخستە دمیەوە پێی فەرموو : (كل بيمينك) واتە : بەدەستی ڕاستت بخۆ پیاوەکە وتی : (لا أستطيع) واتە :ناتوانم ، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی : (لااستطعت) واتە :دەسا یاخوا هەر نەتوانیت دوای ئەوە دەستی ڕاستی بۆ دەمی بەرز نەکردەوە [١١٧]

## موعجیزەی(١٢٠)دوعاکردنی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بۆ سائیبی کوڕی یەزید:

جوعەیدی کوڕی عەبدوڕەحمان-ڕەحمەتی خوای لێ بێ-وتی : سائیبی کوڕی یەزیدم بینی – خوای لێ ڕازی بێ –تەمەنی نەوەدوچوار ساڵ بوو،هێشتا بەهێزوو بەخۆوەبوو،باڵای ڕێك وپێك بوو نەچەمابۆوە،خۆی وتی : زۆرباش دەزانم کەبۆچی هەتا ئێستاش تەندروستیم باشە ، بەتایبەتی تەندروستی چاو وگوێم ، کەبەباشی دەبینم و دەبیستم ،ئەم بەهرمیە بەهۆی دوعای پێغەمبەرەوەیە (ﷺ) پوورم بردمی بۆخزمەتی ، عەرزی کرد : ئەی پێغەمبەری خوا ،ئەم کوڕەی خوشکەزام نەخۆشە نزای بۆ بکە ، پێغەمبەریش (ﷺ) نزای بۆکردم [١١٨]

---

(١١٧) (صحيح : (رواه مسلم واللفظ له ، وابن حبان والدارمي)

(١١٨) (مختصر صحيح البخاري ص٩٩) .

## موعجیزەی (١٢١) ئەگەر خۆڵی بکڕیبایە قازانجی دەکرد :

عورووەی ئەل بـاریقی-خوای لێ ڕازی بێ -وتـی : پێغەمبەر ( ﷺ ) دینـارێکی زێڕی پێم دا ، کەمەڕێکی بۆبکڕم بۆ قوربـانی ، منیش بەو دینـارە دوومەڕم کڕی ، یەکێکیـانم فرۆشتەوە بە دینـارەکەو، دینـارێك و مەڕێکیشم بۆ بردەوە، وە لەحاڵەکە حاڵیم کرد ، ئەویش لەو سەودایەی من ڕازی بوو، بۆیە نزای بۆم کرد، کە خوای گەورە پیت وفەڕ بخاتە مامەڵەو سەودامەوە ، لە پیت وفەڕی نزاکەیەوە ، ئیتر لەومو دوا ئەگەر خۆڵی ئـاسایم بکڕییایە قـازا نجم لێ ی دەکرد [١١٩]

## موعجیزەی (١٢٢) دەرگا و حەوشەی ماڵەکە وتیان ئامین کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) دووعای کرد بۆ ئالی عەباس :

تەبەڕانی لە ئەبو ئوسەیدی ساعدیەوە هێناویەتی دەڵێت پێغەمبەر (ﷺ) بەعباسی کوڕی عەبدولموتەلیبی فەرموو: ( لاتبرح منزلك و بنوك غدا حتى أتيكم فانى فيكم حاجة ) واتە: بەیـانی خۆت و منداڵەکانت لە ماڵ بن تـا دێم بۆ لاتـان چونکە کارێکم پێتانە چاوەڕێیان کرد تـا دوای چێشتەنگاو هات بۆ لایان ، فەرمووی : سەلامتان لێ بێت ، وتیان عليك سلام ورحمة الله وبركاتە ، فەرمووی بەیانیتان چۆنە ؟ وتیـان سوپـاسی خوا دمکەین فەرمووی : نزیك ببنەومو بدەنە پـاڵ یەکدی تـاوایان کرد ئەویش بە عەباکەی سەر شـانی دایپۆشین و فەرمووی : خوایە ئەوە مامی من وپشتی بـاوکمە ، ئەوانەش ئـالوبەیتی منن ، دەی

---

[١١٩] مختصر صحيح البخاري ص ١٣٢ ) .

لە ئاگردا دایانپۆشە وەك داپۆشینی من بە ئەم عەبایەم بۆیان ، ئەوی خواروو دەرگا و حەوشەكانی ماڵ ئامینیان كردو وتیان ئامین ،ئامین،ئامین ... [١٢٠]

بە ڕاستی موعجیزەیەكی گەورەیە هەزاران درووود بۆ گیانی پاكی ئەو پێغەمبەرە پایەدارە (ﷺ) .

## موعجیزەی (١٢٣) جێگیر بوونی جەریر لەسەر ئەسپەكەی بەهۆی نزای پێغەمبەر (ﷺ):

ئیبن ئەبی شەیبە لە جەریرەوە هێناویەتی دەڵێت : پێغەمبەر (ﷺ) پێی فەرمووم (ألا تريعني من ذي الخلصة ) واتە: ئایا ئاسوودەم ناكەیت لەسەر (زیلخلسە ) ماڵێك بوو كەلە سەردەمی نەفامیدا هی خەسعەم بوو بە كەعبی یەمانی ناو دەبرا ، دەڵێ وتم : ئەی پێغەمبەری خوا من كەسێكم لەسەر ئەسپ ناوەستم وە تەبەرانی لە جەریرەوە هێناوەیەتی دەڵێت : من لەسەر ئەسپ نەدەوەستام ، ئەوەم باسكرد بۆ پێغەمبەر (ﷺ) ئەویش بە دەستی دای بەسەر سنگمدا تا دەستی پێغەمبەرم لەسەر سنگم بینی ، فەرمووی : (اللهم أثبيته واجعله هاديا مهديا ) واتە : خوایە چەسپاوی بكەو بە ڕێنمون و ڕێنمونكاری بگێڕە جەریر دەڵێ : لەوە بەدواوە لەسەر ئەسپەكەم نەدەكەوتم [١٢١]

---

[١٢٠] (حدیث حسن : هەمان سەرچاوەی ( هەیسەمی ج٩ ،ص٢٧٠ ) دەڵێ : سەنەدەكەی باشە ، هەروەها بەیهەقی لە ئەبو نوسەیدەوە بەو شێوەیە و ئیبن ماجە بە كورتی لێوەی هێناوە ، وەك لە (البداية والنهاية )ج ٦،ص١٣٢ ) دا هاتووە ، ئەبو نەعیم لە الدلائل ص١٥٤ بە دوورو درێژی لێوەی هێناوە .

[١٢١] (لە منتخب ج٥ ، ص ١٥٢ دا واهاتووە ) .

## موعجیزەی (١٢٤) فراوان بوون و زۆر بوونی ڕزق و ڕۆزی ماڵەکەی عەبدوڵلای کوڕی بوسر بەهۆی نزای پێغەمبەرەوە (ﷺ) :

ئیبن عەساکیر لە عەبدوڵلای کوڕی بسرەوە هێناویەتی دەڵێت:من وباوکم لەبەر دەرگای ماڵمان دانیشتبووین کە پێغەمبەر (ﷺ)بەسواری ولاخێ هات،باوکم پێی وت:ئایا ئەی پێغەمبەری خوا دانابەزیت و نان بخۆیت ونزای بەرەکەت بکەیت ؟ئەویش دابەزی و نانی خواردوو فەرمووی:خوایە ڕەحمیان پێ بکەو لێیان خۆش بە بەرەکەت بخەرە ناو ڕۆزیانەوە تەبەرانی بە دوورو درێژی هێناویەتی و ئەوەشی بۆ زیاد کردووە،بەردەوام فراوانی ڕۆزیمان لەلای پەروەردگارمانەوە بەدی دەکرد[١٢٢]

## موعجیزەی (١٢٥) پێدانەوەی بینایی بەهۆی نزای پێغەمبەری خواوە (ﷺ) :

ئەبو نەعیم لە (الدلائل النبوة) ص٦٣ لە عەبدوڵلای کوڕی عەباسەوە – خوایان لێ ڕازی بێ – هێناویەتی دەڵێت : پێغەمبەر(ﷺ) لەمزگەوت دا قورئانی دەخوێندو بە ئاشکرا دەیخوێند تا خەڵکی لە قوڕەیش پێی بێزار بوون تا هەستا لاییەن ، دەستیان برد بۆگەردنیان وهەمووکوێرونابینا بوون ، هاتن بۆلای پێغەمبەر (ﷺ) ووتیان : بۆ خاتری خواو لەبەر خزمایەتی ئەی موحەممەد ، دەڵێت : چی بەشی قوڕەیش بوو لەگەڵ پێغەمبەر (ﷺ) نزیکایەتیان هەبوو، پێغەمبەر (ﷺ) نزای کرد تا ئەوەیان لەسەر لاچوو ، ئەوکات

---

[١٢٢] (صحیح : لە المنتخب ج٥ ، ص ٢٢٠ دا هاتووە) .

خوا ئەو ئایەتەی دابەزاند ({١} وَالْقُرْآنِ الْحَكِيمِ {٢} إِنَّكَ لَمِنَ الْمُرْسَلِينَ {٣} عَلَى صِرَاطٍ مُّسْتَقِيمٍ {٤} تَنزِيلَ الْعَزِيزِ الرَّحِيمِ {٥} لِتُنذِرَ قَوْماً مَّا أُنذِرَ آبَاؤُهُمْ فَهُمْ غَافِلُونَ {٦} لَقَدْ حَقَّ الْقَوْلُ عَلَى أَكْثَرِهِمْ فَهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ {٧} ) دەڵێت کەس لەوانە باوەڕیان نەهێنا....

## موعجیزەی (١٢٦) چاوەکەی قەتادە چاك دەبێتەوەو بینایی زیاد دەبێ بەهۆی نزاکەی پێغەمبەر (ﷺ) :

تەبەرانی لەقەتادەی کوڕی نوعامەنەوە هێناویەتی دەڵێت : کەوانێ پێشکەشی پێغەمبەر (ﷺ) کرا ، ئەویش ڕۆژی ئوحد دای بەمن ، منیش لەبەردەم پێغەمبەر (ﷺ) تیرم پێ هاویشت تا لەکار کەوت ، لەبەردەم پێغەمبەر (ﷺ) وەستام و تیرەکانم بەرخۆم دەدا تا هەرکاتێك تیرێ بەرەو لای پێغەمبەر (ﷺ) دەهات خۆم دەدایە بەری و سەرم بەر پێغەمبەر (ﷺ) دەکەوت بێ ئەوەی تیرێ بوەشێنم ، کۆتا تیریان بەسەر ڕووی کوڵم کەوت و کۆو جەمعەکە جیا کەوت ، بەدەستم پێڵووم گرت و لە دەستمدا بردم بەرەو لای پێغەمبەر (ﷺ) کە پێغەمبەر (ﷺ) بینی چاوەکانی فرمێسکیان ڕشت و فەرمووی : (اللهم ان قتادة قد أوجه نبيك بوجه فاجعلنا أحسن عينيه واحدهما نظر) واتە : خوایە قەتادە ڕووی خۆی خستە بەر پێغەمبەرەکەت دەی چاوەکانی بکە بە باشترین و بەهێزترین بینین خواش نزاکەی گیرا کرد دار قوتنی و ئیبین شاهین لە مەحموودی کوڕی لبیدەوە لە قەتادەوە هێناویەتی کە ڕۆژی

ئوحد چاوی پێکراو کەوتە سەر کوڵمی ، پێغەمبەر (ﷺ) خستیە شوێنی خۆی ئەو چاوەی بووبە سەلامەترین چاو ... [١٢٣]

## موعجیزەی (١٢٧) دەزووی دەکرد بەدەرزیدا کاتێ تەمەنی هەشتا ساڵ بوو چاوەکانیشی سپی بوون :

ئەبوو نەعیم لە (الدلائل ص٢٢٣) لە رفاعەی کوڕی رافعەوە هێناویەتی دەڵێت : ڕۆژی بەدر تیرێ وە شێنراو چاوی کوێر کردم ، پێغەمبەر (ﷺ) تفی لێداو نزای بۆ کردم ، ئیدی هیچ ئازاری نەدام ، ئیبن ئەبی شەیبە لە کەسێك لەبەنی سلامان لە دایکیەوە هێناویەتی حەبیبی کوڕی فوەیکی خاڵۆی بۆی گێڕایەوە بردی بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ) و چاوەکانی سپی هەڵگەڕا بوون وهیچی پێ نەدەبینین : پرسیاری لێکرد وتی : من لەسەر ووشترێ خۆم فێر دەکرد کە پێم کەوتە سەر هێلکە مارێ و چاوەکانم توش بوون ، پێغەمبەر (ﷺ) فووی کرد بە چاوەکانیدا بەوە بینایی پێ بەخشرایەوە دەڵێت بینیم دەزووی دەکرد بە دەرزیدا کاتێ تەمەنی هەشتا ساڵ بوو چاوەکانیشی سپی بوون [١٢٤]

---

[١٢٣] (دار قوتنی وبەیهەقی لە ئەبووسەعیدی خودریەوە بەهەمان شێوە هێناویانە لە (الاصابة ج٣، ص٢٢٥) دا هاتووە ، ئەبوو نەعیم لە (الدلائل) ص١٧٤ لەقەتادەوە بەهەمان شێوە هێناویەتی لە گێڕانەوەکەیدا هاتووە : چاکترین و بەهێزترین چاووی بوو )

[١٢٤] (ئیبن سکن دەڵێت تەنها موحەممەدی کوڕی بیشر هێناویەتی وبۆ حەبیبیش تەنها ئەم فەرموودە دەبینم لە (الاصابة ج١، ص٣٠٨) دا هاتووە ، تەبەرانیش لە کەسێ لە سلامانی کوڕی سەعید لە دایکیەوە بە هەمان شێوە هێناویەتی بەلأم لە گێڕانەوەکەی ئەمدا هاتووە : من ووشترەکانم بەڕێدەکردن (هە یثە می ج٨ ، ص٢٩٨) دەڵێت لە سەنەدەکەدا کەسی واهەن کە نایانناسم ، ئەبو نەعیم ل (الدلائل)ص ٢٢٣ بەو سەنەدە بەهەمان شێوە هێناویەتی ) .

## موعجیزەی (١٢٨) پێغەمبەری خوا (ﷺ) نزا بۆ نابینایەك دەكات ، خوای گەورەش چاوەكانی چاك دەكاتەوە :

ئیمامی نەسائی لەعوسمانی كوڕی حونەیفەوە دەگێڕێتەوەو دەڵێ : نابینایەك عەرزی پێغەمبەری (ﷺ) كرد ئەی پێغەمبەری خوا ، لەخوا داوابكە چاوم چاك بكاتەوەو دەری بخات ، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی : ئاوا؟ یان وازت لێ بهێنم ؟ وتی : پێغەمبەری خوا ئەم كوێری یەم زۆر بێزاری كردووم پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی : انطلق فتوضأ ثم صل ركعتين ، ثم قل : اللهم اني أسألك وأتوجه اليك بنبيي محمد نبي الرحمة،يا محمد اني أتوجه الى ربك ،أن يكشف لي عن بصري،اللهم شفعه في ، وشفعني في نفسي ، فرجع وقد كشف الله عن بصره (١٢٥)

واتە : بڕۆ دەست نوێژ بگرەو دووڕكات نوێژ بكەو ، پاشان بڵێ : خوایە داوات لێ دەكەم و ڕووت تێدەكەم ، بەهۆی پێغەمبەرەكەمەوە كە موحەممەدەو پێغەمبەری میهرەبانی یە ئەی موحەممەد (ﷺ) من بەهۆی تۆوە ڕوو لەخوا دەكەم كە پەردە لەسەر چاوم لابدات ، خوایە شەفاعەتی ئەوم لێ وەربگرەو هی خۆیشم عوسمان : دەڵێ : كە گەڕایەوە چاوی چاك كرد بووەوە بە ڕاستی موعجیزە یەكی گەورەیە ئەو معجیزانە ئەوەندە گەورەو ناوادارن كەبەقەد تۆزقاڵێك گومان و دوودڵی ناهێڵن لەناو دڵەكاندا سوپاس و ستایشی بێ پایان بۆ خوای گەورەو خاوەن هێزوو توانی بێ سنور وە دروود بۆگیانی پێغەمبەرە پایە دارەكەی ئیسلام(ﷺ)

---

(١٢٥) (صحيح : رواه النسائي واللفظ له ، والترمذي وقال : حسن صحيح غريب ، وابن ماجه وابن خزيمة والحاكم وقال: صحيح الاسناد على شرط الشيخين ولم يخرجاه ، والامام أحمد والطبراني وابن السني ....

## موعجیزەی (١٢٩) نزاکردنی بۆ عەبدورەحمانی کوڕی عەوف :

ئیمامی بەیهەقی و غەیری ئەویش لە پێشەوایانی فەرمووده دەگێڕنەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) دوعای بەرەکەتی بۆ عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف کرد [١٢٦] کە یەکێکە لەو دە کەسەی مژدەی بەهەشتیان پێ درا ، بەبەرکەتی ئەو دووعایە ماڵ و سامانێکی زۆری دەست کەوت ، بە ڕادەیەکی وا کە جارێکیان کاروانێکی حەوت سەد حوشتری ، بە خۆیان و سوارەو بارەکانیانەوە ، لە ڕێگای خوادا بەخشی [١٢٧]

## موعجیزەی (١٣٠) عەبدوڵڵای کوڕی جەعفەر بەرەکەت دەکەوێتە کەسابەتەکەیەوە هەرچی یەکی دەکڕی قازانجی لێ دەکرد :

پێغەمبەری خوا (ﷺ) دووعای بۆ عەبدوڵڵای کوڕی جەعفەرکرد کەبەرەکەت بکەوێتە کەسابەتەکەیەوە ، ئەوەبوو وای لێ هات هەرچی یەکی دەکڕی قازانجی لێ دەکرد [١٢٨] بە چەشنێك کەلە سەردەمی خۆیدا ، هەروەك بەسەخاوەتمەندو دەست ڕەنگینی بەناوبانگ بوو ، هەروەها بە خاوەن سەروەت و سامانیش ناوبانگی دەرکردبوو ....

---

[١٢٦] ( صحیح : رواه البخاري ومسلم والترمذي والنسائي وابن ماجه وأحمد ).

[١٢٧] ( الشفاء ٣٢٦/١ ).

[١٢٨] ( صحیح : رواه أحمد والنسائي و أبوداود وأبو يعلى والطبراني مختصر ).

## موعجیزەی (١٣١) خوایە هەرکاتێك سەعد لێت پاڕایەوە دووعای گیرا بکە :

ئیمامی تیرمیذی دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) دووعای بۆ سەعدی کوڕی ئەبوو وەققاص کردو فەرمووی : (اللهم استجب لسعد اذا دعاك) [١٢٩] واتە: خوایە هەرکات سەعد لێت پاڕایەوە ، دووعای گیرابکە، بەم بۆنەیەوە دووعای سەعد هەمیشە گیرا بووە ،ئەم دووعا گیرا بوونەش هێندە بەناوبانگ بووە کە خەڵکی دەترسان سەعد دووعایان لێ بکات.

## موعجیزەی (١٣٢) لە تەمەنی حەفتا ساڵیدا مرد وەك تەمەنی پازدە ساڵ بێ وابوو :

پێغەمبەری خوا (ﷺ) بە ئەبوو قەتادەی فەرموو : (أفلح وجهك ، اللهم بارك له في شعره وبشره) [١٣٠] واتە: دەم وچاوت سەرفراز بێت ، خوایە بەرەکەت بخەرە پێست و موویەوە ..کەلە تەمەنی حەفتا ساڵیدا مرد ، دەت وت تەمەنی پازدە ساڵ بووە .. [١٣١]

---

[١٢٩] (صحيح : رواه الترمذي واللفظ له ، وابن حبان والحاكم وقال : صحيح الاسناد ولم يخرجاه ) .

[١٣٠] (صحيح : (رواه الحاكم) .

[١٣١] رواه البيهقي ، بروانه نسيم الرياض ١٢٨/٣.

## موعجیزەی (١٣٣) سەرماوگەرما کاریان تێ نەدەکرد چونکە پێغەمبەر (ﷺ) نزای بۆ کردبوو :

لە ڕیووایەتێکی صحیح دا هاتووە : دەڵێت پێغەمبەری خوا (ﷺ) دووعای بۆ ئیمامی عەلی کردو فەرمووی : (اللهم اكفه الحر والقر) واتە : خوایە گیان سەرماوگەرمای لەکۆڵ بکەرەوە ، ئەوەبوو هەرگیز نەسەرمای دەبوو ، نەگەرما ، لەزستاندا بەرگی هاوینەو ، لە هاوینیشدا بەرگی زستانەی دەپۆشی [١٣٢]

## موعجیزەی (١٣٤) سەدو بیست ساڵ ژیا کەچی دەم وددانی لەهی هەموو کەسێك جوانتر بوو ، ددانیشی نەکەوت :

کاتێك شاعیری بەناوبانگ (النابغة الجعدي) لە خزمەت پێغەمبەری خوادا ئەم شیعرەی وت : (بلغنا السماء في مجدنا وسنائنا وانانريد فوق ذلك مظهرا) واتە : لەسەر بەرزیدا گەیشتووینەتە ئاسمان ، چاوەڕوانی لەوەش بەرزتر دەکەین پێی بگەین ، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی : (الى أين يا ابا ليلى؟) واتە : بۆکوێ ئەبو لەیلا ؟ ئەویش وتی : الى الجنة يارسول الله ، واتە ئەی پێغەمبەری خوا بۆبەهەشت پاشان پارچە شیعرێکی خوێندەوە ، کە پڕبوو لە واتای گەورەوبەرزوبڵند ، ئینجا پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی : (لافضل الله فاك) واتە خوا دەمت هەڵنەوەشێنێت ، ئەوەبوو دەموو ددانی لەهی هەموو کەسێك جوانتر بوو ، ددانیشی نەدەکەوت ، خۆئەگەر دانیشیبکەوتایە لە جێگایدا ددانێکی تر دەردەهات ، سەدوبیست

---

[١٣٢] (رواه ابن ماجه واللفظ له ، والطبراني في الاوسط واسناده جيد ، وابن أبي شيبة ، ورواه الامام أحمد ) .

ساڵیش ژیا ، هەندێك دەڵێن : زیاتریش ژیاوە .. [١٣٣] بە ڕاستی ئەو موعجیزانە بەڵگەی ئەوەندە گەورەن کە وەك ڕۆژی ڕووناك پێغەمبەرایەتی پێغەمبەری ئیسلام دەسەلمێنن وە بەقەد تۆزقاڵێك گومان ودوودڵی ناهێڵن لەناو دڵەکان دا سوپاس وستایشی بێ پایان بۆ خوای گەورە وە درووود بۆ گیانی پاکی پێغەمبەری ئیسلام (ﷺ) .

## موعجیزەی (١٣٥) دووعاکردنی پێغەمبەر (ﷺ) بۆ فاتیمەی کچی گیرا دەبێ :

پێغەمبەری خوا (ﷺ) دووعای بۆ فاتیمەی کچی کرد هەرگیز خوا برسیەتی بەسەردا نەهێنێت ، فاتیمە – خوای لێ ڕازی بێ – دەڵێ : پاش ئەوە هەرگیز برسیم نەبووە .. [١٣٤]

## موعجیزەی (١٣٦) کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) نزای بۆکرد هیچی لەبیر نەدەچۆوە :

ئەبوو هورەیرە دەڵێ : عەرزی پێغەمبەرم (ﷺ) کرد : فەرموودەی زۆرت لێ دەبیستم کەچی لەبیرم دەچنەوە فەرمووی بەرگەکەت ڕا بخە ، کەڕامخست ، دەستی موبارەکی پیادا هێناو پاشان فەرمووی : هەڵی بگرەوە ، منیش هەڵمگرتەوە ، ئیتر پاش ئەمە هیچ شتێکم لەبیر نەچووەتەوە ... [١٣٥]

---

[١٣٣] (بروانە شرح الشفا لعلي القاري ١/ ٦٦) .

[١٣٤] (رواه الطبراني والبيهقي بروانە : الشفا ١/ ٣٢٨)

[١٣٥] (صحيح : رواه البخاري والترمذي ، ورواه غير هما بسياقات اخرى) .

## موعجیزەی (١٣٧) نزاكردنی پێغەمبەر (ﷺ) بۆ سەعد دەبێتە هۆی چاك بوونەوە :

سەعدی كوڕی ئەبو وەققاص –خوای لێ ڕازی بێ –وتی : پێغەمبەری خوا (ﷺ) سەردانی كردم فەرمووی : خوایە شیفای سەعد بدە سێ جار وای فەرموو ، خوای گەورە شیفای بۆناردو چاكی كردەوە لەنەخۆشیەكەی ... [١٣٦]

## موعجیزەی (١٣٨) خوای گەورە دووعاكەی پێغەمبەر (ﷺ) گیرا دەكات و عومەری كوڕی خەتتاب موسڵمان دەبێ :

لە عەبدوڵڵای كوڕی عومەرەوە – خوای لێ ڕازی بێ –لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) دەڵێ فەرمووی : ( خوایە ئیسلام بەعیزەت كەی بەو دوو پیاوە ، بە ئەبوجەهل یان بەعومەری كوڕی خەتتاب [١٣٧] زانای گەورە ( المبار كفوري ) لەشەرحی ئەو فەرموودەدا دەڵێ : بەعیزەت كردنی ئیسلام وەك هێزویارمەتی دان و سەرخستنی بەسەر كوفردا ، بە ئەبوجەهل یان بەعومەری كوڕی خەتتاب بەڵام عومەر لای خوای گەورە خۆشەویست بوو ، بۆیە خوای گەورە ئیسلامەتی خستە دڵی عومەرەوەو موسڵمان بوو .

---

[١٣٦] ( صحيح : اخرجه مسلم ( ١٦٢٨ ) ) .

[١٣٧] ( صحيح سنن الترمذي ٢٩٠٧، والمشكات ٦٠٣٦ ) .

## موعجیزەی (١٣٩) دووعا کردنی بۆعەبدوڵڵای کوڕی عەبباس :

لەهەردوو صەحیحەکەداواتە :لەبوخاری وموسلیم دا هاتووە : لە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسەوە-خوای لێ ڕازی بێ -دەڵێ : پێغەمبەر(ﷺ) چوودەست بەئاو بگەیەنێ ، منیش ئاوی دەست نوێژم بۆ ئامادەکرد فەرموو ی: کێ ئەو ئاوەی ئامادە کردووە ؟ دەڵێ وتم : من فەرمووی : خوایە شارەزای بکە لەئاین دا دووعاکەی پێغەمبەر (ﷺ) خوای گەورە گیرای کرد عەبدوڵلا بوو بەزانایەکی زۆر گەورەو شارەزا لە ئاین دا و ناوی دەرکرد بە تەرجوومانی قورئان [(١٣٨)]

## موعجیزەی (١٤٠) عوسمانی کوڕی عاص قورئانی لەبیرنە دەچۆوە چونکە پێغەمبەر (ﷺ) دووعای بۆکردبوو :

لە عوثمانی کوڕی ئەبی عاصەوە دەڵێ : من قورئانم لەبیردەچۆوە وتم : ئەی پێغەمبەری خوا من قورئانم لە بیر دەچێتەوە ، پێغەمبەر (ﷺ) دەستی موبارەکی کێشا بەسەر سککی عوثمان دا و فەرمووی : وەرە دەرەوە ئەی شەیتان لەناو سنگی عوثمان ، عوثمان دەڵێ هیچ شتێکم لەبیر نەچۆوە لەوەدوا گەرویستبام لەبەری بکەم ... [(١٣٩)]

---

(١٣٨) ( رواه البخاري برقم ١٤٣ واللفظ له ، ومسلم برقم ٢٤٧٧ ) .

(١٣٩) (اخرجه الحارث في مسنده كما في بغية الباحث عن زوائد مسند الحارث رقم (١٠٢٨) والطبراني في المعجم الكبير ٩/٤٧ رقم ٨٣٤٧ وقال الهيثمي في المجمع ٩/٣ وفيه عثمان بن بشر ولم أعرفه وبقية رجاله ثقات ) .

## موعجیزەی (١٤١) نزاکەی پێغەمبەر (ﷺ) بۆ ئەنەس گیرا دەبێت:

لە قەتادەوە-خوای لێ ڕازی -وتی گوێم لە ئەنەسی کوڕی مالیك بوو دەی وت : ئوممو سولەیم وتی : ئەی پێغەمبەری خوا دووعا بۆ ئەنەس بکە پێغەمبەر فەرمووی : (اللهم اکثر مالە ، وولدە ، وبارك لە فیما رزقتە ) واتە: خوایە ماڵێکی زۆرو ، ئەولادی زۆری پێ ببەخشە وە پیت وفەڕبخەرە رزق وڕۆزیەوە ... [١٤٠] بەڵێ : خوێنەری بەڕێز خوای گەورە دووعاکەی پێغەمبەری گیرا کرد ئەنەس دەڵێ : سوێند بەخوا ماڵێکی زۆرم هەیە ، ومنداڵەکانم و منداڵی منداڵەکانم گەیشتوونەتە سەد کەس وەهەروەها ئەنەس دەڵێ من لەهەموو ماڵە ئەنصاریەکانی مەدینەدا زیاتر ماڵم هەیە ئەوەش هەموو بەهۆی بەرەکەتی نزاکەی پێغەمبەرە (ﷺ) کە خوای گەورە ئاوا چاکەی لەگەڵ کردبوو...

## موعجیزەی (١٤٢) خوا بەرەکەت بخاتە ئەو شەوەتانەوە :

لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە -خوای لێ ڕازی بێ- دەڵێ : ئومسولەیم لە ئەبو تەڵعە کوڕێکی هەبوو نەخۆش کەوت لەو نەخۆشیەی کە تیایدا مرد ، کاتێك کەمرد دایکی بە پۆشاکێك دای پۆشی ئەبو تەڵعە هاتەوە وتی: کوڕەکەم چۆنە ؟ ئوموسەلیم وتی : پشووی داوە و ئارامە ئەوشەوە ، وە کەبەشێکی شەوڕۆیی ئوم سولەیم وتی : ئەگەر پیاوێك سپاردەیەکی لەلای تۆ دانا دوایی داوای کردەوە تۆ نایدەیتەوە ؟ وتی : با وتی: خوای گەورە ئەو کوڕەی بەئەمانەت لای تۆدا نابوو، ولە تۆی وەرگرتەوە ، بەیانی چوو بۆلای پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەواڵی

---

[١٤٠] (رواه مسلم في الصحيح عن محمد بن مثنى ، عن أبي داود وأخرجه البخاري من وجهين عن شعبة ) .

پێدا لەوبارەوەو لەوەی ئەوشەوە ڕوویدا پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی : خوا بەرەکەت بخاتە شەوەکەتانەوە ، دەڵێ منداڵێکمان بوو ناومان نا عەبدوڵلاّ ، باس کرا ئەو کوڕە لەچاکترین خەڵکی ئەوسەردەمەی خۆی بوو [١٤١] ئەوەش بەهۆی بەرەکەتی دووعاکەی پێغەمبەر (ﷺ) خوای گەورە ئەوچاکەیەی لەگەڵ ئەو ژن و پیاوەدا کردو ئەو منداڵە خوا ناسەی پێ بەخشین ، وەهەروەها لە ڕیواتەیێکی تردا ئاواهاتووە ، دەڵێ : دایکی ئەنەس ئەبو تەڵعەی مێردی زۆر خۆشدەویست ، منداڵێکیان پەیدا بوو، وەمرد ، ئەبو تەڵعە دەرچوو بوو بۆ دەرەوە بۆکارێکی خۆی ، کاتێك کەلەشەودا هاتەوە بۆماڵ ، خێزانەکەی بە شێوەی ئەو کاتەی بوکێنی کە هاتە ماڵی ئەبو تەڵعە ئا بەوشێوە خۆی بۆ ڕازاندەوە ، ئەوجار چوونە لای یەك وەك ئەوەی پیاو دەچێتە لای خێزانەکەی خۆی ، ئەبو تەڵعە وتی : کوڕەکەم حاڵی چۆنە ؟ خێزانەکەی وتی : ئەی ئەبو تەڵعە چۆنی دەبینی کەئەگەر دراوسێیەك کەل وپەلێکی لەلای دراوسێیەکی دانا دوایی داوای کردەوە ، بەلاّم ئەو نەیدەویست بیداتەوە ئەبو تەڵعە ووتی باش نیە دەبێ بیداتەوە ، وتی دەی کەواتە کوڕەکەمان خوای گەورە بەئەمانەت لەلای ئێمەی دانابوو لێوەرگرتینەوە وەمرد ، کەهاتە لای پێغەمبەر و هەواڵەکەی پێدا پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی : (اللهم بارك لهما في ليلتهما) واتە : خوا بەرەکەت بخاتە شەوەکەیانەوە دووعاکەی پێغەمبەر خوای گەورە گیرای کرد منداڵێکیان پەیدابوو ئەو منداڵە حەوت کوڕی لێ پەیدا بوون هەموویان قورئان خوێن بوون .. بەڕاستی موعجیزەیەکی گەورەیە.

---

[١٤١] -( نقله السيوطي في الخائص الكبرى ١٧٠/٢ عن المصنف ) .

## موعجیزەی (١٤٣) خوای گەورە لەبەر هەوڵ و تێکۆشانی پێغەمبەرەکەی فریای گەنجێك دەکەوێت و لە نەهامەتیەکی گەورە ڕزگاری دەکات :

لە عەبدوڵڵای کوڕی ئەبی ئەوفاوە دەڵێ : ئێمە دانیشتبووین لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا ( ﷺ ) کە یەکێك هات وتی : ئەی پێغەمبەری خوا ئا لەوێ گەنجێك نەخۆشە پێی دەڵێن بڵێ ( لااله الاالله ) بەڵام ناتوانێ وابڵێ : پێغەمبەر ( ﷺ ) هەستا دەڵێ ئێمەش لەخزمەتی دا هەستاین هەتا گەیشتە لای گەنجەکە و فەرمووی : ئەی گەنج بڵێ ( لااله الاالله ) وتی : ناتوانم فەرمووی : بۆ لەبەر چی ، وتی : دڵم قوفڵ دراوە هەرکاتێك دەمەوێ ئەو ووشەیە بڵێم ، فەرمووی : بۆ لەبەر چی ؟ وتی : لەبەر مافی دایکم بەسەرمەوە فەرمووی : دایکت زیندووە ؟ وتی : بەڵێ : ناردی بەدوای دایکیدا ، کەهات ، فەرمووی : بە دایکی کوڕەکە ، ئەوە کوڕتە ، دایکی وتی: بەڵێ : فەرمووی : ئەگەر ببینی ئاگرێکی گەورە بکرێتەوە بە تۆبوترێت ، یان لێ ی خۆش دەبیت ، یان دەیخەینە ئەو ئاگرەوە ؟ ژنەکە وتی : بەڵێ : ئەی پێغەمبەری خوا لێی خۆش دەبم پێغەمبەر ( ﷺ ) فەرمووی : بڵێ خوا شایەدبێ ، تۆش شایەد بە کە ئەوا لێی ڕازی بووم ، ژنەکە : وتی : ئەی خوایە تۆشایەدبە ، وەپێغەمبەرەکەشت شایەد بێ کە ئەوا من لەو ڕازی بووم ، جا پێغەمبەر ( ﷺ ) فەرمووی : ئەی گەنج بڵێ ( لااله الاالله ) گەنجەکە وتی : ( لااله الاالله وحده لاشريك له ) پێغەمبەر ( ﷺ ) سێ جار فەرمووی : سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە بەوە ڕزگاری کردی لە ئاگر... [١٤٢]

---

[١٤٢] ( ذكره الهيثمي في مجمع الزوائد ١٤٨/٨ ) وقال : رواه الطبراني وأحمد باختصار كثير وفيه ابو الورقاء هو متروك ) .

## موعجیزەی (١٤٤) بەهۆی نزای پێغەمبەر (ﷺ) جولەکەیەك موسڵمان دەبێ :

لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە -خوای لێ ڕازی بێ- وتی : جولەکەیەك لەخزمەت پێغەمبەردا (ﷺ) دانیشتبوو پێغەمبەر (ﷺ) پژمی ، جولەکەکەوتی : خوا ڕەحمت پێ بکات پێغەمبەریش (ﷺ) بە جولەکەکەی فەرموو : خوا هیدایەتت بدات ، ئیتر جولەکەکە موسڵمان بوو [١٤٣]

## موعجیزەی (١٤٥) دووعاکردنی پێغەمبەر (ﷺ) بۆ طوفەیلی کوڕی عەمری دەوسیی:

یەکێك لەو پیاوە ناودارانەی کەسەردانی مەککەیان دەکرد ، پیاوێك بوو بەناوی طوفە یلی کوڕی عەمری دەویسی ، کە پیاوێکی بەڕێزی ماقووڵی ژیری خاوەن سەلیقە بوو ، دەستی شیعریشی هەبوو ، طوفە یل خۆی باس دەکات کە جارێکیان دێتە شاری مەککە و دەبینێ وا پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەوێ یە ، کەقورەیشی یەکان چاویان بە طوفە یل دەکەوێ ، خێرا چەند پیاوێکیان دەورەی لێ دەدەن تا بەر لەوەی ڕێی لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) بکەوێت و گوێ لەدەنگ وباسی دینی تازە بگرێ ، ئەوان مێشکی پڕ بکەن ، چوونە لای و پێیان وت : طوفەیل تۆ هاتوویتەوە وڵاتی ئێمەو ، ئەم پیاوەش کەوا لەناومان دا گیرمان خواردووە بە دەستیەوە : کۆڕو کۆمەڵمانی پەرتەوازە کردووە ،ئێمە دەترسین ئەوەی بەسەر ئێمەدا هاتووە

---

[١٤٣] ( نقله السيوطي في الخاصائص الكبرى ١٦٧/٢ عن المصنف ) .

بەسەر تۆو خزمەکانیشت دا بێت ، بەهیچ شێوەیەك قسەی لەگەڵ نەکەیت و ،گوێ شی لێ نەگریت ، طوفەیل دەڵێت : دەبە خوا ئەوەندەیان باس کرد بۆم تائەوەبوو ها تمە سەر ئەوەی کە گوێ بۆ قسەیەکی نەگرم و قسەیەکیشی لەگەڵدا نەکەم ، هەتا کەبەیانی چووم بۆ مزگەوت ، لەترسی ئەوەی ئەوەکو قسەیەکی بەرگوێم بکەوێ و کارم تێ بکاو منیش نەمەوێ بی بیستم و حەزی پێ نەکەم لەترسی ئەوە هەردوو گوێم بە لۆکە ئاخنین ، دەڵێ : بۆ بەیانی چووم بۆ مزگەوت و دەبینم پێغەمبەری خوا( ﷺ ) وا لەمزگەوتدا و لە پەنای کەعبەدا نوێژ دەکات ، منیش لەنزیکی دا ڕاوەستام خوای گەورە ویستی وەها بوو هەندێ لە فەرمایشتەکانی بدات بە گوێم دا ، فەرمایشتێکی جوانم بیست ، طوفەیل : دەڵێ لە دڵی خۆمدا وتم : دایکم ڕۆڵە ڕۆم بۆ بکات ، خۆمن پیاوێکی ژیری شیعر زانم و چاك وخراپم لێ تێك ناچێ ، باشە چی تیادایە ئەگەر گوێ لەم پیاوە بگرم بزانم چی دەڵێ؟ ئەگەر شتی چاکی بۆ باس کردم ئەوا وەری دەگرم و ، ئەگەر خراپیش بوو وازی لێ دێنم ، دانم بەخۆدا گرت هەتا پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) گەڕایەوە بۆ ماڵەوە دوای کەوتم هەتا کەچووە ماڵەوە ، منیش چوومە ژوورەوە لای و وتم : بەوەی کە پێمیان وتبوو دە بەخوا ئەوەندەیان ترساندم لەو کارەی تۆ هەتا گوێم بە لۆکە ئاخنین تا قسەکانت نەبیستم ، بەڵام خوای گەورە ویستی وەها بوو شتێکی لێ ببیستم ، بە ڕاستی فەرمایشتێکی جوانم بیست دەتۆش دینەکەتم بۆ باس بکە ، ئەویش ئیسلامی بۆ باس کردم و قورئانی بۆ خوێندم دەڵێت : دەبە خوا هەرگیز فەرمایشی لەوە جوانترو ، فەرمانی لەوە ڕاست تر وبەدادترم نەبیست بوو ، دەڵێت : ئیتر موسڵمان بووم وشەهادەتی هەقم هێنا و وتم : ئەی پێغەمبەری خوا ، من پیاوێکم لە ناو خزمەکانم دا گوێ ڕایەڵیم بۆ دەکرێ و ، دەشمەوێ بگەڕێمەوە ناویان و بۆموسڵمان بوون بانگیان بکەم جا لە خوای گەورە داوا بکە نیشانەیکم پێ ببەخشێ تالە بانگ کردنیان دا بۆ سەر ئیسلام یارمەتیم بدات ، پێغەمبەریش ( ﷺ ) فەرمووی : ( اللهم اجعل له اية ) طوفەیل دەڵێ: بەرمو لای قەومەکەم

کەوتمە ڕێ ، هەتا کە گەیشتمە دەربەندێك کە خەڵکەکەم لێوە دەر ئەکەوت ، نورێك بەوێنەی چرا لە نێوان هەردوو چاوم دا پەیدا بوو ، ئەڵێ : وتم : خوایە بابەدەم و چاومەوە نەبێت ، چونکە ئەترسم واتێ بگەن کە ئەمە تۆڵە و پێ نواندنە لەدەم وچاومدا ، لەسەر وازهێنان لە دینەکەیان ، پەیدا بووە ئەڵێ : نوورەکە لەوێ گوازرایەوە بۆ سەرنووکی قامچی یەکەم ، بەشێوەیەك کەکاتێ لە دەربەندەکەوە دا ئەبەزیمەوە خوارەوە خەڵکەکە بە قامچی یەکەمەوە ئەو نوورەیان وەك چرای هەڵواسراو ئەبینی ، هەتا گەیشتمە لایان کاتێ کە دابەزیم باوکم کە ڕیشی سپی یەکی بەتەمەن بوو هات بۆ لام ، ئەڵێ : وتم : بابەگیان لیم دوور بکەرەوە ئەتۆ پەیوەندیت بەمنەوە هەیە و ، ئەمنیش بە تۆوە وتی: بۆچی ئەی کوڕەکەم ؟ ئەڵێ :وتم : من موسڵمان بووم و شوێن دینی موحەممەد ( ﷺ ) کەوتووم باوکم وتی: دینی من دینی تۆیە ، چوو خۆی شۆردو جل وبەرگەکەی خاوێن کردەوە و پاشان هات ئیسلامم بۆ باس کرد و ئەویش موسڵمان بوو ، دەڵێت : دوای ئەوە هاوسەرەکەم هات بۆ لام و پێم وت دوور بکەرەوە ، وتی بۆچی ؟ ئەڵێ : وتم ئیسلام من وتۆی جیاکردۆتەوە ، ئیتر ئەویش موسڵمان بوو ، داوام لە دەوسیش کرد تا موسڵمان ببن ، کەچی خێرا بەدەممەوە نەهاتن ، طوفەیل وەك خەم خۆرو دڵسۆزی خۆی وکەس وکاری بوو وەهاش دڵسۆزی هۆزەکەی بوو ، پێی خۆش بوو موسڵمان ببن و لەسزای ئاگری دۆزەخ سەرفرازبن ، جا کەبینی وا هۆزی دەوس بۆ موسڵمان بوون سستی ئەکەن ، دێتەوە خزمەتی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) لە مەککەو، ئەڵێ : ئەی پێغەمبەری خوا دەوس بە گوێم ناکەن ، لەبەر ئەوە دووعایان لێ بکە ، پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) دڵی نەهات دووعایان لێ بکات ، بەڵکو دووعای هیدایەتی بۆکردن کە فەرمووی : (اللهم اهد دوسا ) پاشان بە طوفەیلی فەرموو : (ارجع الى قومك فادعهم وارفق بهم) فەرمووی : بگەڕێرەوە بۆناو قەومەکەت ، بانگیان بکەوبەنەرمی لەگەڵیان بجووڵێرەوە طوفەیل ئەڵێ : گەڕامەومو بەردەوام لەناوچەی دەوس دا خەریکی بانگ کردنیان بووم بۆ سەر ئیسلام هەتا

پێغەمبەری خوا (ﷺ) کۆچی بۆ مەدینە کردو لە جەنگی بەدرو ئوحودوخەندەق بوویەوە ، دوای ئەوە بەخۆم و ئەو خزمانەمەوە کە موسڵمان بووبوون هاتینە خزمەتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەبینین تەشریفی لە خەیبەرەو، منیش لەگەڵ حەفتایان هەشتا ماڵی دەوس هاتینە مەدینە [(١٤٤)،(١٤٥)]

## موعجیزەی (١٤٦) بەرەکەتی دەستی موبارەکی پێغەمبەرو دوو موعجیزەی زۆر گەورەو بەناوبانگ:

سەلمانی فارسی کۆیلەی جوولەکەکان بوو، ئاغاکانی پەیمانیان بۆ نووسی لەکۆیلەیی ئازادی بکەن، بەمەرجێ سێ سەد شەتڵ خورمایان بۆبرۆێنێت و سەوز بن وبەریان دەربکەوێت وبخورێت وئینجا چل ئۆقیەش ئاڵتوونیان بداتێ پێغەمبەر (ﷺ) هەڵسا و هەموو ئەو شەتلانەی بەدەستی پیرۆزی خۆی بۆ ناشت ، یەکێکیان نەبێت کەیەکێکی تر ناشتی هەموویان سەوزبوون ئەویەکە نەبێت ، پێغەمبەر (ﷺ) هەڵی کێشاو لەجێی خۆیدا سەرلەنوێ ناشتیەوە ، ئینجا ئەویش سەوزبوو ، بەززار لە کتێبەکەیدا دەگێڕێتەوە کەهەر ئەوساڵە دار خورماکان بەرەکەیان دەرکەوت ، یەکێکیان نەبێت ، ئەویش پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەڵی کێشاو ناشتیەوە ، هەرلەو ساڵەدا ئەویش بەرەکەی دەرکەوت ئینجا بە ئەندازەی هێلکەیەك ئاڵتونی بەسەلمان دا ، دوای ئەوەی کە هێنای بەسەر زمانی خۆیدا ، تاکو بیبات بۆ ئاغاکانی کە بۆی بردن ، چل ئۆقییەی لەو ئاڵتونە بۆ کێشان و، هێشتا بە ئەندازەی ئەوەی دای بەوان

---

(١٤٤) ( ذكره في البداية ٣/١٠٠ ) عن ابن اسحاق مع زيادة بسيرة ) .

(١٤٥) ( شرح حياة الصحابة : ١/ ٣٥٤-٣٥٦ )

لەو ئاڵتونەمایەوە [١٤٦] الله اكبر لەو موعجیزە گەورەو بەناوبانگە بەڕاستی ئەوانە موعجیزەی ئەوەندە گەورەن كەبەقەد تۆزقاڵێك گومان و دوودڵی ناهێڵن لە ناو دڵەكاندا و وەك رۆژی رووناك پێغەمبەرایەتی پێغەمبەری ئیسلام دەسەلمێنن ، بەڕاستی موعجیزە بەڵگەیەكی هەرە سەرەكی و ئێكجار گەورەیە بۆ رێنمایی مرۆڤ بەرەو رێگای ڕاست و مایەی بەخشینی ئارامی و دڵنیایی بە دڵ ودەروون سوپاس بۆ خوای گەورە و پەروەردگار وە دروود بۆ گیانی پاكی پێغەمبەری پایەداری ئیسلام ( ﷺ ) .

## موعجیزەی (١٤٧) هیزە رۆنەكەی ئوم مالیك و موعجیزەیەكی گەورە:

ئوم مالیك كەیەكێكە لە هاوەڵان هیزەیەكی هەبوو رۆنی تێدەكردو بەدیاری بۆ پێغەمبەری ( ﷺ ) دەبرد ، پێغەمبەر ( ﷺ ) فەرمانی پێ دا كەهەڵی بگرێت و نەیگووشێت ، ئینجا هیزەكەی دایەوە بە ئوم مالیك سەیری كرد هێشتا هەر پڕە لە رۆن ، جا هەركاتێك منداڵەكانی داوای پێخۆریان لێ دەكرد ، ئەگەر هیچیان نەبوایە دەچوو بۆلای هیزەكەو رۆنی لێ دەردەهێنا بەم جۆرە مایەوە لایان ، تا جارێكیان هیزەكەیان گووشی ، ئیتر پاش ئەوە رۆنیان تێدا نەبینی یەوە [١٤٧]

---

[١٤٦] ( حديث حسن : رواه أحمد واللفظ له ، والبزار والطبراني والبيهقي ) .

[١٤٧] ( صحيح : رواه مسلم واللفظ له ، و أحمد ) .

## موعجیزەی (١٤٨) هیچ بیرێك لە مەدینەدا بە ئەندازەی ئەوبیرە ئاوە ئاوەکەی خۆش و سازگار نەبوو :

ئەبوو نەعیم لە (دلائل النبوة) داو پیاوانی تری فەرموودە دەگێڕنەوە کە بیرێك لە ماڵی ئەنەسدا هەبوو ، پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئاوی دەمی خۆی ڕۆکردە ناو ئەو بیرەو دووعای کرد ، پاش ئەوە هیچ بیرێك لە مەدینەدا بە ئەندازەی ئەو بیرە ئاوەکەی خۆش و سازگار نەبوو [١٤٨] وە هەروەها ئیمامی بەیهەقی و پێشەوا یانی تری فەرموودە دەگێڕنەوە : هەندێك جار بیری (قەبا) ئاوەکەی کەمی دەکرد تا هیچی تێدا نەدەما پێغەمبەر(ﷺ) لە پاشماوەی دەست نوێژی خۆی کردە ناوی لە پاش ئەوە ئیتر وای لێ نەهاتەوە [١٤٩] وەهەروەها ئیمامی ئەحمەدی کوڕی حەنبەل دەگێڕێتەوە کە : جارێکیان دۆڵچەیەك ئاویان لەبیرێکەوە هێنا بۆ پێغەمبەر (ﷺ) ئەویش ئاوی لەدەمی وەرداو کردیەوە ناوی ، ئینجا ئەو دۆڵچە ئاوە کرایەوە ناو بیرەکە ، لە پاش ئەوە ، بۆنی ئاوی ئەوبیرە لەهی میسك خۆشتر بوو [١٥٠] وەهەروەها ئیبن ماجە دەگێڕێتەوە کە دۆڵچەیەك ئاوی زمزمیان هێنایە خزمەتی پێغەمبەر (ﷺ) ئەویش ئاوی لە دەمی ڕادا وکردیەوە ناوی ، لە پاش ئەمە ، بۆنی ئەو ئاوە لەبۆنی میسك خۆشتربوو.. [١٥١]

---

(١٤٨) (الشفا ١/ ٣٣١)

(١٤٩) ( رواه البيهقي بروانه : الشفا ٣٣١/١ ) .

(١٥٠) (صحيح : (رواه الامام أحمد ) .

(١٥١) ( حديث : صحيح (رواه ابن ماجه واحمد ) .

## موعجیزەی (١٤٩) کەسەرنجی خورماکانی دا هەر دەتوت هیچی لێ کەم نەبۆتەوە :

جابیر – خوای لێ ڕازی بێ – دەڵێ : عەبدوڵلای کوڕی عمرو وەفاتی کرد قەرزداریش بوو ، چووم بۆ خزمەتی پێغەمبەر (ﷺ) تا هاوکاریم بکات بۆ ئەوەی خاوەن قەرزەکان لە قەرزەکانیان ببورن پێغەمبەر (ﷺ) داوای لێکردن کەچی ئەوان لێینەبووردن ئەوسا پێغەمبەر ((ﷺ)) پێی وتم : بچۆ خورماکانت جیا بکەرەوە (عجوة) بەجیاو (غدق زید) بەجیا پاشان بنێرە بە شوێنمدا منیش هەروام کردو پاشان ناردم بەشوێن پێغەمبەر (ﷺ) ئیتر ئەولای سەرووی یان ناوەڕاستیەوە وەستا پاشان فەرمووی : ئادەی بۆ خزمان بکێشە ، منیش بۆم کێشان و هەتا بەقەد قەرزەکانیان هەقی خۆیان وەرگرت کەسەرنجی خورماکانم دا هەر دەتوت هیچی لێ کەم نەبۆتەوە ...[١٥٢] وەهەروەها لە پوختەی صەحیحی بوخاریدا لاپەڕە (٨٣٦) دا ئاوا هاتووە جابری کوڕی عبدواللە خوایان لێ ڕازی بێ دەڵێت : مەدینە پیاوێکی جولەکەی لێ بوو پێشینەی بۆ خورماکەم دەدامێ تاکاتی چنینەوەی باخەکەی جابیر لەرێگەی (ڕومەوە) بوو ساڵێك بەرهەمی نەبوو جابر دەڵێت جولەکەکە هاتوو هیچم لێ کۆ نەکردبۆوە داوام لێکرد چاوەڕێ بکا بۆ ساڵی داهاتوو ئەویش قبوڵی نەکرد ئەو هەواڵە گەیشتە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی باهاوەڵانی بێن با داوای دووا خستن لە جولەکەکە بۆ جابیر بکەین دەڵێ هاتن بۆ لام بۆ باخەکەم پێغەمبەر (ﷺ) لەگەڵ جولەکەکە قسەی دەکرد ئەویش دەی ووت : ئەبولقاسم دووای ناخەم کە پێغەمبەر (ﷺ) ئەوە بینی هەڵسا بە باخەکەدا گەڕا پاشان هاتەوە و لەگەڵ جولەکەکەدا قسەی کرد کەدووای بخات هەر قبووڵی

---

[١٥٢] (پوختەی صەحیحی بوخاری لاپەڕە ٨٣٦).

نەکرد جابیر دەڵێت : هەستام و کەمێك خورمام هێناو لەبەردەم پێغەمبەر دا (ﷺ) دام نا خواردی پاشان فەرمووی : کەپرەکەت شوێنی کۆکردنەوەی خورماکەت لە کوێ دایە؟ دەڵێت نیشانمدا فەرمووی : جێگەیەکم تیایدا بۆ ڕا بخە جێگەم ڕاخست چووە ناوی و تیایدا ڕاکشا پاشان هەڵسا مشتێکی تر خورمام بۆ هێنا و لێی خوارد پاشان ن هەڵسا و قسەی لەگەڵ جولەکەکە کرد هەر ڕازی نەبوو بۆ جاری دووەم بەناو خورما گەیشتووەکانی باخەکەدا گەڕا پاشان فەرمووی : جابیر بیچنەرەوەوە و قەرزەکەی بدەرەوە جولەکە وەستا خورماکانم چنیەوە و قەرزەکەی ئەوم لێ دایەوە و لێشیی زیاد بوو پاشان چووم تا گەیشتمە لای پێغەمبەر (ﷺ) مژدەم دایە فەرمووی : شاهیدی دەدەم کە من پێغەمبەری خوام(ﷺ)

## موعجیزەی (١٥٠) دووعاکردنی پێغەمبەر ((ﷺ)) بۆ عەبدوڵڵای کوڕی هیشام :

عەبدوڵڵای کوڕی هیشام – خوای لێ ڕازی بێ – کەبەخزمەتی پێغەمبەر (ﷺ) گەیشتووە بە منداڵی و دایکی کە زەینەبەی کچی حەمیدە بردی بۆ خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) و وتی : بەیعەتی لێ وەرگرە ئەی پێغەمبەری خوا ، ئەویش فەرمووی : ئەوە منداڵە ئەمجا دەستی هێنا بەسەریداو دووعای خێری بۆکرد هەر لەوەوە دەگێڕنەوە کە دەرچووە بۆ بازاڕ و خۆراکی دەکڕی ئیبن عومەر و ئیبن زوبەیر –خوای گەورە لێیان ڕازی بێ –پێیان دەووت : بەشمان بدە چونکە پێغەمبەر (ﷺ) دووعای بەرەکەتی بۆکردوویت ئەویش بەشی دەدان جاری واش هەبوو باری ووشترەکە هەروەکو خۆی بوو کەدەیناردەوە بۆ ماڵەوە لێی کەم نەدەبوو..[١٥٣]

---

(١٥٣) پوختەی صحیحی بوخاری لاپەڕە ٤٨٨) .

## موعجیزەی (١٥١) باران بارین بەهۆی دووعای پێغەمبەر (ﷺ)

ئەنەسی كوڕی مالیك – خوای لێ ڕازی بێ – دەڵێت : لەسەردەمی پێغەمبەر (ﷺ) خەڵكی تووشی بێ بارانی بوون ، لە كاتێكدا پێغەمبەر (ﷺ) لەسەر مینبەر بوو ، ووتاری جومعەی دەخوێندەوە ، دەشتەكیەك هەستاو وتی : ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ماڵمان لەناوچوو ، منداڵمان برسی بوو ، دووعامان بۆبكە ، ئەویش هەردوودەستی بەرزكردەوە و ئێمە هیچ پەڵەهەورێكمان بە ئاسمانەوە نەدی، سوێند بەوكەسەی كە گیانی منی بە دەستە ، دەستی دانەگرت تاوەكو هەمووهەورەكان بەچەشنی شاخان چوون بەیەكدا ، هەروەها لەمینبەرەكەی نەهاتە خوارەوە تا ئاو بەریشی موبارەكی دا چۆڕاوگی بەست ، ئەو ڕۆژە باری ، بەیانی و دوای بەیانیشی تا جومعەكەی تر هەتا ئەو پیاوە دەشتەكیە ، یان كەسێكی تر لەجومعەدا هەستاو وتی :ئەی پێغەمبەری خوا خانووەكانمان رووخا ، ماڵمان نوقم بوو ، لە خوا نزامان بۆ بكە ، ئەویش دەستەكانی بەرزكردەوە و فەرمووی : خوایە بەسەر خۆمانی دا مەبارێنە ، بەڵكو بەسەر چواردەورماندا ، بەدەستی ئاماژەی بۆ هەرشوێنێك بكردایە ، خێرا هەورەكان دەڕەوینەوە ، تا شاری مەدینە وەكو بازنەو كلاو ڕۆژنەی لێ هات واتە : هەورەكە لەسەری ڕەوی یەو شیوی قەناتیش یەك مانگ لافاوی لێ هەڵنیشتبوو ، هەر كەسیش كەلە هەرلایەكەوە دەهات ، باسی ئەوبارانە زۆرەی دەكرد ... [١٥٤]

هەروەها لە ڕیوایەتێكی تردا ئاوا هاتووە ئەنەسی كوڕی مالیك –خوای لێ ڕازی بێ – دەڵێت : پیاوێك ڕۆژی جومعە لە دەرگایەكەوە كە بەرامبەر مینبەرەكە بوو هاتە ژوورەوە و پێغەمبەریش (ﷺ) بە پێوە بوو ووتاری دەخوێندەوە ، كابرا وەستاو ڕووی كردە پێغەمبەر

---

[١٥٤] ( پوختەی صەحیحی بوخاری لا پەڕە ٢٢٠ ) .

(ﷺ) و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) مەڕومالآت لەناوچوون ، ڕێگاوبانەکان چۆڵ بوون داوابکە بارانمان بۆببارێ دەڵێت پێغەمبەر (ﷺ) هەردوودەستی بەرزکردەوە ووتی : خوایە بارانمان بۆ ببارێنی ، خوایە بارانمان بۆ ببارێنی ، خوایە بارانمان بۆ ببارێنی ، ئەنەس دەڵێ : سوێند بەخوا هیچ هەورێك هیچ پەڵە هەورێك هیچ شتێکمان بە ئاسمانەوە نەبینی لەنێوان ئێمەو (سلع) دا هیچ خانوویێك نەبوو ، دەڵێت : لەپشت (سلع)دا پەڵە هەورێك لەشێوەی بازنەیەکدا دەرکەوت و کاتێك گەیشتە ناوەڕاستی ئاسمان بلآوبوویەوەو باران باری دەڵێت : سوێند بەخوا تا شەش ڕۆژ خۆرمان نەبینی ، جومعەی داهاتوو پیاوێك لەدەرگای پێشەوەی مزگەوت هاتە ژوورەوە و پێغەمبەریش (ﷺ) بە پێوەبوو ووتاری دەخوێندەوە ، پیاوەکە هەستاو ڕووی تێکردو وتی : ئەی پێغەمبەری خوا ماڵمان وێران بوو ، ڕێگاوبان نەما ، دووعای بکە خۆشکاتەوە ، دەڵێت : پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەستەکانی بەرز کردەوە و پاشان فەرمووی : ئەی خوایە بە چواردەورماندا ، نەك بەسەرماندا ، ئەی خوایە بەسەر تەپۆلکە لم وچیاکاندا بەسەر بێیەش و گردۆلکەکاندا ، بەسەر شیوو درەختەکان دا ڕاوی : دەڵێت : خۆشی کردەوە، کاتی دەرچووین هەتاوبوو .. (١٥٥)

## موعجیزەی (١٥٢) مسوڵمان بوونی دایکی ئەبو هورەیرە بەهۆی دووعای پێغەمبەر (ﷺ):

ئەبو هورەیرە خوای لێ ڕازی بێ دەڵێ:من داوام لە دایکم دەکرد بۆ لای ئیسلام و مسوڵمان بوون، کە ئەو ژنێکی موشریك بوو، دەڵێ ڕۆژێك بانگم کرد بۆ لای ئیسلام شتێکم لێ بیست

---

(١٥٥) ( پوختەی صحیحی بوخاری لاپەڕە ٢٣٦ ) .

دەربارەی پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ پێم ناخۆش بوو، ڕۆیشتم بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾لەکاتێکدا من دەگریام، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا من بانگی دایکم کرد بۆ لای ئیسلام بەلام بەقسەی نەکردم، ئەمڕۆ بانگم کرد دەربارەی تۆ شتێکم لێ بیست پێم ناخۆش بوو، داوا لە خوا بکە کە ڕێنمای دایکی ئەبوهورەیرە بکات، پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ فەرمووی: خوایە هیدایەتی دایکی ئەبوهورەیرە بدە، دەڵێ: دەرچووم بە مزگێنییەوە بەهۆی دووعای پێغەمبەرەوە ﴿ﷺ﴾ کە گەیشتمە جێ بۆ لای دەرگا ڕۆیشتم، گوێم لە خشەی پێی دایکم بوو، ووتی لە جێگای خۆت بوەستە ئەبوهورەیرە ووتی گوێم لە خشەخشەی ئاو بوو، کاتێك خۆی شوشت جلەکانی لەبەر کردەوە و بە پەلە خۆی داپۆشی، دەرگای کردەوە ئەوجا ووتی:

ئەی ئەبوهورەیرە (أشهدوا أن لاإله إلاالله، وأشهدوا أن محمداً عبده ورسوله) دەڵێ: گەڕامەوە بۆ لای پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ دەگریام لە خۆشیدا دەڵێ ووتم ئەی پێغەمبەری خوا مژدە بێ لێت خوای گەورە دوعاکەی گیرا کردی هیدایەتی دایکی ئەبو هورەیرەی دا سوپاس و ستایشی خوای گەورەی کرد و فەرمووی زۆر چاکە دەڵێ ووتم ئەی پێغەمبەری خوا داوا لە خوای گەورە بکە کە من و دایکم خۆشەویست بکات لەلای بەندە ئیماندارەکان و ئەوانیش لای ئێمە خۆشەویست بکات، دەڵێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: خوایە خۆشەویستی بکە بەندەکەت ئەبوهورەیرەو دایکی لەلای بەندە بڕوادارەکانت، وە ئیمانداریش لەلای ئەوان خۆشەویست بکەی (١٥٦)

## موعجیزەی (١٥٣) پێغەمبەری خوا فوو دەکات بە قاچی سەلەمەی کوڕی ئەکوەع برینەکەی سارێژ دەبێ:-

لە یەزیدی کوڕی ئەبو عوبەیدەوە دەڵێ: شوێنی لێدانێکم بە بە قاچی سەلەمەی کوڕی ئەکوەعەوە بینی پێم ووت: ئەو لێدانە چییە؟ ووتی لێدانێکە کەتووشم بووە ڕۆژی جەنگی خەیبەر، خەڵکەکە وتیان سەلەمە پێکرا، پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ هات بۆ لای سێ فووی کرد لە شوێنی پێکرانەکە، هەتا ئێستا هەستم بە هیچ ئێشێك نەکردووە [١٥٧]

## موعجیزەی (١٥٤) سپی نەبوونی سەری سائیبی کوڕی یەزید بەهۆی دەست لێدانی پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾:

لە عە طائە وە مەولای سائیبی کوڕی یەزید دەڵێ: سائیبی کوڕی یەزیدم بینی ڕیشی سپی بووبوو بەڵام سەری ڕەش بوو، دەڵێ: ووتم: ئەی گەورەم بۆچی سەرت سپی نەبووە؟ ووتی: قەت سەرم سپی نابێ، ئەوەش لەبەر ئەوەی جارێك پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ تەشریفی دەڕۆی بەرێگادا و بەلای ئێمەدا دەهات وە من منداڵ بووم یاریم دەکرد لەگەڵ منداڵەکان، سەلامی کرد، وەمن لەناو منداڵەکاندا بووم، وەڵامی سەلامەکەم دایەوە لەناو منداڵەکاندا، بانگی کردم فەرمووی: پێم بڵێ ناوت چییە؟ ووتم ناوم سائیبی کوڕی یەزیدە کوڕی خوشکی (النمر) دەستی پیرۆزی لەسەر سەرم دانا وە فەرمووی: (بارك الله فیه) شوێنی دەستی پیرۆزی پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ هەرگیز سپی نابێ... بەڕاستی موعجیزەیەکی گەورەیە بەڕاستی

---

[١٥٧] (البخاري في المغازي فتح ٩م١١).

ئەوانە موعجیزەی ئەوەندە گەورەن کە بەقەد تۆسقاڵێك گومان و دوو دڵی ناهێڵن لەناو دڵەکاندا وەك ڕۆژی ڕووناك پێغەمبەرایەتی پێغەمبەری ئیسلام دەسەلمێنن .

بەڕاستی موعجیزە بەڵگەیەکی هەرە سەرەکی و ئێجگار گەورەیە بۆ ڕێنمایی مرۆڤ بەرەو ڕێگای ڕاست و مایەی بەخشینی ئارامی و دڵنیاییە بە دڵ و دەروون سوپاس بۆ خوای گەورەو پەروەردگار وە درود بۆ گیانی پاکی پێغەمبەری پایەداری ئیسلام (ﷺ) [158]، لەو شوێنەی کە پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ دەستی پیرۆزی پێدا هێنابوو ئەوە ڕەش بوو، بەڕاستی موعجیزەیەکی گەورەیە [159].

## موعجیزە ی (١٥٥) : چاك بوونەوەی زمان گیرانی بەشیر بەهۆی چارەسەرکردنی لەلایەن پێغەمبەری خواوە (ﷺ) :

لە بەشیری کوڕی (**عقربة الجهني**) یەوە ووتی : باوکم (**عقربة الجهني**) بردمی بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی : ئەوە کێیە لە گەڵت ئەی **عقربة**؟ وتی : کوڕەکەمە (بەحییر) فەرمووی نزیك بەرەوە لێم دەڵێ : نزیك بوومەوە لێ ی هەتا لە لای ڕاستی پێغەمبەردا (ﷺ) دانیشتم دەستی موبارەکی بەسەرم دا هێناو فەرمووی ناوت چییە؟ وتم ناوم بەحیرە ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی : نەخێر بەڵکو تۆ ناوت بەشیرە دەڵێ : لە زمانمدا گرێیەك هەبوو پێغەمبەری خوا (ﷺ) فووی کردە دەمم گرێیەکە لە زمانم لاچوو و زمان گیرانەکەم چاك بوومەوە وەدەڵێ هەموو شوێنێکی سەرم سپی بو جگە لەو شوێنەی کە

---

[158] (أخرجه الطبراني في الكبير ١٩٠/٥ والأوسط (٣٩٠٢) مجمع البحرين والصغير ٢٤٩/١ وقال الهيثمي وذكره الحافظ وأخرجه ابن عساكر في تاريخ دمشق ٢٠/ ١١٥-١١٦).

[159] أخرجه إسحاق بن إبراهيم الرملي في فوائده، كما ذكره الحافظ في الأصابة ١٥٤/١/ ٦٧١).

پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەستی پیرۆزی پیادا هێنا بوو ئەو ڕەش بوو بەڕاستی موعجیزەیەکی گەورەیە ( اخرجه اسحاق بن ابراهيم الرملي في فوائيده ، كما ذكره الحافظ في الاصابة ١٥٤/١ /٦٧١ )

## موعجیزەی (١٥٦)تەمەنی هەشتا ساڵ بوو نیشانەی پیری لێ دەرنەکەوتبوو:

پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ دەستی شیفا بەخش و موبارەکی خۆی بەسەری عومەیری کوڕی سەعددا هێناو دووعای بەرەکەتی بۆ کرد، کاتێ کە عومەیر کۆچی دوای کرد تەمەنی هەشتا ساڵ بوو، کەچی هێشتا نیشانەی پیری لێ دەرنەکەوتبوو[١٦٠].

## موعجیزەی (١٥٧) هیچ ئافرەتێك نەبینراوە دەمووچاوی ئەوەندە جوان بێت:-

جارێکیان پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ دەست نوێژی دەگرت، لە ئاوی دەست نوێژەکەی بە دەمووچاوی زەینەبی کچی ئوم سەلەمەدا پرژاند کە هێشتا منداڵ بوو، لەپاش ئەوە هێندە جوان بوو، دەیان ووت هیچ ئافرەتێك نەبینراوە دەمووچاوی هێندە جوان بێت[١٦١].

---

[١٦٠] الشفاء ٣٣٤/١ ).

[١٦١] ( رواه الطبراني ، الشفاء ١/ ٣٣٤ ).

## موعجیزەی (١٥٨) لەتەمەنی سەد ساڵیدا کۆچی دوای کرد کەچی جێگای دەستەکەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەرەشی مابۆوە:-

پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەستی موبارەك و پیرۆزی بەسەری قەیسی کوڕی زەیدی جوزامیدا هێناو دوعای بۆ کرد، کاتێك قەیس لەتەمەنی سەد ساڵیدا کۆچی دوای کرد، سەری سپی بووبوو، بەڵام جێ دەستەکەی پێغەمبەر (ﷺ) هەر بە ڕەشی مابۆوە، لەبەر ئەوە پێیان دەووت (الأغر) واتە: سەرماش و برنج[١٦٢].

## موعجیزەی(١٥٩)کەسێکی ناشیرین بوو بەڵام بە بەرەکەتی دەستی پیرۆزی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بوو بە پیاوێکی کەڵەگەت و جوان:-

عەبدولڕەحمانی کوڕی زەیدی کوڕی خەتتاب بە منداڵی ناشیرین بوو، پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەستی پیرۆزی بەسەریدا هێناو دووعای بەرەکەتی بۆ کرد، کە گەورە بوو، بوو بە پیاوێکی کەڵەگەت و جوان[١٦٣].

---

(١٦٢) (الشفاء ١/ ٣٣٤).

(١٦٣) (الشفاء ١/ ٣٣٥ الإستيعاب ٨٢٣/٢، الإصابة ٣٦/٥).

## موعجیزەی(١٦٠)ئەو جێ دەستەی سپی و دیار بوو :

ڕووخساری (عائیذي کوری عەمر) لە ڕۆژی غەزای حونەیندا بریندار بوو خوێنی پێیادا دەهاتە خوارەوە پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ خوێنەکەی لە ڕووخساری سڕی و دووعای بۆ کرد، ئیتر ئەو جێ دەستەی وەك ناوچاوی ئەسپ سپی و دیار بوو[١٦٤]...

## موعجیزەی (١٦١) ڕووخساری بریقەی لێوە دەهات بە بەرەکەتی دەستی پیرۆزی پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾:

جارێکیان پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ دەستی پیرۆزی بەسەر دەم و چاوی قەتادەی کوڕی میلحان داهێنا، لە پاش ئەوە ڕووخساری قەتادە بریقەی لێوە دەهات بە چەشنێك کە چۆن سەیری ئاوێنە دەکرێت بەو جۆرەش سەیری دەم وچاوی ئەو دەکرا[١٦٥].

بەڕاستی پێویستە ئیمانداران ئەو موعجیزە گەورەو بەناوبانگانەی پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ پێشکەش بە مرۆڤی سەرگەردان بکەن کە گەورەترین دیاری یەو مایەی سەرفیرازی دنیاو قیامەتە هەزاران درود بۆ گیانی پاکی ئەو پێغەمبەرە پایەدارە﴿ﷺ﴾.

---

(١٦٤) ( أخرجه الحاكم واللفظ له، والطبراني، الشفاء ١/ ٣٣٤ ).

(١٦٥) ( الشفاء ١/ ٣٣٤ ورواه الإمام أحمد بغير هذا السند، ورجاله رجال الصحيح ).

## موعجیزەی (١٦٢)ساڕێژ بوونی برینەكەی قەتادە بە دەستی شیفا بەخشی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾:

لە فەرموودەی صەحیح دا چەسپاوە كە پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ ئاوی دەمی خۆی خستە سەر ئەو برینەی كە تیرێك لە جەنگی زی قەرەد دا كە غەزایەك بوودوای ڕێكەوتننامەی حودەیبیە لە نزیك مەدینەو لە باكوورییەوە ڕوویدا لە دەمووچاوی قەتادەدا درووست كردبوو، قەتادە دەڵێ: لە دوای ئەوە برینەكەم نە ئازاری دام، نە كێمیشی كرد چونكە پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ دەستی پیرۆزی بەسەردا هێنا بوو (١٦٦).

## موعجیزەی (١٦٣)چاك بوونەوەی دەستە قرتاوەكەی موعە ووە ذی كوڕی عەفرا لە غەزای بەدردا :

لە غەزای بەدردا ئەبو جەهل دەستی موعە ووە ذی كوڕی عەفرا ی بڕی ، كە یەكێكە لەو چواردە كەسەی لە شەڕی بەدردا شەهید بوون مووعە وە ذ دەستە قرتاوەكەی هێنایە خزمەت پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ ئەویش تفی بەسەردا كرد و لكاندیەوە بە جێگاكەی خۆیەوە ، جێی خۆی گرتەومو لكایەوە، پاشان گەڕایەوە بۆ جەنگ تا شەهید كرا هەر شەڕی كرد (١٦٧).

---

(١٦٦) (صحيح رواه الترمزي والحاكم والبيهقي ).

(١٦٧) ( الشفاء ٣٢٤/١، الإصابة ١٩٢/٦).

## موعجیزەی (١٦٤)پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ فوی کرد بەسەر شانی خوبەیبی کوڕی یەساف لە غەزای بەدردا خوای گەورە شیفای بۆ ناردوو چاك بووەوە:

خوبەیبی کوڕی یەساف لە غەزای بەدردا لەگەڵ پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ بوو شمشێرێ دابووی لەسەر شانی بە ڕادەیەك کە ئەو لایەی لار بووبووەوە پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ خستیەوە جێی خۆی و فووی پێداکرد تا چاك بووەوە[١٦٨].

## موعجیزەی (١٦٥)پێیە شکاوەکەی علی کوڕی حەکەم چاك بووەوە بێ ئەوەی لە ئەسپەکەش دابەزی:

ئیمامی بەغەوی دەگێڕێتەوە لە غەزای خەندەقدا پێی علی کوری حەکەم پێکراو شکا پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ دەستی پیرۆزی بەسەر شوێنە شکاوەکەیدا هێناو یەکەسەر چاك بووەوە، بێ ئەوەی لە ئەسپەکەش دابەزی[١٦٩]....

---

[١٦٨] (رواه إبن وهب والأصبهاني في دلائل النبوة والبيهقي وأحمد الشفاء ١/٣٢٤).

[١٦٩] (أخرجه البغوي الطبراني، الإصابة ٥٦٢/٤ الشفاء ١/ ٣٢٣ نسيم الرياض ١١٨/٢).

## موعجیزەی (١٦٦)ئیمامی علی ئازارێکی هەبوو پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ دووعای بۆ کرد ئیتر چاك بووەوە

ئیمامی بەیهەقی و غەیر ئەویش دەگێڕنەوە کە جارێکیان ئیمامی علی کوڕی ئەبو تالیب ئازارێکی هەبوو، دەستی بە پاڕانەوە کرد، پێغەمبەریش ﴿ صلى الله عليه وسلم ﴾ فەرمووی: ﴿اللهم اشفه يان عافه﴾ واتە خوایە شیفای بدەیت و چاکی بکەیتەوە پاشان پێغەمبەر﴿ صلى الله عليه وسلم ﴾ بە پێی خۆی لێیدا، ئیتر لەدوای ئەوە ئەو ئێش و ئازارەی نەما [١٧٠].

## موعجیزەی (١٦٧)پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ دەستی پیرۆزی بەناو لەپی داهێناو تا ئەو لووەی هەڵگرت و هیچ شوێنەوارێکی نەما:

لوویەك لەناو لەپی شورە حبیلی جوعفی دا هەبوو بەو هۆیەوە نەیدەتوانی دەسکی شمشێرو جڵەوی وڵاغەکەی بەدەستەوە بگرێت، ناچار سکاڵای دەستی بردە لای پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ ئەویش بەردەوام دەستی پیرۆزی خۆی پێدا دەهێنا ، تا ئەو لووەی هەڵگر تو هیچ شوێنەوارێکی نەما [١٧١].

---

[١٧٠] ( رواه الترمذي وقال: حسن صحيح، والنسائي في الكبرى، ورواه الإمام أحمد والحاكم وابن حبان ).

[١٧١] ( رواه الطبراني والبخاري في التاريخ الكبير واللفظ له الشفاء ١/ ٣٢٤، الإصابة ٢/٣٢١ ).

## موعجیزەی (١٦٨) مرۆڤێکی هێندە ژیر دەرچووکە لە خەڵکی ژیر تر بوو:

ئیبن ئەبی شەیبە کە یەکێکە لە پێشەوایانی زانستی فەرمووده دەگێڕێتەوە کە جارێکیان ئافرەتێك لە تیرەی (خشعم) هاتە خزمەتی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ منداڵێکیشی پێ بوو کە تووشی بەلایەکی وەها بووبوو نەیدەتوانی قسە بکات، پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ ئاوی لە دەمی راداو دەستی شۆردو پاشان ئەو ئاوەی دا بە ئافرەتەکەو فەرمانی پێکرد کە دەرخواردی منداڵەکەی بدات و پێی بهەنوێت، ئیتر منداڵەکە چاك بووەوە، لە پاشاندا مرۆڤێکی هێندە ژیر دەرچووکە لە خەڵکی ژیر تر بوو [١٧٢].

## موعجیزەی (١٦٩) برینەکەی موحەمەدی کوڕی حاتەب سارێژ بوو بە فووی دەمی پیرۆزی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾:

ئیمامی بەیهقی و نەسائی دەگێڕنەوە: دەڵێن: موحەممەدی کوڕی حاتەب منداڵ بوو، جارێکیان مەنجەڵێك ئاوی گەرم بەسەر دەستیدا رژا، پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ دە ستی بەسەردا هێناو دووعای بۆ کرد، فوویەکی تەڕی بە برینەکەی دا کرد کە ئاوی دەمی پیرۆزی پێوە بوو، یەکسەر چاك بووەوە [١٧٣].

---

[١٧٢] (اخرجه ابن أبي شيبة ومن طريقه ابن ماجه ورواه الطبراني الشفاء ١/ ٣٢٤).

[١٧٣] (رواه النسائي وابن حبان وابن أبي شيبة الطبراني الشفاء ١/ ٣٢٤).

## موعجیزەی (١٧٠)چاك بوونەوەی زمان گیرانی منداڵێك:

منداڵێکیان هێنایە خزمەت پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ کە گەورە بووبوو بەلام هێشتا زمانی نەگرتبوو، پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ بە منداڵەکەی فەرموو من کێم؟ یەکسەر ووتی رسول الله واتە: تۆ پێغەمبەری خوایت، بەم جۆرە خوای گەورە زمانی بەردا [١٧٤].

## موعجیزەی (١٧١)ئەوەندە شەرمن و بەحەیا دەرچوو کە لەشاری مەدینەدا هیچ ئافرەتێکی تر نەبوو هێندەی ئەو بەشەرم و حەیا بێت:

لە کاتێکدا پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ خەریکی خواردن بوو، کچێك داوای خواردنی لێ کرد پێغەمبەریش ﴿ﷺ﴾ ئەوەی پێدا کە لەبەر دەستیدا بوو، ئەم کچەش کەم شەرم بوو، ووتی: ئەوەم دەوێ کە لەناو دەمتدایە، خۆ پێغەمبەریش ﴿ﷺ﴾ هەر شتێکی لێ داوا بکرایە دەیبەخشی، لەبەر ئەوە هەرچیەکی لەدەمدا بوو دای بەو کچە، هەر هێندەی پاروەکە لە گەدەی کچەکەدا جێگیر بوو، ئەوەندە شەرمن و بە حەیا دەرچوو کە لە شاری مەدینەدا هیچ ئافرەتێکی تر نەبوو هێندەی ئەو بەشەرم و بەحەیا بێت [١٧٥]

---

[١٧٤] ( رواه البيهقي في الخصائص الكبرى، نسيم الرياض ٣/١٠٥ ).

[١٧٥] (رواه الطبراني الشفاء ١/ ٣٢٤

## موعجیزەی (١٧٢) منداڵێکی ساوا دێتە قسەو شایەتی بۆ ڕاستگۆی پێغەمبەر(ﷺ) دەدات:

جەلالەدینی سیووتی- ڕەحمەتی خوای لێ بێ- کە ئیمامی چەرخ و سەردەمی خۆی بوو، دەگێڕێتەوە کە: پیاوێکی خەڵکی یەمامە منداڵێکی خۆی هەر ئەو ڕۆژەی کە تێیدا لە دایك بووبوو هێنایە خزمەتی پێغەمبەر(ﷺ) پێغەمبەری خوا (ﷺ) بە منداڵەکەی فەرموو: منداڵ من کێم؟ یەکسەر منداڵەکە هاتە زمان و ووتی: (أنت رسول الله) فەرمووی: (صدقت بارك الله فيك) پاشان ئەو منداڵە نەهاتەوە زمان تا گەورە بوو، خەڵکی پێ یان دەووت: (مبارك اليمامه) چونکە پێغەمبەر(ﷺ) دووعای بەرەکەتی بۆ کردبوو ئیمامی سیووتی لەبارەی ئەم فەرموودەوە ووتویەتی: حديث الحسن [١٧٦].

(الله أكبر)لەو موعجیزە گەورەو بەناوبانگە بەڕاستی بەتەنها ئەو موعجیزەیە بەسە لەسەر ڕاستی و درووستی پێغەمبەرایەتی پێغەمبەر(ﷺ) کە وەك ڕۆژی ڕووناك دەیسەلمێنی هەزاران درووود بۆ گیانی ئەو پێغەمبەرە پایەدارە.

---

[١٧٦] (الشفاء ١/ ٣١٩، الإصابة ١٨/٦، ابن عساكر ٣٧٨/٤).

## موعجیزەی (١٧٣) هەر کە پێغەمبەر(ﷺ) دەستی پیادا هێنا هیچ شوێنەوارێکی نەما :

ئەبو نەعیم لە (الدلائل ص٢٢٣) دا لە ئەبیەزی کوڕی حمالی مەناریبییەوە هێناویەتی برینێك واتە: دمردی ( قوباء ) بە دەموچاویەوە بووکە لوتی داشاربوو، پێغەمبەر(ﷺ) بانگی کردو دەستی هێنا بەسەر دەم و چاوی دا، لەو ڕۆژەوە هیچ شوێنەوارێکی نەما [١٧٧].

## موعجیزەی (١٧٤)پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەست بەسەر حەنزەلەدا دێنێ و دووعای بۆ دەکات:

تەبەڕانی لە حەنزەلەی کوڕی حوزەیفەوە هێناویەتی دەڵێت:لەگەڵ حوزەیمی باپیرم هاتم بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)باپیرم ووتی: ئەی پێغەمبەری خوا منداڵی بەتەمەن و خاوەن ڕیشم هەیە و جگە لەوانیشم هەیە، ئەمەش بچوکترینیانە، پێغەمبەر(ﷺ) نزیکی کردمەوەو دەستی هێنا بەسەرمداو فەرمووی: (بارك الله فيك) زەیال دەڵێت: حەنزەلەم بینی پیاوی ڕوو وەرمکردوو یان مەڕی گوان وەرم کردوو هێنرا بۆ لای، ئەویش دەیووت بەناوی خوا لەسەر جێ دەستی پێغەمبەر(ﷺ) دەستی دەهێنا بەسەریدابەوە وەرمەکە نەدەما.. [١٧٨].

---

[١٧٧] (ئیبن سەعد (ج٥، ص٢٤) بەهەمان شێوە هێناویەتی).

[١٧٨] (صحیح :هەیثمی ج٩، ص٤٠٨ دەڵێت: تەبەرانی لە (المعجم الوسیط والکبیر)دا بەهەمان شێوە هێناویەتی، ئەحمەدیش لە فەرموودەیەکی دوورو درێژدا هێناویەتی و کەسەکانی سەنەدەکەی جێی متمانەن ).

## موعجیزەی (١٧٥)خوایە سەرمایان لە ڕوودا بشکێنە:

ئەبو نەعیم لە (الدلائیل ص١٦٦) لە جابیری کوڕی بیلالەوە هێناویەتی دەڵێت: لە شەوێکی ساردا چووم بۆ نوێژ، کەس نەهاتبوو، بانگمدا، کەسێ سەلامی کرد، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: بیلال چییانە؟ ووتم: سەرما ڕێی لێ گرتوون بە دایك و باوکمەوە بە قوربانت بم، فەرمووی: (خوایە سەرمایان لە ڕوودا بشکێنە) بیلال دەڵێت: بینیم حەزیان لە مەلە بوو لە نوێژی بەیانی یان چێشتەنگاودا....[١٧٩].

## موعجیزەی (١٧٦)خوایە جوانی بکەو درێژە بە جوانیەکەی بدە تەمەنی گەیشتە سەد ساڵ زیاتر، تاڵە مووی سپی لە ڕیشیدا نەبوو کەمێك نەبێت:

ئەحمەد لە ئەبو زەیدی ئەنسارییەوە هێناویەتی: دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرموو: نزیك بەرەوە لێم دەستی موبارەکی هێنا بەسەرمداو فەرمووی(خوایە جوانی بکەو درێژە بە جوانیەکەی بدە) ئیدی تەمەنی گەیشتە سەدو ئەوەندە ساڵ و مووی سپی لە ڕیشیدا نەبوو کەمێك نەبێت، ڕووکراوەو ڕووخسار فراوان بوو تامرد هەروا بوو[١٨٠].

لە (الأصبابة، ج٤ ، ص٧٨)دا دەڵێت:لەگێڕانەوەیەکی ئەحمەد لەلایەکی دیکەوە لە ئەبو نوهەیکەوە دەڵێت ئەبو زەید پێی ووتم: پێغەمبەر(ﷺ) داوای ئاوی لێکردم منیش قاپێك

---

[١٧٩] (بەیهەقی لە جابر لە ئەبوبەکر لە بیلالەوە بەو واتایە بەکورتی هێناویەتی وەك (البدایة والنهایة) ج٦، ص١٦٦ دا هاتووە تیایدا دەفەرمووێت: (اللهم إذهب عنهم البر) پاشان بەیهەقی دەڵێت ئەیوبی کوڕی یەسار بەتەنها هێناویەتی ابن کثیر دەڵێت موصول لە .هاوشێوەی لە فەرموودەی ناسراوی حوزەیفە لە باسی خەندەقدا هەیە

[١٨٠] (صحیح سوهەیل دەڵێت: سەنەدەکەی صەحیحی مەوصولە لە( البدایة والنهایة، ج٦، ص١٦٦)دا هاتووە.

ئاوم بۆ برد، موویەکی تێدا بوو لامبرد پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ (فەرمووی خوایە جوانی بکە)، ئەبو نوهەیل دەڵێت: بینم تەمەنی نەوەدو چوار ساڵ بووتاڵی ڕیشی سپی نەبووبوو[١٨١].

## موعجیزەی (١٧٧)کە مووسیبەت دەهات ڕێی فرمێسکی لە چاوانی دەبینی، بەڵام نەدەڕژایە سەر کوڵمەکانی :

ئەبو نەعیم لە (الدلائل ص١٦٨) لە ئوم ئیسحاقەوە هێناویەتی دەڵێت: لەگەڵ براکەم کۆچم کرد بۆ مەدینە بۆ لای پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ لە نیوەی ڕێدا پێی ووتم: ئوم ئیسحاق دابنیشە، چونکە خەرجی و شتم لە مەککە لە بیر چووە، ئوم ئیسحاق ووتی: من لە فاسق دەترسم بەرامبەرت واتە: مێردەکەی ووتی: نا پشت بەخوا، ئوم ئیسحاق ووتی: چەند ڕۆژێك مامەوە، کەسێك کە دەمناسی و ناوم نەدەزانی دای بەلامدا، ووتی: ئوم ئیسحاق بۆچی لێرە دانیشتوویت؟ ووتی: چاوەڕێی براکەم دەکەم ، ووتی دوای ئەمڕۆ برات نەماوە، مێردەکەت کوشتی، دەڵێ منیش خۆم ڕاگرت و چوومە مەدینەو خزمەت پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ کاتێ دەستنوێژی دەگرت، لەبەر دەمیدا وەستام و ووتم، ئەی پێغەمبەری خوا ئیسحاق براکەمی کوشت، هەرچی سەیرم دەکرد دەستنوێژی هەڵدەگرت و مشتێك ئاوی بە دەمووچامدا دەپرژاند کە مووسیبەت دەهاتە ڕێی فرمێسکی لە چاوانی دەبینی، بەڵام نەدەرژایە سەر کۆڵمەکانی[١٨٢]

---

(١٨١) (ئیبن حبان وحاکم بە صەحیحیان داناوە ئەبو نەعیم لە (الدلائیل ص١٦٤) لە. ڕێگەی ئەبو نوهەیکەوە بەهەمان شێوە هێناویەتی لە گێڕانەوەیەکدا هاتووە: بینیم تەمەنی نەوەدو سێ ساڵ بوو تاڵێ مووی سپی لە ڕیشیدا نەبوو.

(١٨٢) (بوخاری لە مێژوومکەیدا و کچی دیناری موزەنی دایە گەورەی لە ئوم ئیسحاقی غەنەوی مەولایەوە بەو واتایە هێناویەتی وەك لە (الإصابة ج١، ص٣٢)دا هاتووە.

## موعجیزەی (١٧٨)هەروەك بەناو حەمام دا بەڕێوە بچم لە بەر گەرماوابوو:

حوزەیفە ووتی: لە خەندەقدا لە خزمەتی پێغەمبەری خودا﴿ﷺ﴾ بووین کە پێغەمبەری خوا بەشێکی شەو شەونوێژی کردو پاشان ئاوڕی دایەوە بۆ لامان و فەرمووی ﴿من ینظر لنا ما فعل القوم ثم یرجع﴾ فەرمووی: کێ دەچێ بزانێ دوژمن چیان کردووەو پاشان بگەڕێتەوە، مەرجی ئەوەشی دانا کە بگەڕێتەوە پاشان فەرمووی: ﴿ أسأل الله أن یکون رفیقی فی الجنة﴾واتە :لەسەر ئەوە داوا لە خوا ئەکەم کە لە بەهەشتدا هاوڕێم بێ، حوزەیفە ووتی: لە بەر ترسی زۆرو برسیەتی و سەرمای زۆر پیاوێکمان هەڵ نەسا، جا کە هیچ کەس هەڵ نەسا، منی بانگ کرد، منیش چارم نەبوو کە بانگی کردم هەستام فەرمووی: ﴿ یا حذیفه إذهب فادخل في القوم فانظروالا تحدثن شیئاًحتی تاتینا﴾ فەرمووی ئەی حوزەیفە بڕۆ خۆت بکە بەناو سوپای دوژمندا و سەیر بکە و هەواڵ بزانە، بەلام هەتا دێتەوە لامان هیچ نەکەیت، حوزەیفەش هەستا لەگەڵ ئەوەدا ترس و سەرماو برسیەتی و تاریکی تەنگیان پێ هەڵ چنیبوو فەرمانی پێغەمبەری خوای﴿ﷺ﴾ بەجێ هێنا، حوزەیفە دەڵێ ڕۆیشتم واتە: لە خەندەق کردمە ئەو بەرو خۆم کرد بەناو دوژمندا، دیتم ڕەشەباو سەربازەکانی خوا چی یان پێ ئەکردن کە نە قابلەمەو نە بینایان ڕاگیر نەئەبوون، حوزەیفە-خوای لێ ڕازی بێت ئەڵێ: پاشان غیرەتم نایە بەر خۆم و چوومە ناو سەربازگەکەوە، ئەبینم نزیك ترین کەس لێمەوەنەوەی عامیرن، ئەڵێت باربکەن، باربکەن دانیشتنتان بۆ نەماوە ڕەشەباش سەربازگەکەی بەگیر هێنابوو، دە بەخوا گوێم لە دەنگی بەرد بوو لەناو بارو پێخەفەکانیان دا ڕەشەبا پاشان لێی ئەدان دەڵێ: گوێشم لە (غه طه فان) بوو وەك قوڕەیش خۆیان ئەپێچایەوە و گەڕانەوە بۆ ولاتی خۆیان، حوزەیفە لەسەر باسەکەی دەڕوات و دەڵێ: پاشان

گەڕامەوە، هەروەك بەناو حەمامدا بەڕێوە بچم لەبەر گەرما ، هاتمەوە بۆ لای پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ کە گەیشتمە نیوەی ڕێ، ئەبینم نزیکەی بیست سوار دەمووچاویان هەڵبەستبوو وتیان: هاوەڵەکەت ئاگادار بکە کە خوا سەرفرازی کرد، گەڕامەوە خزمەت پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ ئەبینم قوماشێکی لە خۆی پێچاوەو نوێژ ئەکات، دەبەخوا هەر ئەوەبوو گەڕامەوە ئیتر سەرماکەم بۆ هاتەوەو لە سەرماندا هەڵ دەلەرزیم، پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ هەر خەریکی نوێژ بوو، بە دەستی ئاماژەی بۆ کردم، منیش نزیك کەوتمەوە، قوماشەکەی دا بەسەر منیشدا هەرکاتێ پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ ناڕەحەتیەکی ببوایە دەستی بە نوێژ دەکرد، هەواڵم دایە کە من ئەحزابم بەجێهێشتن باریان ئەکرد، لە ڕیوایەتێکی تردا واهاتووە کە خوزەیفە وتوویەتی: گوێم لە ئەبوسوفیان بوو ئەی ووت: ئەی کۆمەڵی قورەیش با هەریەکە لە ئێوە بزانێ کێ لە تەنیشتی دانیشتووە ئاگاداری سیخوڕو جاسوس بن، حوزەیفە دەڵێ منیش دەستی ئەوەم گرت لەلای ڕاستمەوە دانیشتبوو وتم: تۆ کێیت؟ ووتی مەعاویەی کوڕی ئەبو سوفیانم، دەستی ئەوەشم گرت کە لەلای چەپمەوە بوو وتم تۆ کێیت؟ وتی عەمری کوڕی عاصم ئەمەشم لەترسی ئەوە کرد ئەوەکو پێم بزانن.... [١٨٣].

## موعجیزەی (١٧٩)چیا و بەردەکان سەلامیان لە پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ دەکرد:

بە گێڕانەوەی صەحیح چەسپاوە کە ئیمامی علی و جابیرو عایشە فەرموویانە: پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ بەلای هەر چیاو بەردێکدا تەشریفی موبارەکی بڕۆیشتایە، یەکسەر ئەو

---

[١٨٣] (ژیانی نازیزمان ﴿ﷺ﴾بەرگی دووەم، لاپەڕە ( ١٤٥تا ١٤٧).

چیایه یان ئەو بەردە دەیووت (السلام علیك یا رسول الله)، له ڕیوایەتەكەی ئیمامی علی دا خوای لێ ڕازی بێ دەڵێت:له مەككە لەگەڵ پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ دابووین تەشریفی برد بۆ هەندێ شوێنی دەوروبەری مەككە، هەرچی چیاو درەخت لەو ناوەدا بوو هەموویان ووتیان ( السلام علیك یا رسوالله ) [١٨٤].

## موعجیزەی (١٨٠)بەردێك لە مەككەدا دەناسمەوە:

له ڕیوایەتێكی تردا كه له جابیری كوڕی سەموورەوە: پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ فەرموویەتی ﴿ إني لأعرف حجراً بمكة كان يسلم عليه﴾ واته: بەردێك له مەككەدا دەناسمەوە كه له پێش پێغەمبەرایەتیدا سەلامی لێ دەكردم دەڵێ ئەمه ئاماژەیه بۆ (حجر الأسود) [١٨٥].دایكی ئیمانداران -عایشه خوای لێ ڕازی بێ دەگێڕێتەوه كه پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ فەرموویەتی ﴿لما استقبلني جبريل بالرسالة، جعلت لاأمرُّ بحجر ولاشجر إلا قال: السلام عليك يا رسوالله﴾ واته دوای ئەوەی جوبریل پێغەمبەرایەتی بۆ هێنام، بەلای هەر بەردو درەختێكدا تێپەڕییم دەیووت (السلام علیك یا رسول الله) واته ئەی پێغەمبەری خوا سەلامت لێ بێت[١٨٦].

## موعجیزەی (١٨١)مینبەرەكه كەوته لەرینەوەو تەكاندان:

عبدوڵلای كوڕی ئیمامی عومەر-خوا لێی ڕازی بێ- دەگێڕێتەوه كه پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ لەسەر مینبەر ئایەتی ﴿وما قدروا الله حقَّ قَدرِهِ﴾الانعام(٩١) واته وەك پێویست خوایان

---

[١٨٤] (رواه الترمزي والدارمي والطبراني والحاكم والبيهقي).

[١٨٥] (صحيح: رواه مسلم والترمزي وأحمد واللفظ له).

[١٨٦] (حديث صحيح: رواه البزار الشفاء ٣٠٧/١).

ئەناسی خوێندەوە، پاشان فەرمووی: ﴿یمجد الجبار نفسه، یقول: أنا الجبار أنا الجبار، أنا الکبیر المتعال﴾ واتە خواوەند تەمجیدی خۆی دەکات و دەفەرموێت: من خواوەندی خاوەن و زەبرو دەسەڵاتی زۆرم، منم خواوەندی خاوەن زەبرو دەسەڵاتی زۆر، منم گەورەی لە هەموو شتێك گەورەو بەرزتر، کە ئەمەی فەرموو: یەکسەر مینبەرەکە کەوتە لەرینەوەو تەکاندان، بەڕادەیەك کە وتمان هەر ئێستا پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ لەسەر مینبەرەکە دەکەوێتە خوارەوە..[١٨٧]

## موعجیزەی (١٨٢) ئاماژەی بۆ هەربتێك دەکرد یەکسەر دەکەوت:

زانای ئوممەتی ئیسلام عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس خوایان لێ ڕازی بێ هەروەها عەبدوڵڵای کوڕی مسعود خوایان لێ ڕازی بێ[١٨٨] کە یەکێکە لە زانایان و هاوەڵانی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ دەگێڕنەوە کە لەدەوروبەری کەعبەدا سێ سەدو شەست بت هەبوون قاچیان بە قورقوشم لەناو بەردا قایم کرابوو، کاتی ساڵی ئازادکردنی مەککە پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ ڕۆیشتە ناو مزگەوتەکە وە بەدارێك کە بە دەستیەوە بوو، بێ ئەوەی دەست لەبتەکان بدات ئاماژەی بۆ ئەو بتانە دەکرد و دەیفەرموو: ﴿جاء الحق وزهق الباطل، إن الباطل کان زهوقاً﴾ ألإسرا (٨١) واتە: هەق هات و ناهەق بەتاڵ بۆوەو هەر دەشبێت بەتاڵ بێتەوە، ئاماژەی بۆ هەر بیتێك دەکرد یەکسەر بە پشتدا دەکەوت وە بۆ پشتی هەرکامێکیشیانی دەکرد بە ڕودا دەکەوت، تا هیچ بتێك لە کەعبەدا نەما[١٨٩]

---

[١٨٧] صحیح: (رواه مسلم والنسائي وأحمد).

[١٨٨] صحیح: (رواه مسلم والنسائي وأحمد).

[١٨٩] حدیث إبن عباس رواه الطبراني ورجاله ثقات والبزار باختصار).

## موعجیزەی (١٨٣)پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ تەشریفی هات و پەڵە هەورێکی بەسەرەوە بوو سێبەری بۆ دەکرد هەر کە دانیشت سێبەرەکە هات بۆ لای:

ئەم موعجیزەیە بریتییە لە چیرۆکی بەناوبانگی بوحەیرای ڕەبەن [١٩٠]. کە بەم جۆرە پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾لە پێش پێغەمبەرایەتیدا لەگەڵ ئەبو تالیبی مامی و کۆمەڵێکی قورەیشی دا ڕۆیشتن بۆ ناوچەکانی شام، کە گەیشتنە تەنیشت کلێسای ئەو ڕەبەنە، دانیشتن ئەم ڕەبەنەش نەدەهاتە دەرەوە بۆ لای کەس، بەلام ئەم جارە هاتە دەرەوەو بەناویاندا گەڕاو یەکەیەکە سەیری دەکردن تا دەستی پێغەمبەری ﴿ﷺ﴾گرت و وتی: ئەمە گەورەی هەموو جیهانەو خوای گەورە دەیکاتە ڕەحمەت بۆ هەموو جیهان چەند ڕیش سپیەکی قورەیش پێیان ووت:بە چیدا دەزانیت؟ ووتی: دارو بەرد ئەما سوجدەی بۆ ئەبەن، خۆ پێغەمبەر نەبێ سوجدە بۆ کەسی تر نابەن پاشان ڕاویەکە دەڵێت: پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ تەشریفی هات و پەڵە هەورێکی بەسەرەوە بوو سێبەری بۆ دەکرد، کە نزیکی خەڵکەکە بووەوە، سەیری کرد ئەوان پێش ئەم لە ژێر سێبەری درەختەکەدا دانیشتوون، هەر کە ئەم دانیشت سێبەرەکە هات بۆ لای [١٩١]

---

[١٩٠] (حديث الراهب صحيح رواه الترمذي).

[١٩١] (الشفاء ٣٠٨/١).

## موعجیزەی (١٨٤) بەدرێژای تەمەنی شانازی بەم شمشێرەوە دەكرد:

لە غەزای بەدری گەورەدا كە سەرچاوەی چەندین شتی سەیرو سەرسوڕهێنەرە شمشێرەكەی عەكاشەی كوڕی مەحصەنی ئەسەدی شكا پێغەمبەر﴿ﷺ﴾دارێكی ئەستوری دایە دەستی و فەرمووی: شەڕی پێ بكە، ئەم دارە لە دەستی عەكاشەدا بوو بە شمشێرێكی تیژی درێژی سپی و ئەستورو جەنگی پێ كرد ئیتر لە هەموو غەزایەكدا ئەم شمشێرەی لابوو بەكاری دەهێنا تا لە جەنگی یەمامە كە لەگەڵ پاشگەزبووەكاندا كرا شەهید بوو[١٩٢].

ئەو ڕووداوە ڕووداوێك بوو بە قەتعی چەسپاوە عەكاشە بە درێژایی تەمەنی شانازی بەم شمشێرەوە دەكرد، بە شمشێری (العون) واتە: یارمەتی ناوبانگی دەركردبوو، جا ناوبانگ دەركردنی ئەم شمشێرەو، شانازی كردنی عەكاشە دوو بەڵگەی ترن كە ڕووداوەكە دەچەسپێنن.

## موعجیزەی (١٨٥)پەلە دارخورمایەكی دایەو لە دەستیدا بوو بەشمشێر:

(ابن عبد البر)كە یەكێكە لە زانا لێكۆڵەرو هەڵكەوتووەكانی چەرخی خۆی، لە عەبدوڵڵای كوڕی جەحشەوە كە كوڕی پوری پێغەمبەرە ﴿ﷺ﴾ دەگێڕێتەوە[١٩٣]، كە عەبدوڵڵا لە غەزای ئوحود لەو كاتەدا كە خەریكی جەنگ بووشمشێرەكەی لە دەست چوو پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ پەلە دارخورمایەكی دایە دەستی و لە دەستی عەبدوڵڵادا بوو بە شمشێر (ابن سید الناس) لە

---

[١٩٢] (رواه البیهقی مسنداً، نسیم الریاض ٣/١٥٦).

[١٩٣] (رواه البیهقی في حدیث مسند: الإستیعاب لإبن عبد البر،القسم الثالث(٨٧٩) الشفاء ١/٣٢٣).

کتێبەکەیدا دەڵێت: ماوەیەکی زۆر ئەم شمشێرە لای عەبدوڵلا مایەوە، تا لە دوایدا بە دووسەد دینار فرۆشرابەیەکێك کە ناوی (بغاءالترکي) بوو[١٩٤]، بەڕاستی ئەوانە موعجیزەی ئەوەندە گەورەو بەناوبانگن کە بەقەد تۆسقاڵێك گومان و دوو دڵی ناهێڵن لە ناو دڵەکاندا سوپاس و ستایشی بێ پایان بۆ خوای گەورەو پەروەردگار ودرووود بۆ گیانی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾.

## موعجیزەی (١٨٦)ئەو تیرانەی کە نووکیشیان نەبوو وەك ئەوەی باڵیان گرتبێت لە کەوان دەردەچوون:

قازی عەیاز لە لە سەعدی کوڕی ئەبی وەققاصەوە دەگێڕێتەوە[١٩٥]، کە یەکێك بووە لەو دە کەسەی مژدەی بەهەشتیان دراوەتێو خزمەتی پێغەمبەری خوای ﴿ﷺ﴾ کردووە، یەکێك بووە لە پێشەوایانی سوپاکان لە سەردەمی ئیمامی عومەردا سەرکردەی سوپای ئیسلام بووە ـ ئەم سەعدە دەگێڕێتەوە و دەڵێ: لە غەزای ئوحود دا پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ تیری بێ نووکی دەدامێ و دەیفەرموو: تێیان بگرە هەر ئەو ڕۆژە پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ بە کەوانەکەی خۆی ئەوەندە تیری تێگرتن تا کەوانەکەی شکا ئەو تیرانەش کە نووکیان نەبوو، وەك ئەوەی باڵیان گرتبێت لە کەوان دەردەچوون و، لە جەستەی کافران جێگیر دەبوون.....

---

[١٩٤] (عيون الأثر لإبن سيد الناس ٢٠/٢، الإصابة لإبن حجر برقم: ٤٥٨٢).

[١٩٥] (الشيفاء ٣٢٢/١).

## موعجیزەی (١٨٧)کچێکی مردوو وەڵامی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ دەداتەوە:

ئیمامی پایەدارو لە خوا ترس حەسەنی بەصری لەسەردەمی تابیعینەکاندا، دەگێڕێتەوەو دەڵێ: پیاوێك هاتە خزمەت پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ عەرزی کرد کە کچێکی مردووەو لە فلان شیودا ناشتوویەتی، پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ دڵی بۆی نەرم بوو، لەگەڵیدا ڕۆیشت بۆ ئەو شیوە، لەوێ کچەکەی بەناوی خۆی بانگ کردوو فەرمووی: ئەی فلانە کەس بە ئیزنی خوا وەڵامم بدەرەوە، ئەویش هاتە دەرەوەو ووتی: (لبيك وسعديك) پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ فەرمووی دایك و باوکت مسوڵمان بوون، جا ئەگەر حەز دەکەیت دەتگێڕمەوە بۆ لایان، لە وەڵامدا ووتی: هیچ ئیشێکم پێیان نییە، خوا باشترە بۆم تا ئەوان[١٩٦].

## موعجیزەی (١٨٨)کە خستیانە ناو گۆڕەکەیەوە قسەی کرد:

بەیهەقی و غەیری ئەویش، لە عبدڵلای کوڕی عبدوڵلای ئەنصاری یەوە دەگێڕنەوە دەڵێ: من یەکێك بووم لەوانەی کە ثابیتی کوڕی قەیسیان ناشت کە لە غەزای یەمامەدا شەهید بوو، لەو کاتەدا کە خستمانە ناو گۆڕەکەیەوە گوێمان لێ بوو دەیووت: ( محمد رسول الله، أبوبكرالصديق، وعمر الشهيد، وعثمان البر الرحيم ) کە سەیرمان کرد بینیمان گیانی تێدا

---

[١٩٦] (الشيفاء ١/٣٢٠، نسيم الرياض ٣/١٠٦).

نییه [١٩٧]. واته: پێش ئەوەی عومەری كوڕی خەتتاب ببێ بە خەلیفەی مسوڵمانان، ئەو هەواڵی شەهید بوونی ڕاگەیاند .

## موعجیزەی (١٨٩)لە كاتێكدا كە مردبوو ژنان لەسەری دەگریان هاتە قسەو پێی ووتن بێدەنگ بن:

نوعمانی كوڕی بەشیر، دەگێڕێتەوەو دەڵێ: زەیدی كوڕی خاریجە لە یەكێك لە كۆڵانەكانی مەدینەدا كەوت بەلاداو مرد، خەڵكەكەش هەڵیان گرت و دایان پۆشی لە نێوان خەوتناندا كە ژنان بەسەریدا دەگریان، گوێیان لێ بوو دەیووت: بێ دەنگ بن بێ دەنگ بن ئینجا سەری خۆی هەڵدایەوە و ووتی ( محمد رسول الله ) پاشان ووتی: ( السلام علیك یا رسوالله ورحمة الله وبركاته ) پاشان مردەوە[١٩٨]. بەڕاستی موعجیزەیەكی گەورەیە كە كەسێكی مردوو شاهێدی لە سەر ڕاستگۆیی پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ دەدات. هەزاران درووود بۆ گیانی پاكی ئەو پێغەمبەرە پایەدارە ﴿ﷺ﴾.

---

[١٩٧] (رواه البخاري في التأريخ الكبير، الشيفاء ١/٣٢٠).

[١٩٨] (صحيح رواه الحاكم والبيهقي والطبراني بإسنادين رجال احدهما ثقات وذكره البحاري في التأريخ الكبير مختصراً ).

## موعجیزەی(١٩٠)جوبریل ومیکائیل پارێزگاری لە پێغەمبەر(ﷺ) دەکەن:

لە سەعدی کوڕی ئەبو وەققاصەوە -خوای لێ ڕازی بێ- دەڵێ: پێغەمبەرم (ﷺ) بینی لە ڕۆژی غەزای ئوحد دا دوو پیاوی لەگەڵدا بوو شەڕیان دەکرد و پارێزگاریان لێ دەکرد کە جلی سپیان لەبەردا بوو نە لە پێشدا بینیبونم و وە لەوەو دواش نەم بینینەوە ئەوانەش جبریل و میکائیل بوون- سەلامی خوایان لێ بێت[١٩٩].

## موعجیزەی (١٩١)ئەوە جبریلە کە ئاینەکەتان فێر دەکات:

بوخاری موسلیم پێشەوایانی فەرمووده، هەموویان لە عومەری کوڕی خەتتابەوە- خوای لێ ڕازی بێ دەگێڕنەوەو دەڵێ: ڕۆژێکیان کە لە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) دانیشتبووین، لە پڕ پیاوێك کە بەرگەکانی بەری یەکجار سپی و مووی جەستەی تەواو ڕەش بوو، هیچ شوێنەوارێکی سەفەریشی پێوە دیار نەبوو، کەسیشمان نەمان دەناسی، هات لە خزمەت پێغەمبەردا(ﷺ)دانیشت و پرسیاری لەبارەی ئیسلامەو ئیمان و ئیحسانەوە لە پێغەمبەر (ﷺ)کردوو، ئەویش وەڵامی هەموو پرسیارەکانی دایەوە، پاشان فەرمووی:عومەر ئایا دەزانیت ئەوە کێیە ئەو پرسیارانە دەکات؟وتم:خوداو پێغەمبەرەکەی باشتر دەزانن،فەرمووی:ئەو جیبریلە،بۆ ئەوە هات کە ئاینەکەتان فێرکا[٢٠٠]

---

(١٩٩) ﴿متفق عليه رواه البخاري في المغازي (٣٨٢٨) ومسليم في الفضائل(٤٧/٢٣٠٦ )﴾.

(٢٠٠) ﴿صحيح: رواه مسلم﴾

## موعجیزەی (١٩٢) هاوەڵانی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ جیبریل لەسەر شێوەی کەسێك دەبینن.

لە چەند ڕیوایەتێکی صەحیح ڕیوایەت کراوەکە زۆرجار هاوەڵانی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ جیبریلیان لەسەر شێوەی هاوەڵی بەڕێز (دحیتە اکلبی)دا دەبینی کە پیاوێکی گەلێك جوان بوو [٢٠١] هەندێك لەو هاوەڵانە ئەوانە بوون، عومەری کوڕی خەتتاب، عەبدوڵلای کوڕی عەبباس، ئوسامەی کوڕی زەیدە حاریث، ئوم سەلەمە، عائیشە، خوای گەورە لەهەموویان ڕازی بێت.

## موعجیزەی (١٩٣) ڕوناکییەك لەگەڵ لەدایك بوونی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ بینراوە:

دایکی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ بینیویەتی [٢٠٢] کە بریتییە لە ڕوناکییەك لەگەڵ لەدایك بوونی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ ئەوەش جگە لە دایکی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ دایکی عوسمانی کوڕی عاص و دایکی عەبدوالرحمانی کوڕی عەوفیش کەلەشەوی لەدایك بوونی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ لەلای دایکی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ بوون بینیویانەوە وتویانە: لەکاتی لەدایکبوونیدا ڕوناکییەکمان بینی نێوان خۆرهەلات و خۆرئاوای گرتەوە.

---

(٢٠١) ﴿صحيح: رواه مسلم والبخاري و أحمد و الحاكم والطبراني﴾

(٢٠٢) ﴿صحيح: رواه احمد والبيهقى وجماعة، وصححة ابن جان و الحاكم﴾

## موعجیزەی (١٩٤)سێبەرکردنی هەور بۆ پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ :

دەگێڕنەوە کە حەلیمەی سەعدی یە دایەنی کاتی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ بەمنداڵی لەلای بوو، چاوی بە پەڵە هەورێك کەوت سێبەری بۆ پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ دەکرد [٢٠٣] مێردەکەشی کە ئەوەی بینی، خەڵکی تریشی لێ ئاگادار کردەوە و ئیتر ئەوە بوو بە ڕووداوێکی زانراوی بەناوبانگ هەروەها کاتێك پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ لەتەمەنی دوازدە ساڵیدا لەگەڵ مامی ڕۆیشت بۆ شام، بوحەیرای ڕەبەن پەڵە هەورێکی بەسەر ئاستی سەری پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ بینی و پیشانی کەسانی کەشی دا [٢٠٤]

هەروەها لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە: کاتێك پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ لەسەفەرەکەی شام گەڕایەوە، خەدیجەو ژنانی دەوروبەری دوو مەلائیکەتیان بینی کەوەك پەڵە هەور سێبەریان بۆ دەکرد، خەدیجە کەئەوەی بینی، بۆ مەیسەرەی غوڵامی خۆی باس کرد کەلە سەفەرەکەدا هاوڕێی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ بوو، مەیسەرەش بە خەدیجەی ڕاگەیاند کە ئەو پەڵە هەورەی ئەو بینیویەتی، ئەمیش بەسەر پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ بینیویەتی لەو کاتەوە بۆ سەفەر لەماڵ دەرچوون [٢٠٥]

---

[٢٠٣] ﴿رواه الواقدي وابن عساكر وابن سعد في تاريخه عن ابن عباس﴾

[٢٠٤] ﴿صحيح: رواه الترمذي﴾

[٢٠٥] ﴿نسيم الرياض ٢١٨/٣﴾

## موعجیزەی (١٩٥) هەر کە پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ لای دایە ژێر سێبەری درەختەکە یەکسەر دەوروبەری سەوز بوو:

بە صەحیحی چەسپاوە کە پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ لە سەفەرێکی پێش پێغەمبەریدا، لای دایە ژێر سێبەری درەختێکی وشك، یەکسەر دەوروبەری سەوز بوو، درەختەکەش گەشەی کردو، لق و پەلەکانی بەسەریدا شۆڕ بوونەو [٢٠٦] الله اکبر لەو موعجیزە گەورەو باناوبانگە بەڕاستی ئەوانە موعجیزەی ئەوەندە گەورەن کەبەقەد تۆزقالێك گومان و دوودڵی ناهێڵن لەناو دڵەکاندا، بەڕاستی موعجیزە بەڵگەیەکی هەرە سەرەکی و ئێجگار گەورەیە بۆ ڕینمایی مرۆڤ بەرە و ڕێگای ڕاست و مایەی بەخشینی ئارامی و دڵنیایی یە بەدڵ و دەروون.

## موعجیزەی (١٩٦) ئەگەر لەگەڵیاندا خواردنی بخواردایە هەموویان تێر دەبوون:

پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ کەبە منداڵی لەماڵی ئەبو تالیبی مامیدا بوو، هەر کاتێك لەگەڵ مامی و خاو خێزانەکەی مامیدا خواردنی بخواردبایە، خاو خێزانەکە هەموویان تێر دەبوون، بەلام ئەگەر پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ ئامادەی خواردنەکە نەبوایە، تێریان نەدەخوارد [٢٠٧]

---

(٢٠٦) ﴿نسیم الریاض ٣١٨/٣، الشفا ٣٦٨/١﴾

(٢٠٧) ﴿رواه ابن سعد و غیره، نسیم الریاض ٣١٥/٣﴾

## موعجیزەی (١٩٧)فەڕو بەرەکەت دەکەوێتە ناو مەڕو ماڵات و ووشترەکانیەوە:

بەهۆی بەرەکەتی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ پیت و فەڕ کەوتە ناو مەڕو ماڵات ووشترەکانی حەلیمەی شیر دەری پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾، بە پێچەوانەی کەسانی تری ئەو تیرەو ناوچەیە، ئەوەش ڕووداوێکی زۆر ڕاست و ناوادارە[٢٠٨] بەڕاستی موعجیزەیەکی گەورەیە.
بەڕاستی پێویستە بڕواداران ئەو مەعجیزە گەورە و ناوادارانەی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ پێشکەش بە مرۆڤی سەرگەردان بکەن، کە گەورەترین دیارییە و مایەی سەرفرازی دنیاو دواڕۆژە.

## موعجیزەی (١٩٨) هیچ کاتێک لەدەست برسیەتی و تینوویەتی سکاڵای نەکردووە:

بە ڕیوایەتی صەحیح چەسپاوە (ئوم ئەیمەن)دایەن و کۆیلەی ئازادکراوی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ وتوویەتی: هیچ کاتێک نەمدیوە پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ لەدەست برسیەتی و تینوویەتی سکاڵا بکات، چ بە بچوکی و، چ بە گەورەیی[٢٠٩]

---

[٢٠٨] ﴿نسیم الریاض ٣١٢/٣﴾

[٢٠٩] ﴿اخرجه ابن سعد في الطبقات ١٦٨/١ والخفاجي في نسیم الریاض ٣١٥/٣﴾

# موعجیزەی (١٩٩)کتێبە ئاسمانیەکان شاهێدی لەسەر ڕاست و درووستی پێغەمبەرایەتی پێغەمبەری ئیسلام ﴿ﷺ﴾ دەدەن.

بە پشتیوانی خودای گەورە چەند نمونەیەك باس دەکەین لە شاهێدی پەراوە ئاسمانیەکان کەوەك ڕۆژی ڕووناك پێغەمبەرایەتی پێغەمبەری ئیسلام ﴿ﷺ﴾ دەسەلمێنن:

١- ئایەتێکی تەورات دەڵێت: ﴿إن الله قال لإبراهيم، إن هاجر تلد، ويكون من ولدهامن يده فوق الجميع، ويد الجميع مبسوطة إليه بالخشوع﴾سفر التكوين:١٧ واتە: خوا بە ئیبراهیمی فەرموو: هاجەر منداڵی دەبێت و، لەو منداڵەش کەسێك دەکەوێتەوە، کە دەستی لەسەر هەموانەوە دەبێت و، دەستی هەموانیش بەو پەڕی ڕێزەوە لەبەردەمیدا بڵاو دەبنەوە.

٢- وەهەروەها ئایەتێکی تری تەورات دەڵێ: ﴿وقال يا موسى: إني مقيم لهم نبياً من بني إخوتهم مثلك واجري قولي في فمه، والرجل الذي لايقبل قول النبي الذي يتكلم باسمي، فانا أنتقم منه﴾ سفر التثنية:١٨ واتە: بە مووسای ووت: من پێغەمبەرێکی وەك تۆ یان لە برازایانی خۆیان بۆ دادەنێم و، وتەی خۆم لەسەر زاری ئەو دەردەبڕم، جا هەر کەس وتەی ئەو پێغەمبەرە وەرنەگرێت کەبەناوی منەوە دەدوێت، خۆم تۆڵەی لێ دەسێنم.

٣- وە ئایەتێکی تری تەورات دەڵێ: ﴿قال موسى: رب إني أجد في التوراة أمة هم خير امة أخرجت للناس، يأمرون بالمعروف و ينهون عن المنكر و يؤمنون بالله، فاجعلهم أمتي قال: تلك أمة محمد﴾ واتە: موسا وتی: ئەی پەروەردگارا دەبینم تەورات باسی نەتەوەیەك دەکات کە باشترین نەتەوەن لە مرۆڤ دا هەڵبکەون و فەرمان بە چاکەو ڕێگری لە خراپە دەکەن و باوەڕیان بە خوا هەیە، خوایە داواکارم ئەوانە بکەیت بە ئومەتی من، خوا فەرمووی: ئەوانە ئومەتی موحەممەدن......

٤- پاش قسەکردن لەگەڵ موسادا، درودی خوای لێبێت ڕوودەکاتە ئەو پێغەمبەرەی

کەلەدوای موسادا دێت و پێی دەڵێت: ﴿یا أیها النبي إنا أرسلناك شاهداً ومبشرا و نذ یرا وحرزا للأميين، أنت عبدي، سميتك المتوكل، ليس بفظ، ولا غليظ، ولاسخاب في الأسواق، ولا يدافع السيئة بالسيئة، بل يعفو و يغفر، ولن يقبضه الله حتى يقيم به الملة العو جاء بأن يقولوا: لا إله الا الله﴾ سفر الشعيا: ٤٣، صحيح البخاري ٢٤١/٥ باب ﴿إنا أرسلناك شاهداً و مبشراً ونذيراً﴾ المستدرك للحاكم ٦٧٨/٢ الأحاديث المختارة للمقدس ٤٦٠/٩ وتە: ئەی پێغەمبەر وا تۆمان ناردو کردمانیت بە شایەت و مزگێنیدەر و ترسێنەر و داڵدەی نەخوێندەواران تۆ بەندەی منیت و ناوم ناویت بە پشت بەخوا بەستوو تۆ تورەو توندوتیژ و قرەقرکەری ناو بازارەکان نیت، پێغەمبەرێکی وەهایت کە لە تۆڵەی کاری خراپیدا خرا پە ناکاتەوە، بەڵکو لێبوردە دەبێت، خوا نایگێرێتەوە بۆ لای خۆی هەتا میللەتە لارەکەی پێ ڕاست نەکاتەوە بەوەی کە بڵێن ﴿لا إله إلا الله﴾.

٥- هەروەها لە ئایەتێکی کەی تەورات دا هاتووە: ﴿أنت عبدي و رسولي سميتك المتوكل﴾ ورد أيضاً في الحديث الصحيح الذي رواه بخاري وأحمد والبيهقي: واتە تۆ بەندەو پێغەمبەری منیت و ناوم ناویت پشت بەخوا بەست.

٦- هەروەها لە تەوراتدا هاتووە: ﴿محمد رسول الله، مولده بمككة، وهجرة بطيبة، وملكه بالشام، وأمة الحامدون﴾ و رواه الطبراني في مجمع الزوائد للهيثمي ٢٧١/٨ وقال: فيه من لم أعرفهم، الفردوس للديلمى ٤٠٠/٢ ورمز لحسنه، وفيض القدير للمناوي ١٩٥/٤ واتە: موحەمەد پێغەمبەری خوایە، لەدایك بوونی لە مەککەیەو، کۆچی بو (طیبە)یە و موڵکی لەشامدایەو، ئوممەتەکەشی سوپاسگوزاری خوان هەروەها ئایەتێکی کەی تەورات دەڵێ: ﴿عبدى المختار ليس بفظ ولا غليض﴾ واتە :بەندە هەڵبژاردەکەم تورەو توندو تیژ نییە. وەهەروەها لەبایی سی و سێ هەمی کتێبی پێنجەمی تەوراتیشدا ئەم ئایەتە دەڵێت: وتی: پەروەردگار لە (سینا ) وە هات و لە (ساعیرا) وە هەڵات و درەوشایەوە و لەچیای

(فاران)یش هەق ئاشکرا دەکرێت و لەلای ڕاستیەوە هەزاران مرۆڤی پاکی لەگەڵ دەبێت، سفر التثنیة: ٢/٣٣ ئەو ئایەتە پێغەمبەرایەتی -موسا- سەلامی خوای لێ بێ دەگەیەنێت و، لەوەی کە دەڵێت لە ساعیردا درەوشایەوە، هەواڵی پێغەمبەرایەتی عیسا سەلامی خوای لێ بێ ڕادەگەیەنێ، لەهەمان کاتیدا هەواڵی پێغەمبەرایەتی پێغەمبەری ئیسلام موحەممەد ﴿ﷺ﴾ ڕادەگەیەنێ بەوەی کە دەڵێت: هەق لەلای چیای فارانەوە ئاشکرا دەبێت، لەبەرئەوەی بە کۆی دەنگی هەموو شارەزایان: فاران ناوی چیاکانی ناوچەی حیجازە. ئەم ئایەتەی تەورات بەبێ پێویست بوون بە هیچ بەڵگەیەکی تر، وەك ڕۆژی ڕووناك هەواڵی پێغەمبەرایەتی پێغەمبەری ئیسلام موحەممەد ﴿ﷺ﴾ ڕادەگەیەنێت، ئینجا ئەوەش کەدەڵێ: لەلای ڕاستیەوە هەزاران مرۆڤی پاکی لەگەڵ دادەبێت ئەو ڕاستیە دەسەلمێنێ کەلەئایەتەکەی سورەتی (الفتح)دایە کە دەفەرموێ ﴿ذلك مثلهم في التوراة﴾ چونکە ئایەتەکەی تەورات باسی هاوەڵەکانی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾بە پاکان و قیددیسان دەکات، کە ئەولیاو پیاو چاکانن، وە هەروەها لە بابی چوارەمی کتێبی میخائیل پێغەمبەردا ئەم ئایەتە هەیە کەدەڵێ: لە ئاخر زەماندا ئوممەتێکی ڕەحم پێکراو دەبن کە خواوەندی هەق دەپەرستن و لەلای چیا پیرۆزەکە خەڵکێکی زۆر کۆدەبنەوە کەلەهەموو هەرێمێکەوە دێن و پەروەردگار دەپەرستن و هاوبەشی بۆ برپیارنادەن ئەو ئایەتە عەرەفە دەردەخات و خەڵکە زۆرەکەش حاجیانن کە بەرەو ئەو چیا پیرۆزە دەچن و خواوەند دەپەرستن، ئوممەتە ڕەحم پێکراوەکەش ئوممەتی پێغەمبەری ئیسلامە ﴿ﷺ﴾ چونکە ئەو ناونیشانە دروشمی ئەوانە.هەروەها ئەم ئایەتەش کە لە بابی چل و دووهەمی کتیبی ( ئەشعیا ) دایە دەڵێت : خوای حەق تعالا لە ئاخیر زەماندا هەڵبژاردەکەی خۆی ڕەوانە دەکات و ( روح الامين ) کەجبریلە دەنێرێت بۆ لای و فێری دەکات پاشان ئەویش جبریل چۆنی فێر کردووە هەر بەو جۆرە خەڵکی فێر دەکاتەوە و بەهەق و ڕەوا حکوم ڕانی نێوانیان دەکات ئەو هەڵبژرادەیەی خوای گەورە ڕووناکیەکی وەهایە

کەخەڵکی لەتاریکی دەرباز دەکات و بەرەو ڕووناکی دەیانبات خوای پەروەردگارم هەموو ئەو شتانەی فێرکردوم کە ڕوو دەدات وا منیش بە ئێوەی دەڵێم ئەم ئایەتەش بە تێروتەواوی وەسفەکانی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ڕوون دەکاتەوە وەهەروەها ئینجیلیش لە چەندەها ئایەتی دا هاتووە ( وانی أطلب من ربی فیعطیکم فارقلیطاً یکون معکم الی الابد ) ئینجیلی یوحەننا ( ١٤ ، ١٦ ) واتە لە پەروەدگارم داوا دەکەم فارەقلیتێکتان بداتێ کەی هەتا دنیا دنیایە لەگەڵتان دا بێت مامۆستا عەبدولوەهاب نەججار لە ( قصص الانبیاء ) دا لاپەڕە ( ٣٩٧ ، ٣٩٨ ) باسی ئەوە دەکات کە پرسیاری لە ڕۆژهەلاّتناسی بەناوبانگی ئیتالی دکتۆر ( کارلۆ نیلینۆ ) لە بارەی ئەو ووشەیەوە کردووە بەو سیفەتەی کە پسپۆری زمانە یۆنانیە کۆنەکانە لەوەلاّمدا ووتیەتی فارەقلیت واتە : بە مانای ئەو کەسەی کە زۆر حەمد بکرێت واتە بە تەواوی مانی ووشەی ( محمد و أحمد ) دەگرێتەوە وەلە ئایەتی سێزدەهەمی بابی دووهەمی ئینجیلی یوحەننا دا دەڵێت کاتێ کە ئەو گیانی ڕاستیە دێت بۆ هەموو ڕاستیەك ڕێنمایتان دەکات چوونکە لەخۆیەوە نادوێت بەڵکو هەرچیەك دەبیستێت پێتان دەڵێت و هەواڵی ئەو شتانە شتتان پێڕادەگەیەنێت کە لە داهاتوودا دەبن و ڕوودەدەن ئەم ئایەتەش زۆر بە ڕاشکاوی لە بارەی پێغەمبەری﴿ صلی الله علیه وسلم ﴾ئیسلامەوە دەدوێ، لەبەر ئەوەی ئایا کێیە لەو جگە لەو کە هەموو خەڵکی بەڕاستی بانگکردبێت و جگە لە سروش و وەحی خوای گەورە هیچی تر نەڵێت و هەرچی جبریل- سەلامی خوای لێبێت- پێی بڵێت ئەویش ڕاییگەیەنێت و هەواڵی ڕووداوەکانی دوا ڕۆژ و قیامەتی بەدرێژی ڕاگەیاندبێت؟

عیسا پێغەمبەر – سەلامی خوای لێبێت- لە ئینجیلدا فەرموویەتی: من دەڕۆم تاکو سەرگەورەی جیهان بێت، ئایا لە دوای عیسا – سەلامی خوای لێبێت- جگە لە پێغەمبەری ئیسلام﴿ ﷺ ﴾ کەسی تر هاتووە کە سەرگەورەی جیهانی کردبێت و هەق و ناهەقی لە یەك جیاکردبێتەوە و خەڵکی بۆ ڕێگای خێر و چاکە ڕێنمایی کردبێت؟ واتا : عیسا – سەلامی خوای

لێبێت- هەمیشە مژدەی هاتنی پێغەمبەرێکی داوە کە لە دوای خۆی دێت وەك خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا ئەمە زۆر بە ڕوونی دەردەبڕێت و دەفەرموێت:

﴿وَإِذْ قَالَ عِيسَى ابْنُ مَرْيَمَ يَا بَنِي إِسْرَائِيلَ إِنِّي رَسُولُ اللَّهِ إِلَيْكُم مُّصَدِّقاً لِّمَا بَيْنَ يَدَيَّ مِنَ التَّوْرَاةِ وَمُبَشِّراً بِرَسُولٍ يَأْتِي مِن بَعْدِي اسْمُهُ أَحْمَدُ فَلَمَّا جَاءهُم بِالْبَيِّنَاتِ قَالُوا هَذَا سِحْرٌ مُّبِينٌ {٦}﴾الصف

واتە بیر بکەرەوە کاتێ کە عیسای کوڕی مەریەم گوتی: ئەی کوڕانی یەعقوب بێگومان من نێردراوی خوام بۆ لای ئێوە، ئەو تەوراتەی کە لە پێش مندا هاتووە بە ڕاستی دائەنێم وە مژدەتان پێدەدەم بە پێغەمبەرێك کە لە دوای من دێ ناوی ئەحمەدە، وەهەروەها لە زەبووریشدا چەندەها ئایەت هەن کە زۆر بە ڕوونی و ڕاشکاوی باسی هاتنی پێغەمبەری ئیسلام موحەممەد دەکەن، چەند نمونەیەك لەم بارەیەوە: ئایەتێك لە زەبووردا دەڵێ: أللهم ابعث لنا مقيم السنة بعد الفترة. واتە: خوایە پاش ئەو ماوەیە، دامەزرێنەری سوننەتمان بۆ بنێرە. بێگومان خۆ (مقيم السنه)یش یەکێکە لە ناوەکانی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ وە لە بابی حەفتاودوهەمی زەبووریشدا ئەم ئایەتە هەیە کە دەڵێ: لە دەریاوە تا دەریا و لە ڕووبارەکانەوە تا ئەوپەڕی زەوی موڵکی ئەو دەبێت و لە یەمەن و دوورگەکانەوە دیاری بۆ دێت و پادشایان ملکەچی دەبن و شوێنی دەکەون و لە هەموو کاتێکدا سڵاواتی لەسەر دەدرێت و لە هەموو ڕۆژێکدا دوعای بەرەکەتی بۆ دەکرێت و لە مەدینەوە ڕووناکییەکانی ئەو دەدرەوشێتەوە و هەتایە هەتایە ناوی هەر دەمێنێت و پێش ئەوەی خۆر بەدی بهێنرێ ناوی ئەو بووە و تا خۆریش بمێنێ ناوی ئەو هەر دەمێنێت، ئەم ئایەتەش وەك ڕۆژی ڕووناك بە ئاشکرا وەسفی پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ دەکات، چونکە دوای داود – سەلامی خوای لێبێت- جگە لەو موحەممەد﴿ﷺ﴾ ئایا هیچ پێغەمبەرێك هاتووە کە بانگەوازی ئایینی ئاشکرا کردبێت و بە

خۆرهەلآت و خۆرئاوادا بلآوی کردبێتەوە و پادشایانی ملکەچ کردبێت کە باجی جزیەی بدەنێ و، پادشا و دەسەلآتدارەکانی بەوپەڕی خۆشەویستییەوە ملکەچی بن، هەرچی ڕۆژ لە پێنجیەکی مرۆڤایەتییەوە نزا و سەلآواتی پێشکەش بکرێت و ڕووناکییەکانی لە مەدینەوە بدرەوشێتەوە ئایا جگە لە موحەممەد پێغەمبەر(ﷺ) کەسی تر هاتووە وەها بێت؟ بێگومان نەخێر، وەهەروەها لە (صوحوف)ی پێغەمبەراندا چەند ناوێکی پێغەمبەر(ﷺ) هاتووە کە بە زمانی سریانی و عیبری واتای (محمد ، أحمد ، المختار، مصطفى) دەگەیەنن، لە صوحوفی شوعەییدا – سەلامی خوای لێبێت- وشەی (موشەففەح) بە واتای موحەممەد و لە تەوراتیشدا وشەی (حمیاطا) واتە: پێغەمبەری حەرەم هەیە، هەروەها المختاریشی تیادایە و لە تەوراتدا (الحاتم) و (الخاتم) و(مقیم السنه)یش و لە تەورات و زەبووردا مازمار لە صوحوفی ئیبراهیم و تەوراتدا و نوحەید لە تەوراتدا هەیە.

خوێنەری بەڕێز ئابەو شێوەیە کتێبە ئاسمانیەکان وەك ڕۆژی ڕووناك و زۆر بە ڕاشکاوی دان دەنێن بە ڕاستی و دروستی پێغەمبەرایەتی پێغەمبەری ئیسلام محمد(ﷺ) هەزاران درووود بۆ گیانی پاکی ئەم پێغەمبەرە پایەدارە.

## موعجیزەی (٢٠٠) پێغەمبەر(ﷺ) لە پشتەوەشڕا بینیویەتی:

عن أبي هريرة(رضي الله عنه) أن رسول الله (ﷺ) قال ( هل ترون قبلتي هاهنا فوالله ما يحضى على خشوعكم ولا ركوعكم إنّي لأراكم من وراء ظهري )[٣٠٠]

واتە: ئەبو هورەیرە-خوا لێی ڕازی بێت- دەڵێت: پێغەمبەر خوا (ﷺ) فەرمووی: ئایا وا دەزانن کە من تەنها پێشەوەی خۆم دەبینم نازانم لە پشتمەوە چی دەکەن؟ سوێند بە خوا

[٣٠٠] پوختەی صەحیحی بوخاری، ل ١٢٠.

هیچم لێ وون نابێت نه سوجەداکانتان و نه ڕکوعەکانتان، چونکه من له پشتی خۆمەوه دەتانبینم، بەڕاستی ئەوەش موعجیزەیەکی تره له موعجیزه گەوره و ناودارەکانی پێغەمبەری ئیسلام ﴿ﷺ﴾.

## موعجیزەی (٢٠١) گۆڕەکەی فڕێی دایه دەرەوه :

ئەنەس -خوای لێ ڕازی بێ- وتی : پیاوێکی نەصرانی هەبوو ، موسڵمان بوو ، سووڕەتی بەقەرەو سوورەتی ئالی عیمرانی خوێند ، جاروبار کەئایەتێ دەهات بۆ پێغەمبەر ئەو دەینووسی ، له پاشا بووەوه بەگاور وەدەیوت : موحەممەد بێجگه لەوەی کەمن بۆم نوسیوه هیچی تر نازانێ ،جا خوا مراندی و کۆمەڵەکەی ناشتیان ، وه بۆ سبیەنێ کەتەماشا دەکەن وا زەوی لاشەکەی توڕ دابوویه دەرەوه وتیان : ئەمه ئیشی موحەممەدو هاوڕێکانیەتی ، لەبەر ئەوەی ڕایکردووه له دەستیان و له ئاینەکەیان پەشیمان بۆتەوه ، ئەم هاوڕێ یەی ئێمەیان بۆ سوکایەتی پێ کردن والێ کردووه ، دیسان گۆڕێکی قوڵتریان بۆی هەڵکەندو ناشتیانەوه ، بەلام بۆ سبیەنێ دیسانەوه زەوی توڕی دابووه دەرەوه ، دیسان وایان وتووەو هەتا توانیان گۆڕێکی قوڵ قوڵیان بۆ هەڵکەندەوه ، کەچی بۆ سبیەنێ هەمدیسان زەوی لاشەکەی توڕدابووه دەرەوه ، ئیتر زانیان کەئەوه ئیشی خوایه و لەخەڵکەوه نیه ،لەبەر ئەوه ئەوانیش تووڕیان داو خواکردی بەپەندو کردی بەبەڵگەیەکی ڕوون و ئاشکرا لەسەر ڕاست ودرووستی ئاینی پێغەمبەر (ﷺ) [٢٠١]

---

[٢٠١] (اخرجه مسلم في صفات المنافقين واحكامهم رقم ٢٧٨١) .

## موعجیزەی (٢٠٢) ترس خستنە دڵی ناحەزەکانی :

تەبەرانی لەموعاویەی کوڕی حیدەی قوشەیریەوە هێناویەتی دەڵێت : من چووم بۆلای پێغەمبەر (ﷺ) کەچوومە لای فەرمووی : (اما اني سالت الله ان يغنيني بالسنة تحفيكم وبالرعب يجعله في قلوبكم ) واتە : من داوام لەخواکرد بە ووشکە ساڵی بۆ ڕیشەکێشکردنتان و ترس خستنە دڵتانا یارمەتیم بدات ، بەدەستەکانی ئاماژەی کردو وتی : من ئاواو ئاوا سوێندم خواردووە باوەڕت پێ نەهێنم شوێنت نەکەوم بەردەوام ووشکە ساڵی ڕیشەکێشی کردم و ترسم لەدڵمدا بووتا هاتمە بەردەمت[٣٠٢]

## موعجیزەی (٢٠٣) سەرکەوتن بەتاڵە مووەکانی پێغەمبەر (ﷺ):

تەبەرانی لە جەعفەری کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی حەکەمەوە هێناویەتی خالیدی کوڕی وەلید لە ڕۆژی یەرموك کڵاوێکی (قلنسوة) ی لەدەستدا وتی : بۆی بگەڕێن بەڵام نەیان دۆزیەوە ، وتی : بۆی بگەڕێن ئەمجارە دۆزیانەوە سەیریان کرد قلنسوەیەکی دڕاو وکۆنە ، خالید وتی : پێغەمبەر (ﷺ) عەمرەی کردو سەری تاشی و خەڵکی هەڵپەیان بوو بۆ تاڵەمووەکانی ، من پێشیان کەوتم و لەلایەوە کردمە ناو ئەم کڵاوە ، دوای ئەوە هەر شەڕێکم کردبێ و ئەم قلنسووەم پێبووبێت سەرکەوتنم پێبەخشراوە[٣٠٣]

---

[٣٠٢] (هەیسەمی لە ج٦ ، ص ٦٦ ) دا دەڵێت : سەنەدەکەی حەسەنە نەسائی و جگە لەویش لە باسی ترس هێناویانە ) .

[٣٠٣] (هە یثە می ج٩ ، ص٣٤٩ ) دەڵێت تەبەرانی و ئەبو یەعلا بەهەمان شێوە بەکەسی صەحیح هێناویانە ) .

## موعجیزەی (٢٠٤) پڕشنگەکە مایەوە تاچوونەوە لای داکیان :

ئەحمەد لە ئەبو هورەیرەوە -خوای لێ ڕازی بێ - هێناویەتی دەڵێت : ئێمە لەگەڵ پێغەمبەری خوادا (ﷺ) نوێژی عیشامان دەکرد کەسوجدەی دەبرد حەسەن وحوسەین -خوا لێیان ڕازی بێ -دەچوونە سەر پشتی ، کە سەری بەرز دەکردەوە دەیخستنە پشتیەوە و زۆر بەنەرمی لەسەر پشتی لای دەبردن ، کەدەگەڕایەوە بۆسوجدە بردن دەچوونە سەر پشتی تا نوێژەکەی تەواو دەکرد لەسەر ڕانی خۆی دایدەنان ، ئەبو هورەیرە دەڵێت : منیش هەستام چووم بۆ لای وتم : ئەی پێغەمبەری خوا بیان بەمەوە ؟ بریسکەیەك هات ، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی : (بچنەوە لای دایکتان ) پڕشنگەکە مایەوە تا چوونە لای دایکیان [٢٠٤] هەروەها ئەبوو نەعیم لە (الدلائل ص ٢٠٥) لە ئەبوهورەیرەوە - خوای لێ ڕازی بێ - هێناویەتی دەڵێت : حەسەن -خوای لێ ڕازی بێ - لای پێغەمبەر (ﷺ) بوولە شەوێکی تاریکدا پێغەمبەر (ﷺ) حەسەنی زۆر خۆشدەویست حەسەن وتی : دەچمەوە بۆلای دایکم ، منیش وتم : ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) منیش لەگەڵی بچم ؟ فەرمووی : نا بریسکەیەك لەئاسمانەوە هات ، حەسەن لەبەر ڕۆشناییەکەیەوە چوو تاگەیشتەوە لای دایکی بە ڕاستی ئەوە موعجیزەیەکی زۆر گەورەو ناوادارە سوپاس بۆ خوای گەورە وە درووود بۆ گیانی پاکی پێغەمبەرە پایەدارەکەی (ﷺ) .

---

[٢٠٤] (هە یثە می لە ج٩ ، ص١٨١ ) دا دەڵێت : ئەحمەد و بەزار بەکورتی هێناویانە و واهاتووە : لەشەوێکی تاریکدا ، کەسەکانی ئەحمەد جێی متمانەن ، بەیهەقی لە ئەبوهورەیرەوە بەهەمان شێوە هێناویەتی وەك لە (البداية والنهاية ج٦، ص١٥٢) دا هاتووە

## موعجیزەی (٢٠٥) پەنجەکانی ڕۆشنایییان دەبەخشی :

بوخاری لە حەمزەی کوڕی عەمری ئەسلەمیەوە –خوای لێ ڕازی بێ– هێناویەتی دەڵێت : لەگەڵ پێغەمبەر (ﷺ) بووین لەشەوێکی تاریکدا بوو جیابووینەوە و پەنجەکانم ڕۆشنایییان دەبەخشی تا هەمووان لەسەر ئەو ڕووناکیە دەچوون پەنجەکانیشم ڕووناکیان دەبەخشی [٢٠٥]

## موعجیزەی (٢٠٦) خەڵکی لەماڵەکانیان گوێیان لەدەنگی بوو :

دەنگی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) زۆر دەڕۆیی هیچ کەسێکی تر وەك ئەو دەنگی نەدەگەیشتە خەڵکی لە عایشەوە –خوای لێ ڕازی بێ– دەڵێ : پێغەمبەر (ﷺ) ڕۆژی هەینی دانیشتبوو لەسەر دوانگە فەرمووی بەخەڵکی دانیشن عەبدوڵڵای کوڕی ڕەواحە دانیشت لە (بني غنم) وترا ئەی پێغەمبەری خوا کوڕی ڕەواحە دانیشتووە لە (بني غنم) کە گوێ ی لەتۆ بووە کەبەخەڵکت دەوت دانیشن ئەویش لە جێگای خۆی دانیشتووە [٢٠٦]

---

[٢٠٥] (ئیبن کە ثیر لە البدایة والنهایة ج ٨ ص٢١٢ دا دەڵێت : بوخاری لە مێژووەکەیدا بەسەنەدی باش بەکورتی هێناویەتی ، وەئەبو نەعیم لە الدلائل ص٢٠٦ لە حەمزەوە بەهەمان شێوەی بوخاری هێناویەتی ) .

[٢٠٦] ( اخرجه ابو نعیم (ص ٣٧٩) واخرجه البیهقي في الدلائل (ج٦، ص٢٥٦، ٢٥٧ ) .

## موعجیزەی (٢٠٧) خوای گەورە دڵی موسڵمانان پەیوەست دەکات بەیەکەوە :

یەکێکی تر لە موعجیزە ئاشکراو دیارەکان پەیوەست کردنی دڵی موسڵمانانە بەیەکەوە لەلایەن خوای گەورەوە ئەوەش وەك پشتگیرییەکی ئاشکرا بۆ پێغەمبەر (ﷺ) خوای گەورە لەقورئانەکەی دا دەفەرمووێ ﴿ وَأَلَّفَ بَيْنَ قُلُوبِهِمْ لَوْ أَنفَقْتَ مَا فِي الْأَرْضِ جَمِيعًا مَّا أَلَّفْتَ بَيْنَ قُلُوبِهِمْ وَلَٰكِنَّ اللَّهَ أَلَّفَ بَيْنَهُمْ إِنَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٦٣﴾ يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ حَسْبُكَ اللَّهُ وَمَنِ اتَّبَعَكَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ ﴿٦٤﴾ ﴾ الانفال ٦٣-٦٤ واتە : هۆگری خستە دڵەکانیان ئەگەر بەختت بکردایە هەرچی لەزەویدا هەیە هۆگریت نەدەخستنە نێوان دڵەکانیانەوە بەڵام خوا هۆگری خستنە نێوانیان بەڕاستی هەر ئەو زاڵی کار درووستە ئەی پێغەمبەر (ﷺ) خوات بەسە هەروەها ئەو بڕوادارانەش کەشوێنت کەوتوون وەهەروەها خوای گەورەو پایە بەرز دەفەرمووێت : (وَاعْتَصِمُواْ بِحَبْلِ اللّهِ جَمِيعاً وَلاَ تَفَرَّقُواْ وَاذْكُرُواْ نِعْمَتَ اللّهِ عَلَيْكُمْ إِذْ كُنتُمْ أَعْدَاء فَأَلَّفَ بَيْنَ قُلُوبِكُمْ فَأَصْبَحْتُم بِنِعْمَتِهِ إِخْوَاناً وَكُنتُمْ عَلَىَ شَفَا حُفْرَةٍ مِّنَ النَّارِ فَأَنقَذَكُم مِّنْهَا كَذَلِكَ يُبَيِّنُ اللّهُ لَكُمْ آيَاتِهِ لَعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ {١٠٣} ال عمران ١٠٣ واتە : هەمووتان دەست بگرن بەهۆی پەیوەستیتان بەخواوە کەقورئانە چەند بەرەکەو لێك جیا مەبن بیر لەبەهرەو چاکەی خوا بکەنەوە بەسەرتانەوە لەکاتێکدا کەئێوە دوژمنی یەکتر بوون بەڵام خوا هۆگری خستە نێوان دڵەکانتان ئیتربوون بەبرای یەکتر بەهۆی چاکەی خواوە وە ئێوە لەسەر لێواری چاڵێ بوون لەئاگر بەڵام خوا

ڕزگاری کردن لێ ی ئابەو جۆرە خوا بەڵگەکانی خۆی ڕوون دەکاتەوە بۆتان تابەردەوام بن لەسەر ڕێنموونی یان لەسەر شارەزایی خوای گەورەو پایەبەرز هۆگری خستە نێوان دڵی بڕواداران و ڕیزەکانی ڕێك خستن وە ووتەکانی کۆکردنەوە و کردنی بەیەك وەکردنی بەیەك دەست کەوایان لێ هات تەنها خوای گەورە و پێغەمبەر (ﷺ) و بڕواداران بەوەلی و سەرپەرشتیاری خۆیان بزانن ، وەبەری و دەست بەرداری کوفر و ئەهلی کوفر بن وە دژایەتی بکەن و بجەنگن دژی کوفرو کافران لەیەك سەنگەرو خەندەقدا ، وایان لێ هات کە توندووتیژ بن بەسەر کافران و لەنێوان خۆشیاندا واتە: لەنێوان بڕواداران دا بەبەزەیی و سۆزبن بەڕاستی ئا ئەوەش موعجیزەیەکی ئاشکرایەو پشتگیریەکی ڕوون ڕەوانە لە پێغەمبەر (ﷺ) .

## موعجیزەی (٢٠٨) پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ سێ جار بەهێزترین پیاو دەدات بە ئەرزدا کە ناوی ڕوکانە بوو.

لە ئەبوو ئومامەوە -خوا لێی ڕازی بێت- دەڵێ: پیاوێك هەبوو لە بەنی هاشم پێیان دەوت ڕوکانە کە یەکێك بوو لە بەهێزترین خەڵکی و زۆر توند و تیژ بوو وە هاوبەش پەیداکەر بوو، وە شوانی مەڕ بووە لە دۆڵێکدا، کە پێیان دەوت (إضم) پێغەمبەری خوا﴿ﷺ﴾ ڕۆژێك لە ماڵی عائیشەوە دەرچوو ڕووی کردە ئەو دۆڵە، وە گەیشت بە ڕووکانە، پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ هیچ کەسێکی لەگەڵدا نەبوو، ڕوکانە لەبەری هەستا و وتی: ئەی موحەممەد تۆی قسە بە پەرستراوەکانمان لات و عوززا دەڵێی، وە خەڵکی بانگدەکەی بۆ لای خوای زاڵ و لێزان؟ ئەگەر خزمایەتیم لە گەڵ تۆدا نەبوایە قسەم لە گەڵدا نەدەکردی، مانای ڕوکانە هەڕەشەی کوشتنی لە پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ کرد، وە وتی داوا لە خوای زاڵ و کاربەجێی خۆت بکە بتپارێزێ

لە من، وە وتی: من پێشنیاری شتێکت بۆ دەکەم: ئایا زۆرانبازی لە گەڵ من دەکەی؟ وە داوا لە خوای زاڵ و کاربەجێی خۆت بکە یارمەتیت بدات و سەرت خات بەسەرمندا، ڕوکانە وتی منیش داوا لە لات و عوززا دەکەم؟ وتی ئەگەر تۆ منت خست بەزەویدا ئەوا من دە مەڕت دەدەمێ، پێغەمبەر ﴿ ﷺ ﴾ فەرموی: بەڵێ ئەگەر تۆ بتەوێ: پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ داوای کرد لە خوای زاڵ و کاربەجێ کە یارمەتی بدات و سەریخات بەسەر ڕوکانەدا، روکانەش داوای لە لات و عوززا کرد کە یارمەتی بدات و سەری بخات بەسەر موحەممەددا، پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ پەلاماری داو گرتی و خستی بەزەویدا و لەسەر سنگی دانیشت، روکانە وتی هەستە تۆ نەبووی ئەوەت کرد لە گەڵ مندا و خستمت بە زەویدا، بەڵکو ئەوە خواکەت خوای زاڵ و کار بەجێ بوو یارمەتی دایت، لات و عوززا سووك و سەرشۆڕ بوون، وە هیچ کەسێ پێش تۆ وای پێم نەکردووە، با ئەوجاریش زۆرانبازی بکەینەوە، ئەگەر ئەوجارەش سەربکەویتەوە بەسەر مندا ئەو دە مەڕی تریشت دەدەمێ، پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ گرتی و هەریەکەیان داوای لە خوای خۆی کرد، هەروەك یەکەمجار داوایانکرد، دیسان پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ سەرکەوت بەسەریدا و خستیەسەرزەوی و دانیشت لەسەر جگەری، روکانە دووبارە گوتی هەستە تۆ نەبوویت من خست بەزەویدا و سەرکەوتی بەسەرمدا، بەڵکو ئەوە خواکەت خوای زاڵ و کاربەجێ بوو، کە یارمەتی دایت و سەری خستیت بەسەر مندا و لات و عوززای سوك و سەرشۆڕ کردن، هیچ کەسێك پێش تۆ نەیتوانیوە وام لێ بکات و بمخات بەزەویدا، ئەوجاریش ڕوکانە وتی: با ئەو جارەش زۆرانبازی بکەینەوە ئەگەر ئەوجارەش تۆ منت خست بەزەویدا ئەوا دە مەڕی تریشت دەدەمێ، پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ گرتی و ئەوجارەش هەریەکەیان داوایان لە پەرستراوی خۆیان کرد کە سەری بخات، بۆ سێیەم جار پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ سەرکەوت بەسەریدا و خستی بەزەویدا، ڕوکانە وتی: تۆ نەبووی ئەوەت کرد بە من و بۆ سێ جار یارمەتی دایت و لات و عوززای سوك و ڕیسواکرد، وتی سی مەڕ لە مەڕەکانم بۆ خۆت هەڵبژێرە، پێغەمبەر﴿ﷺ﴾

پێی وت من ئەوەم ناوێ، بەڵام بانگت دەکەم بۆ لای ئیسلام، ڕوکانە وتی: نەخێر تا نیشانەیەکم پیشان نەدەی، درەختێکی سەمورە لەوێ نزیك بوو، کە خاوەنی لق و پۆپ بوو، پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ ئاماژەی بۆکرد و فەرمووی وەر پێشەوە بە فەرمانی خوا، درەختەکە بوو بە دوو لەتەوە، بەرەو لای هات لە سەر نیوەی لەت بوونەکەی بە لق و پۆپەکانیەوە تا هاتە بەردەستی پێغەمبەری خوا﴿ﷺ﴾، روکانە وتی: شتێکی گەورەت پیشاندام، پێی بڵێ بگەڕێتەوە، پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ پێی فەرموو: خوا شاهید بێ لەسەرت کە من داوام لە خوای گەورە کرد( عز وجل ) کە درەختەکە بگەڕێتەوە شوێنی خۆی و گەڕایەوە، تۆ وەڵامی بانگەوازی من دەدەیتەوە لە بارەی ئەوەی کە تۆی بۆ بانگ دەکەم، روکانە وتی: بەڵێ، پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ فەرمانی کرد بە درەختەکە بە لق و پۆپەکەیەوە تا بەیەکەوە لکایەوە و گەڕایەوە شوێنی خۆی پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ بە روکانەی فەرموو موسڵمان بە سەلامەت دەبی، روکانە وتی: شتێکی گەورەم لێت بینی، بەڵام ئەوەم پێ ناخۆشە کە ژن و منداڵی مەدینە قسەم لە بارەوە بکەن، بڵێن روکانە ترسی چووەتە دڵەوە، بەڕاستی ژن و منداڵی مەدینە دەزانن کە کەس بەسەر مندا سەرنەکەوتووە و هیچ کاتێك چ بەشەو چ بەڕۆژ ترس نەچۆتە دڵمەوە هەرگیز، بەڵام داوا دەکەم کە مەڕەکان هەڵبژێری، پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ پێی وت: من پێویستیم بە مەڕەکانت نییە، ئەگەر سەرپێچیم بکەیت و موسڵمان نەبیت، پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ روکانەی بەجێهێشت و گەڕایەوە، وە ئەبوبەکر و عومەر گەیشتن پێی لە ماڵەکەی عائیشەدا، هەواڵی پێدان کە ڕوویکردۆتە دۆڵی (إضم) ئەبوبەکی و عومەر پێیان وت ئەی پێغەمبەری﴿ﷺ﴾ چۆن چووی بۆلای ئەو دۆڵە بە تەنیا کە دەتزانی کە ئەوێ شوێنی روکانەیە، کە ئەو بەهێزترین کەسە لە ناو خەڵکدا، وە کەسێکی زۆر سەرسەختە بەرامبەر بە تۆ و باوەڕت پێناکا؟ پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ پێکەنی بۆیان و ئەوجار فەرمووی: ئەدی خۆ خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿والله يعصمك من الناس﴾ واتە: خوا دەتپارێزێ لە دەست خەڵکی، ئەو

ناتوانێ و دەستی ناگات بە من، خوا لەگەڵ مندایە، وتیان ئەی پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ تۆ سەرکەوتووی بەسەر روکانەدا لە زۆرانبازیدا، سوێند بەو خوایەی کە تۆی بە حەق و راستی ناردووە، ئێمە نەمانزانیوە کە هیچ کەسێك بەسەریدا زاڵ بووبێ، پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ فەرمووی: من داوام لە خوا کرد کە یارمەتی دام بەسەریدا، خوای گەورە (عزوجل) یارمەتی دام بە دە ئەوەندە بەشە لە هێز و قوەت و هێزی دەکەس[٣٠٧].

## موعجیزەی (٢٠٩) خواردەمەنی تەسبیحاتی خوا دەکات:

عن ابن مسعود قال: لقد كنا نسمع تسبيح الطعام وهو يؤكلُ وفي غير هذه الرواية عن ابن مسعود كنا نأكل مع رسول الله﴿ﷺ﴾ الطعام ونحن نسمعُ تسبيحه[٣٠٨].

واتە: لە عەبدوڵلای کوڕی مەسعودەوە دەڵێ: ئێمە گوێمان لە تەسبیحاتی خواردەمەنی بوو لە کاتێکدا کە دەخورا، وە لە ڕیوایەتێکی تردا هەر لە عەبدوڵلای کوڕی مەسعودەوە دەڵێ: ئێمە خواردنمان دەخوارد لە گەڵ پێغەمبەری خوادا﴿ﷺ﴾ گوێمان لە تەسبیحاتی خواردنەکە بوو، بەڕاستی موعجیزەیەکی گەورەیە هەزاران درووود بۆ گیانی پاکی پێغەمبەری ئیسلام﴿ﷺ﴾. وە هەروەها بوخاری لە عەبدوڵلای کوڕی مەسعودەوە هێناویەتی و دەڵێت: ئێمە ئایەتەکانمان بە بەرەکەت و ئێوە بە ترساندن لەبەر چاوە، ئێمە لەگەڵ پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ لەسەفەرێك بووین کە ئاو کەم بوو، فەرمووی:(اطلبوا فضلة من ماء) ئەوانیش قابێکیان هێنا کە ئاوێکی کەمی تێدابوو، پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ دەستی بردە ناو قاپەکە و دواتر فەرمووی :(حي على الطهور المبارك والمباركة من الله) بینیم ئاو لە نێو

[٣٠٧] ذكره البيهقي في الدلائل (٢٥١/٦) هذا وقصته مصارعة النبي (ﷺ)و روكانة كانت مروية في سنن أبي داود والترمذي والمستدرك وغيرها.
[٣٠٨] (أخرجه البخاري في المناقب ٣٥٧٩).

پەنجەکانی پێغەمبەری خوا﴿ﷺ﴾ هەڵدەقولا، ئێمە گوێمان لە تەسبیحاتی خواردن بوو کە دەخورا [٣٠٩].

## موعجیزەی (٢١٠) تەسبیحاتی بەرد لە دەستی پێغەمبەردا﴿ﷺ﴾

لە ئەبو زەوی غەفاریەوە خوای لێ رازی بێ دەڵێ: من ئامادە بووم لەلای پێغەمبەردا﴿ﷺ﴾ وە شاهێدی ئەوە بووم لە یەکێك لەکۆڕەکانی دانیشتنیدا، لەدەستیدا هەبوون وردە بەرد کە تەسبیحاتیان دەکرد لەدەستی موبارەکی دا، وە لامان بوون ئەبوبەکر و عوسمان و عەلی، خوا لێیان ڕازی بێ هەرچی لەو کۆڕەدا بوون گوێیان لە تەسبیحاتی ئەو بەردانە بوو، لە پاشان پێغەمبەر﴿ﷺ﴾بەردەکانی دایە ئەبوبەکر لەلای ئەویش تەسبیحاتیان دەکرد، ئەوەی لەو کۆڕەدا بوون گوێیان لێ بوو،لە پاشان پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ بەردەکانی دایە عومەر لەدەستی ئەویشدا تەسبیحاتیان دەکرد، وە ئەوەی کە لەکۆڕەکەدا بوون گوێیان لە تەسبیحاتیان بوون، لە پاشان پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ بەردەکانی دایە عوسمان لەدەستی ئەویشدا تەسبیحاتیان دەکرد، پاشان بەردەکانی دان بەئێمە بەڵام لای هیچ کەسێك لە ئێمە تەسبیحاتیان نەکرد [٣١٠].

بەڕاستی موعجیزەیەکی گەورەیە هەزاران درووود بۆ گیانی پاکی ئەم پێغەمبەرە پایەدارە ﴿ﷺ﴾

---

[٣٠٩] ترمذي دەڵێ فەرموودەکە حەسەنی صەحیحە.

[٣١٠] ﴿أخرجه الطبراني في الأوسط (١٤٢/٢) حديث رقم (١٢٦٦)﴾

## موعجیزەی (٢١١) دار عەصا ڕۆشنایی دەدات:

له ئەنسەوە خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ ئوسەیدی کوڕی عوضه یر و پیاوێکی تر له ئەنصارەکانی خەڵکی مەدینه لای پێغەمبەری خوا بوون ﴿ﷺ﴾ قسەیان دەکرد له لای بۆ پێویستیکی خۆیان تا چەند ساتێك له شەو تێپەڕی، وە ئەو شەوە شەوێکی زۆر سەخت و تاریك بوو، لەدواییدا دەرچوون لای پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ و گەڕانەوە لەدەستی هەر یەکێك لەوان دار عەصایەك هەبوو دار عەصای یەکێکیان ڕووناکی دەداو لەبەر ڕۆشنایی ئەو دار عەصایە بەڕێگادا دەڕۆشتن، هەتا کە ڕێگەکەیان لێك جوودا بوویەوە، عەصاکەی ئەوی تریشیان ڕۆشنایی دەدایەوە و بەردەمی ڕووناك دەکردەوە، هەر یەکێکیان لەبەر ڕۆشنایی عەصاکەی بەڕێگادا دەڕۆیی تا گەیشتنەوە لای ئەهلو کەسەکانیان، بەڕاستی ئەوانە موعجیزەی ئەوەندە گەورەن کەبەقەد تۆزقاڵێك گومان و دوو دڵی ناهێڵن لەناو دڵەکاندا سوپاس و ستایشی بێ پایان بۆ خوای گەورەو پەروەردگار وە درووود بۆ گیانی پاکی پێغەمبەرەکەی خاوەنی موعجیزاتی گەورەو بەناوبانگ[٢١١].

---

(٢١١) ﴿ أخرجه أحمد ١٣٧،١٣٨/٣﴾ وأخرجه البخاري في صحيحه (فتح الباري) باب منقبة اسيد بن حضير و عباد بن بشر ١٥٦/٧ حديث رقم (٣٨٠٥) و أخرجه الحاكم في المستدرك ٢٨٨/٣ وقال: صحيح على شرط مسلم ولم بخير جاه و وافقة الذهبي وأخرجه البيهقي دلائل البينوة (٧٧/٦) وأخرجه أبو لغيم في دلائل النبوة (٥٦١/٢) وأخرجه الجوز جاني في الكتاب أمارات النبوة (ص ٤٠٧،٤٠٦).

## موعجیزەی (٢١٢) خوای گەورە ترس دەخاتە دڵی ناحەزانی پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ یەك مانگ پێش ئەوەی کە بگاتە لایان.

لەهەردوو صەحیحەکەدا چەسپاوە واتە: صەحیحی بوخاری و موسلیم، کە دەفەرموێ: خوا سەری خستووم بە ترس خستنە ناو دڵی دوژمنانی ئیسلام بەماوەی مانگێك بەمانای ئەوەی کە پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ نیازی بوایە شەڕ لەگەڵ گەلێکی بێ باوەڕ بکات خوا ترسی دەخستە دڵی ئەو گەلە بێ باوەڕە، پێش ئەوەی کە پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ بگاتە لایان بەمانگێك، ئەگەر دووری ئەو شوێنی ئەو گەلە بێ باوەڕە مانگە ڕێگایەکیش بوایە [٣١٢]، وەهەروەها پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ دەفەرموێ: پێنج شتم دراوەتێ نەدراوە بەهیچ کەسێك لەپێش منداسەرخراوم بەسەر ناحەزانم دا بەترس خستنە ناو دڵیانەوە بەر لەوەی بگەمە لایان بە ئەندازەی مانگە ڕێگایەك، وە زەویم بۆ کراوە بە مزگەوت و پاك و خاوێن، غەنیمەت و دەستکەوتی جەنگم بۆ حەڵاڵ کراوە، بۆ هیچ کەسێکی پێش من حەڵاڵ نەکراوە، وە شەفاعەتی ڕۆژی قیامەتم پێبەخشراوە، وە پێغەمبەرانی پێش من تەنها بۆ ئەو گەلانە هاتبوون کە ئەو پێغەمبەرانە لەناویاندا بوون، بەڵام من ڕەوانە کراوم و کراوم بە پێغەمبەر بۆ هەموو خەڵکی بەگشتی.

## موعجیزەی (٢١٣) زۆر بوونی ئیمانداران بەهۆی بەرەکەتی پێغەمبەری خواوە﴿ﷺ﴾:

ئەبو نەعیم دەڵێ: نوح پێغەمبەر سەلامی خوای لێ بێت مایەوە لەناو گەلەکەی هەزار ساڵ تەنها پەنجا ساڵ نەبێت، وەئەوەی کە بڕوایان هێنا پێی لە پیاوان و ئافرەتان، ئەوانەی

[٣١٢] ﴿هذا من حديث رواه الشيخان عن جابر بن عبدالله رضي الله عنه﴾

کەلەگەڵیدا سواری کەشتیەکە بوون، دەگەیشتنە سەد کەس، بەلام ئەوانەی باوەڕیان هێنا بە پێغەمبەری ئیسلام لەماوەی بیست ساڵدا، خەڵکی ڕۆژهەلات و ڕۆژئاوا ستەمکارو زۆردارەکانی زەوی ترسیان لێ نیشت کە ملك و دەسەلاتەکەیان لەدەست دەربچێ ئەوانەش وەك کیسراو قەیصەر وە نەجاشیش موسوڵمان بوو، ئەوانەی تریش لە دەسەلات دارەکانی تری زەوی جیزیەیان دا وەك ئەهلی (نەجران ، وهجر ، وأيلة وە دومة الجندل) ومسەرکەوتنی سەرکەوتنەکان هاتە کایەوە وە خەڵك پۆل پۆل چوونە ناو ئاینی خواوە هەروەك خودای گەورە فەرمویەتی: (إذا جاء نصر الله والفتح ورأيت الناس يدخلون في الدين الله أفواجا) النصر.واتە: کاتێك کە یارمەتی و کۆمەکی خوا هات لەگەڵ سەرکەوتن شاری مەککە ئازاد کرا وە خەڵکت دی پۆل پۆل دێنە ناو ئاینی خواوە. کاتێك پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ وەفاتی کرد، خوای گەورە فەتحی مەدینە و خەیبەر و، مەککە، وە بەشێکی زۆر لە یەمەن و حەضرەمەوتی بۆ کردبوو، وە تا کاتێك پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ وەفاتی کرد ژمارەی هاوەڵەکانی گەیشتبووە سەد هەزار هاوەڵ و زیاتریش، وە لە ئاخیری ژیانی پڕ پیت و پیرۆزیدا نامەی نارد بۆ زۆربەی دەسەلاتدارەکانی زەوی وە بانگی کردن بۆ لای بەرنامەی خودای گەورە، جاهەیان بوو لەوانە وەلامی بانگەوازەکەی پێغەمبەریان دەدایەوە، وەهەشیان بوو خۆی بەزۆر گرت کە دۆڕاو خەسارەت مەند بوو، لەدوای پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ خەلیفەکانی کە ئەبوبەکر و عومەر و عوسمان و عەلی بوون خوای گەورە لەهەموویان ڕازی بێت بەردەوام بوون لەسەر فەتحی ئیسلامی کە توانیان ئەم بانگەوازە پیرۆز و پڕ خێر و بەرەکەتە بە ڕۆژهەلات و ڕۆژئاوادا بلاو بکەنەوە لەدەریای غەربی و بۆ دەریای شەرقی هەزاران دروود بۆ گیانی پاکی ئەم پێغەمبەرە پایەدارە﴿ﷺ﴾.( السيرة النبوية والمعجزات للقاضي الشيخ محمد بن احمد كنعان ص ٤٥٦ )

## موعجیزەی (٢١٤)لەت بوونی مانگ مەعجیزه گەورەو ناودارەكە :

خوای گەوره دەفەرموێ: ﴿ إقتربت الساعة وانشق القمر ﴾ واتە: ڕۆژی دوایی نزیك بوویەوەوە مانگ لەت بوو موعجیزەی لەت بوونی مانگ لەبەردەم كۆمەڵێكدا ڕووی داوە كە دەعوای پێغەمبەرایەتی پێغەمبەریان ﴿ﷺ﴾ بیست و ئینكاری یان كرد، ئەم موعجیزەیەش بۆ چەسپاندنی ئەو دەعوایە ڕووی داوە، سەرسەختی و ملنەدانی كافرانی ئەوكاتە بەپێی هەواڵی مێژوو شتێكی بەناوبانگ و زانراوە جا كاتێك كەقورئانی پیرۆز بە ئایەتی (وانشق القمر) ڕاگەیاند و دەنگدانەوەی ئەم ئایەتەش بەهەموو لایەكدا بڵاوبووەوە هیچ كام لەو كافرانەی كەباوەڕیان بەقورئان نەدەهێنا، نەیانتوانی و پرکێشی ئەوەیان نەكرد كەئەم ئایەتە بەدرۆ بخەنەوە واتە: بڵێن ڕووداوی وا ڕووی نەداوە چونكە ئەگەر ئەو موعجیزەیە ڕووی نەدایە، شتێكی چەسپاو نەبوایە لایان ئەوا بەتوندی بۆ بەدرۆخستنەوەی و بەتاڵكردنەوەی دەعوای پێغەمبەرایەتی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ ڕادەپەڕین، هەموو كتێبەكانی مێژوو بگەڕێ، هیچ كامیان چ قسەیەكی كافرانی سەبارەت بە ئینكاری لەت بوونی مانگ نەقڵ نەكردووە، ئەو كافرانەی ئەو موعجیزەیان بەچاوی خۆیان بینی وتیان كەواتە: با چەند كەسێك بڕۆن بۆ شوێنانی ترو بپرسن ئایا خەڵكی ئەو شوێنانەش ئەمەیان بینیوە؟ كە ڕۆژ بوویەوە لەیەمەن و شوێنانی ترەوە كاروان گەیشتە ئەوێ، كافرەكانیش هەواڵی ئەوەیان لێ پرسین، ئەوانیش وتیان: بەڵێ ئەمەمان بینیوە، بەڕاستی ئەوەش موعجیزەیەكی گەلێك گەورەو بەناوبانگە، خوای گەوره ئەم ڕووداوەی بەسەر مانگ دا هێناوە و كردوویەتی بە ڕووداوێكی بازدەر بەسەر هەموو یاسا گەردوونی یەكان دا، لەپێناوی چەسپاندنی

پێغەمبەرایەتی پێغەمبەرە خۆشەویستەکەیدا ﴿ﷺ﴾ و بۆ ئەوەی کە دمری بخات بانگەوازی ئەم پێغەمبەرە ﴿ﷺ﴾ بانگەوازێکی ڕاستە، وە لە فەرموودە صەحیحەکانیش باسی لەت بوونی مانگ کراوە ئەم ڕووداوە گرنگە فەرموودەی صەحیح باسی لێوە کردووە بوخاری لە ئیبن مەسعودەوە دەگێڕێتەوە دەڵێ: ﴿انشق القمر فی عهد رسول الله ﴿ﷺ﴾ فرقتین فرقة فوق الجبل و فرقه دونه، فقال علیه الصلاة والسلام اشهدوا﴾ واته: مانگ دوو کەرت بوو لەسەردەمی پێغەمبەردا ﴿ﷺ﴾ بەجۆرێك کە شاخەکە لە نێوانیان دا بوو، پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ فەرمووی: سەیرکەن و بە چاوی خۆتان ببینن...

الله اکبر لەو موعجیزە گەورە و بەناوبانگە بەڕاستی بەتەنها ئەو موعجیزە گەورەو ناوداره بەسە بۆ کەسانێك کە لە گومان و دوودڵی دان بۆ ئەوەی بەتەواوی دڵنیابن و ڕێگای ڕاست بگرنەبەر، ئەم موعجیزانە بەڵگەی ئەوەندە گەورەن کەبەقەد تۆزقاڵێك گومان و دوودڵی ناهێڵن لەناو دڵەکان دا وە وەك ڕۆژی ڕووناك پێغەمبەرایەتی پێغەمبەری ئیسلام دەسەلمێنن سوپاس و ستایشی بێ پایان بۆ خوای گەورە و پەروەردگار وە درووود بۆ گیانی پاکی پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ .

## موعجیزەی (٢١٥) کوڕی پیرەژنەکە زیندوو دەبێتەوە:

ئیبن ئەبی دنیا لە ئەنسی کوڕی مالیکەوە خوا لێی ڕازی بێ هێناویەتی دەڵێت: سەردانی گەنجێکی پیشتوانانمان کرد، خێرا مرد و دامان پۆشی و جلێکمان بەسەردادا، یەکێکمان بەدایکی ووت: چاوەڕێی پاداشتی لای خوا بە، ووتی مرد؟ وتمان بەڵێ ئەویش دوو دەستی بۆ ئاسمان بەرز کردەوە و وتی: خوایە من باوەڕم هێنا بەتۆ و کۆچم کرد بۆ لای پێغەمبەرەکەت، ئەگەر سەختیەکم بهاتایەتە ڕێ، لە سەرت لادەبردم دەی خوایە داوات لێ دەکەم ئەم

موسیبەتەم لەسەر لابە، دەڵێت: جلەکەی لەسەر دەم و چاوی لابرد، هێندەی نەبرد نانمان خوارد ئەویش نانی لەگەڵدا خواردین، بەیهەقی لە ڕێگای صالحی کوڕی بەشیری یەکێك لە زاهیدانی بەسراوە هێناویەتی لەگەڵ نەرمییەك لە فەرموودەی ئەنەسەوە چیرۆکەکە دێنێ و تیایدا هاتووە ئومسائیب پیرەژنەکی کوێر بوو، بەیهەقی لە عەبدوڵلای کوڕی عەون لە ئەنەسەوە، هێناویەتی دەڵێت: لەم ئوممەتەدا بەسیان گەیشتم ئەگەر لەناو بەنی ئیسرائیلی بونایە گەلان بۆی دابەش نەدەبوون، ووتمان ئەبو حەمزە ئەوانە کێن؟ ووتی: ئێمە لای پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ لە صوفەدا بووین، ژنێکی کۆچەر کوڕێکی خۆی لەگەڵدابوو کە باڵغ ببو هات بۆ لای پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ ئەویش ژنەکەی خستە پاڵ ژنەکان و کوڕەکەی هێنا بۆلای ئێمە، هێندەی نەبرد دەردی مەدینەی گرت و نەخۆش کەوت و پاش چەند ڕۆژێك مرد، پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ فەرمانی کرد کفنی بکەن، کە وویستمان بیشۆین فەرمووی: ئەی ئەنەس برۆ بۆلای دایکی و پێی بڵێ منیش پێم ووت: ژنەکە هات و لای پێیەکانی کوڕەکەی دانیشت و قاچەکانی گرت و وتی خوایە بە حەزی خۆم موسوڵمان بووم و بێباکانە دژایەتی بتەکانم کرد و بە حەز کۆچم کرد لەبەر تۆ، خوایە مەمدەرە بەر گورزی بتپەرستان و لەم نسیبەتەدا شتێکم توش مەکە کەنەتوانم لە ئەستۆی بگرم، ووتی: بەخوا قسەکەی تەواو نەبوو تاقاچەکانی جوڵاند و جلەکەی سەر دەم و چاوی لابرد و ژیا تا پێغەمبەر﴿ﷺ﴾وەفاتی کرد و دایکیشی مرد، بەڕاستی موعجیزەیەکی گەورەیە [٣١٣].

---

[٣١٣] لە البدیة النهایة ج٢، ص٢٩٢ دا دەڵێ: کەسەکانی سەنەدەکەی جێی متمانەن، ئەبو نەعیم لە (الدالائل ص٢٢٤) لە ڕێگای صالح لە ثابت لە ئەنەسەوە بەهەمان شێوەی پێشوو هێناویەتی.

# موعجیزەی (٢١٦) نەگۆڕانی لاشەی دوو هاوەڵی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ لەناو گۆڕدا:

جابیری کوڕی عەبدوڵلا-خوا لێ ی ڕازی بێ – دەڵێ : باوکم لە ڕۆژی ئوحوددا پێکرا ، جلەکەم لەسەر ڕوومەتی لادەبرد و دەگریام نەهیان لێ دەکردم لە گریان ، پێغەمبەر (ﷺ) نەهی لێ نەکردم ، دەڵێ : فاتیمەی کچی عمرو بۆی دەگریا ، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی : بۆ دەگریت یان بۆی ناگریت لەوکاتەوە فریشتەکان سێبەریان بۆدەکرد ، بە باڵەکانیان هەتا هەڵتان گرت [٣١٤] هەروەها جابیر -خوای لێ ڕازی بێ -وتی : پێغەمبەرم (ﷺ) پێ گەیشت پێی فەرمووم : ئەی جابیر دەتبینم قوپاویت چیتە ؟ جابیر دەڵێ : وتم ئەی پێغەمبەری خوا کەڕۆژی ئوحود باوکم شەهید بوو ، خێزان و قەرزێکی زۆری بەسەردا بەجێ هێشتووم بیر لەوە دەکەمەوە فەرمووی : حەز دەکەی باسی ئەوەت بۆ بکەم کە خوا چەند بەخۆشی پێشوازی لە باوکت کرد ؟ وتم : فەرموو : ئەی پێغەمبەری خوا فەرمووی :

هەرگیز خوای گەورە لە پشتی پەردەوە نەبێ قسەی لەگەڵ کەسێ نەکردووە بەڵام باوکتی زیندوو کردەوە و بەبێ پەردەو ڕووبەڕوو ، قسەو گفتوگۆی لەگەڵ دا کرد ، فەرمووی : پێی : ئەی بەندەی خۆم دڵت چی دەخوازێت داوای بکە لێم دەیدەم پێت ئەویش وتی : ئەی پەروەردگارم زیندووم بکەرەوە هەتا دیسانەوە لە پێناوی تۆدا دەکوژرێمەوە پەروەدگاری گەورەو سەروەریش فەرمووی : لەمێژەوە بڕیارەو داومە ئەوەی لەم دنیایە دەرچوو جارێکی تر ناگەڕێتەوە بۆ جیهان جابیر وتی : جاخوا ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە (ولا تحسبن الذين قتلوا في سبيل الله امواتا بل احياء عند ربهم يرزقون) ال عمران (١٦٨) واتە : هەرگیز وا

---

[٣١٤] (بخاري الجنائز(١٢٣١)).

گومان مەبەن ئەوانەی کەکوژران لە ڕێی خوادا مردوون نەخێر وانیە بەڵکو ئەوانە زیندوون لای پەروەردگاریان ڕۆزی دەدرێن

(حاکم لە ج٣، ص٢٠٣) لە ئەبو نەزرە لە جابیری کوڕی عەبدوڵلاوە هێناویەتی و دەڵێت: کاتێك شەڕی ئوحد هاد شەو باوکم بانگی کردم ووتی: وا دەبینم یەکەم هاوەڵی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ دەبم کە بکوژرێم و بەخوا واز ناهێنم لە کەسیْ، واتە: لە تۆ بەعیززەت تر بێت لەسەر من دوایی خودی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ من قەرزێکم لەسەرەو قەرزەکەم بدەرەوە و لەگەڵ خوشکەکانتدا چاك بە، دەڵێت: بەیانی یەکەم کوژراو باوکم بوو، لەگەڵ یەکێکی دیکە دا لەگۆڕێکدا خستماننە ژێر خاك، پاشان دەرونم ئارامی نەگرت لەیەك گۆڕدا لەگەڵ کەسێکی دیدا دای بنێم، دوای شەش مانگ چووم تا دەری بهێنم، سەیرم کرد وەك ئەو ڕۆژە وابوو کە خستبوومە ناو گۆڕەکەی جگە لە گوێی کە گۆڕانی بەسەردا هاتبوو[٣١٥]. لە گێڕانەوەکەی ئەبو نەزرەدا هاتووە: شەش مانگ ماینەوە پاشان دەرونم ئارامی نەگرت تا ئەوەی ویستم بەتەنها لە گۆڕێکدا ببینم، چوم لە گۆڕەکەدا دەری بهێنم سەیرم کرد زەویەکە هیچی لە لەشی باوکم نەخواردووە و جگە لە نەرمایی گوێی، لە گێڕانەوەیەکی تردا بەو سەنەدە دەڵێت: هیچ شێوانێکم لێنەدی جگە لەوەی چەند تاڵێکی ڕیشی چوبونە ناو خاك خورابوون[٣١٦]

ئیبن سەعد ج٣ ص ٥٦٣ لە ئەبو زوبەیر لە جابرەوە خوایان لێ ڕازی بێ هێناویەتی دەڵێت: هاوارمان بۆ کرا بۆ مردووەکانمان کاتێ موعاویە جۆگەی ئاوی ڕاکێشاو دوای چل ساڵ دەرمان

---

[٣١٥] (حاکم دەڵێت: ئەم فەرمودە لەسەر مەرجی موسلیم صەحیحە، ئیبن سەعد ج٣، ص٥٦٢ لە ئەبو نەزرەوە بە کورتی بەهەمان شێوە لێوەی هێناوە).

[٣١٦] (بو خاری لە عەتائی کوڕی جابرەوە بەشێوەی دەقەکەی حاکم هێناویەتی وەك لە البداية والنهاية ج٤، ص١٤٣ دا هاتووە.

هێنا نەرمی لەشیان چوار دەوری داگرتبوون [٣١٧]. ئیبن ئیسحاق چیرۆکەکە دێنێ و دەڵێ: باوکم لەچەند بەتەمەنێکی پێشتیوانانەوە بۆی گێڕامەوە ووتیان: کاتێ معاویە ئەو جۆگە ئاوەی لێدا کەبەسەر

گۆڕی شەهیداندا تێدەپەڕی کانیاوەکە بەسەریاندا تەقیەوە، ئیمەش هاتین تا شەهیدەکان دەر بهێنین، عومەر و عەبدوڵلامان دەرهێنان و دوو عەبایان بەسەرەوە بوو کە دەم و چاویان دا پۆشیبوون و شتێ لەگەلا گژو گیا لەسەر قاچیان بوو، وەك خۆیان وابوون دەدووت دوێنێ خراونەتە ناو گۆڕەوە[٣١٨].هەروەها ئەحمەد لە فەرموودەیەکی دورودرێژدا لە جابرەوە هێناویەتی دەڵێت من لە خیلافەتی معاویەی کوڕی ئەبو سوفیاندا بووم کە کەسێ هات بۆ لام وتی: ئەی جابر کار کەرانی معاویە رێیان کەوتۆتە سەر لەشی باوکت و بەشێ لەلەشی دەرکەوتووە، منیش چووم سەیرم کرد لەسەر ئەو شێوەیەی خستبومە ناو گۆڕ هیچی نەگۆڕابوو جگە لە شوێنەواری کوشت وکوشتار[٣١٩].هەروەها مالیك لە عەبدوڵلای کوڕی عەبدوڕەحمانی کوڕی ئەبو صەعصەعەوە هێناویەتی بیستی عەمری کوڕی جەمووح عەبدوڵلای کوڕی عەمر کە پشتیوانی و سوللەمی بوون لافاو گۆڕەکانی دەر خستبوون،ئەوان لەیەك گۆڕدا بوون و لەڕۆژی ئوحوددا شەهید بوون،گۆڕیان بۆ هەڵکەندرا تالەو شوێنەیان بگوازرێنەوە، سەیرکرا لەشیان نەگۆڕاوەو دەتووت دوێنی مردوون، یەکێکیان بریندار ببو دەستی خستبووە سەر برینەکەی، کە خرایە ژێر خاك هەروا بوو دەستی لەسەر برینەکەی لابرا دوایی چووەوە سەر هەمان بار لە

---

[٣١٧] ئەبو نەعیم (الدلائل ص ٢٠٧) لە ئەبو زوبەیر لە جابرەوە بەهەمان شێوە هێناویەتی، لە گێڕانەوەیەکی دیکەدا لە ئەبو زوبەیر لە جابرەوە هێناویەتی، ئیبن ئەبی شەیبەش لە جابرەوە لەهەمان شێوە هێناویەتی وەك لە (کنز العمال ج٥، ص٢٧٤ دا هاتووە).

[٣١٨] لای ئیبن سەعد لە ڕێگەی ئەبوو زوبەیر لە جابرەوە شایەتێکی بەسەنەدی صەحیح هەیە، لە فەتح الباری ج٣، ص١٤٢ دا هاتووە.

[٣١٩] سەمهودی لە ( وفاء الوفاء ج٢، ص١١٦ )دا دەڵێت: ئەحمەد بە کەسەکانی سەنەدی صەحیح هێناویەتی.

نێوان شەڕی ئوحد و ئەو ڕۆژەدا ٤٦ ساڵ ماوە بوو [٣٢٠].هەروەها ئیبن سەعد لە ( ج٣ص٥٦٢ ) دەڵێت:عبدوڵڵای کوڕی عەمر کەسێکی سور بوو کەسەری ڕووتاوە بوو باڵای بەرز نەبوو، عەمری کوڕی جەموحیش کەسێکی باڵا بەرز بوو، ناسران و لەیەك گۆڕدا خرانە ناو گۆڕ، گۆڕەکەیان لەبەر لافاو بوو بەوە گۆڕەکەیان دەرکەوت، کەلەشیان دەرکەوت دوو نیشانەیان لەسەر بوو عەبدوڵڵا برینی بەدەم و چاوەوە بوو دەستی لەسەر برینەکەی دانابوو،دەستی لەسەر برینەکە لابرا خوێن هات،دەستی خرایە سەر برینەکە یەکسەر خوێنەکە وەستا،جابر دەڵێت:باوکم لە گۆڕەکەدا بینی دەتووت خەوتووە، هیچ لەلەشی نەگۆڕابوو نەکەم و نەزۆر پێی وترا :کفنەکانت بینی؟ ووتی لە کفن کرابوو کە درابوو بەسەر دەم و چاویداو لەسەر قاچەکانی گیای ( حرمل ) دانرابوو سەیرمان کرد ئەوانیش هەروەك خۆیان بوون، ماوەی نێوان کوژران و دەرکەوتنی لەشیان ٤٦ساڵ بوو.هەروەها بەیهەقی لە جابرەوە هێناویەتی دەڵێت: کاتێ معاویە جۆگا ئاوەکەی لای کوژراوانی ئوحود لێدا،ئەوەش دوای ٤٠ساڵ،هاوار کرا بچن بۆ ئەوێ،چووین و تەرمەکانمان دەرهێنا نوکە ئاسنێ بەر پێی حەمزە کەوت و خوێنی هات [٣٢١].

---

[٣٢٠] ئەبو عومەر دەڵێت: گێڕەروان ڕا جیاواز نین لەسەر مونقەتیحەکەی واتاکەی لەچەند ڕوویەکی صەحیحەوە موتتەسیلە، زەرقانی ئەمە دەڵێ وەك لە (الأوجز ج٤، ص١٠٧) دا هاتووە.

[٣٢١] لە (البداية النهاية ج٤، ص٤٣)دا هاتووە، ئەبو نەعیم (الدلائيل ص٢٠٧) لە عەمری کوڕی دینار و ئەبو زوبەیرەوە هێناویەتی هەمان قسەدەکەن، سومهودی (وفاء الوفاء ج٢، ص١١٦)دا دەڵێ مامۆستامان لە (لاۆجز ج٤، ص١١)دا بە حەسەنی زانیوە کە چیرۆکەکە سێ جار دوای شەش مانگ و دوای چل ساڵ لەکاتی لێدانی جۆگاوەکەو دوای ٥٠ساڵ بەهاتنی لافاو ڕووی داوە، ئەمەش لەبەر زۆری گێڕانەوە لەهەرسێ جارەکەدا (سەمهودی ج٢، ص١١٧)دا دەڵێت لەهەموو ئەمانەدا موعجیزە دەردەکەوێ و نهێنی لەدووبارەبوونەوەشیدا ئەوەیە.

## موعجیزەی (٢١٧) بۆنی میسك لە گۆڕی هاوەڵی پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ سەعدی کوڕی موعاز دێت:

ئەبو نەعیم لە (المعرفة)دا لە موحەمەدی کوڕی شەرحەبیلەوە هێناویەتی دەڵێت: کەسێك شتێ لە خۆڵی گۆڕی سەعدی کوڕی موعازی هەڵگرت و کردیەوە سەیریکرد میسکە پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ فەرمووی: ( سبحان الله سبحان الله ) تا دەم و چاوی ناسرا [٣٢٢].

هەروەها ئیبن سەعد لە ( ج٣، ص٤٣١)دا لە ڕەبیعی کوڕی عەبدوڕەحمانی کوڕی ئەبو سەعیدی خودری لە باکیەوە لە باپیریەوە هێناویەتی دەڵێت: من لەوانە بووم کە گۆڕمان هەڵکەند بۆ سەعد لە بەقیع، هەرچەندە چینە خۆڵێکمان هەڵدەکەند بۆنی میسکمان بەسەردا دەهات تا گۆڕەکەمان تەواو کرد.

## موعجیزەی (٢١٨)ڕۆچوون بەناخی زەویدا :

بەزار لە بورەیدەوە هێناویەتی کەسێ ڕۆژێ ئوحود وتی: خوایە ئەگەر موحەممەد لەسەر حەقە ڕۆم ببە بە زەویدا خواش ڕۆی برد بە زەویدا [٣٢٣].

---

[٣٢٢] (لە کنز العامل ج٧، ص٤١)دا هاتووە و دەڵێت: سەنەدەکەی صەحیحە، ئیبن صەعد (ج٣، ص٤٣١) لە موحەمەدی کوڕی شەرحەبیلی کوڕی حەسەنەوە بە هەمان شێوە هێناویەتی بەڵام فەرمودەکەی نەهێناوە، لە گێڕانەوەیەکی تردا لێوەی هێناوە دەڵێت: کەسێ مشتێ خۆڵی لە گۆڕی سەعد هەڵگرت و بردی سەیری کرد دەبینێت میسکە...

[٣٢٣] (هەیسەمی لە ج٦، ١١٢)دا دەڵێت: کەسەکانی سەنەدەکە صەحیحن

## موعجیزەی (٢١٩)دەنگێکیان بیست نەیاندەزانی کێیە:

ئیبن سەعد ( ج٢، ص٢٧٧٦ ) لە ئیبن عەبباسەوە خوا لێی ڕازی بێ هێناویەتی دەڵێت: کاتێ پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ کۆچی دوایی کرد ئەوانەی دەیانشۆرد ناکۆك بوون، دەنگێکیان بیست و نەیاندەزانی کێیە دەیوت: پێغەمبەرتان بە جلەکانیەوە بشۆن، بەوە پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ بەجلەکەیەوە شۆردرا [٣٢٤].

## موعجیزەی (٢٢٠) باڵندەیەك چووە سەر تەرمەکەی هاوەڵەی پایەداری پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ ئیبن عەبباس و لەگەڵی چووە ناوگۆڕ:

لەهەردوو صەحیحەکەداواتە :لەبوخاری وموسلیم دا هاتووە : لە عەبدوڵلای کوڕی عەبباسەوە-خوای لێ ڕازی بێ -دەڵێ : پێغەمبەر(ﷺ) چوودەست بەناو بگەیەنێ ، منیش ئاوی دەست نوێژم بۆ ئامادەکرد فەرمووی: کێ ئەو ئاوەی ئامادە کردووە ؟ دەڵێ وتم : من فەرمووی : خوایە شارەزای بکە لەئاین دا دووعاکەی پێغەمبەر (ﷺ) خوای گەورە گیرای کرد عەبدوڵلا بوو بەزانایەکی زۆر گەورەو شارەزا لە ئاین دا و ناوی دەرکرد بە تەرجومانی قورئان

حاکم (ج٣، ص٥٤٣ ) لە سەعیدی کوڕی جوبەیرەوە هێناویەتی دەڵێت: ئیبن عەبباس خوایان لێ ڕازی بێ لە تائیف مردو منیش ئامادەی مەراسیمەکەی بووم، باڵندەیەك کە هاوشێوەی

---

[٣٢٤] (ئیبن سە عد (ج٢، ص٢٧٦ ) لە عائیشەوە بەو واتایە هێناویەتی)

نەبینرا بوو هاتە ژوورو چوویە سەر تەرمەکەی سەیرمانکرد بزانین ئایا دەردەچێت؟ نەبینرا بێتەدەر کاتێ خرایە ژێر خاك ئەو ئایەتە لە سەر گۆڕەکەی خوێنراو نەزانرا کێ خوێندی ( یأیتها النفس المطمئنة ارجعی الی ربك راضیة مرضیة فادخلی في عبادی وادخلی جنتي ) حاکم دەڵێت: ئیسماعیلی کوڕی عەلی و عیسای کوڕی عەلی دەڵێت باڵندەیەکی سپی بووە.

## موعجیزەی (٢٢١) سەوادی کوڕی قارب بەهۆی بینینی موعجیزەیەك موسوڵمان دەبێت:

ئەبو یەعلا لە موحەمەدی کوڕی کەعبی قورەیزیەوە هێناویەتی دەڵێت: عومەری کوڕی خەتتاب خوای لێ ڕازی بێت ڕۆژێ دانیشتبوو کە کەسێ دای بەلایدا، وترا ئەی ئەمیری باوەڕداران ئەو کابرایە دەناسیت؟ ووتی: کێیە؟ ووتیان ئەوە سوادی کوڕی قاربە کە جنۆکە هەواڵدەرەکەی هەواڵی دەرکەوتنی پێغەمبەری ﴿ﷺ﴾ پێدا، عومەر ناردی بەدوایدا و پێی ووت: تۆ سەوادی کوڕی قارپییت؟ ووتی: بەڵێ: ووتی تۆ لە سەرباری کاهینیت بووی؟ ئەویش توڕە بوو ووتی: لەو کاتەوەی موسوڵمان بووم ئەی ئەمیری باوەڕداران کەس ئەوەی پێ نەوتووم، عومەر ووتی: سوبحانەڵلا، ئەو بێباوەڕیەی ئێمە لەسەری بووین مەگەر لەو کاهینەی تۆ چی کەمترە، دەی پێم بڵێ جنۆکە هەواڵدەرەکەت چۆن هەواڵی دەرکەوتنی پێغەمبەری خوای پێدایت؟ ووتی: بەڵێ ئەی ئەمیری باوەڕداران من شەوێ نیمچە خەواڵوو بووم کە هەواڵ دەرەکەم هاتوو بە پێی لێی دام و ووتی: ئەی سەوادی کوڕی قارب هەستە من قسەم ببیستەو ئەگەر عەقڵت هەیە لێی تێبگە پێغەمبەرێ لەناو لوئەی کوڕی غالب نێردراوە بانگەواز دەکات بۆلای پەرستنی خوا پاشان ووتی:

عجبت للجن و تطلابها وشدها العيس بأقتابها

تهوي الى مكة تبغي الهدى ماصادق الجن ككذا بها

فارحل الى الصفوة من هاشم ليس قوامها كأذنابها

منیش ووتم: وازم لێبێنە لە ئێوارەوە خەو زۆری بۆ هێناوم، بۆ شەوی دووەم هەمان شتی کرد و ووتی لەنێو لونەی کوڕی غالبدا پێغەمبەری خوا هاتووە بانگەواز دەکات بۆ خوا و پەرستنی خوا، پاشان ئەم شعرەی ووت:

عجبت للجن و تحيارها وشدها العيس بأكوارها

تهوي الى مكة تبغي الهدى ما مؤمينوا الجن ككفارها

فارحل الى الصفوة من هاشم بين رواربيها وأحجارها

منیش هەستام و ووتم وازم لێ بێنە لە ئێوارەوە خەو زۆری بۆ هێناوم بۆ شەوی سێیەم هەمان شتی کردو ووتی لەنێو لونەی کوری غالبدا پێغەمبەری خوا هاتووە و بانگەواز دەکات بۆ خوا و پەرستشی پاشان ئەم شعرەی ووت

عجبت للجن وتجساسها وشدها الحيس بأحلاسها

تهوى الى مككه تبغى الهدى ما خير الجن كأنجاسها

فارحل الى الصفوة من بنى هاشم واسم بيعينيك الى رأسها

منیش هەستام و وتم خوا دڵی تاقیکردومەتەوە، سواری ووشترەکەم بووم و دواتر هاتم بۆ شار واتە: مەککە پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ لەنێو هاوەڵانی دا بوو، نزیك بوومەوە و وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ گوێ بگرە لەم قسەم، فەرمووی:

ئادەی ووتم: أتاني نجي بعد هدء رقدة وهم يك فيما قد تلوت بكاذب

ثلاث ليال قوله كل ليلة — أتاك رسول من لؤى بن غالب
فشمرة عن ذيل الأزارو وسطة — بي الذعلب الوجفاء غير سباسب
فاشهد ان الله لاشيء غيره — وأنك مأمون على كل غالب
وانك أدنى المرسلين وسيلة — الى الله يا ابن الأكرمين الأطاليب
فمرنا بما يأتيك يا خير من منقفى — وان كان فيجا جاء شيب الذوائب
وكن لي شفيحا يوم لاذو شفاعة — سواك بمخن عن سواء بن قارب

باس لەبەسەرهاتەکەی دەکات و لەبەردەم پێغەمبەری خوادا ﴿ﷺ﴾ شایەتومان دێنێ و داوای فەرمان و ڕێنوینی و دواتر شەفاعەتی ڕۆژی دوایی لیدەکات، پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ و هاوەڵانی زۆر بە ووتەکەم دڵخۆش بوون تا ئەوەی خۆشی لە ڕووخساریاندا دەبینرا، دەڵێ: عومەری کوڕی خەتتاب هەڵساو وتی من حەزم دەکرد ئەو قسە لە خۆتەوە ببیستم، ئەی ئێستا ئەو جنۆکە دێت بۆ لات؟ ووتی: لەو کاتەوەی قورئان دەخوێنم نا، پاشان عومەر ووتی:

ڕۆژێ لە ناوچەیەکی قوڕەیشدا بووین کە بەو کەسانە دەوترا (آل ذريح) گوێرەکەیەکیان سەر بڕیبوو و پاککەر سەرقاڵی بووکە دەنگێکمان لەناو سکی گوێرەکەکەوە بیست و هیچمان نەدەبینی، ووتی: ئەی (آل ذريح) باری سەرکەوتوو هاوارکاری بەزمان پاراوی هاوار دەکات و شایەتی دەدات هیچ پەرستراوێك نییە جگە لە خوا [٣٢٥].

---

(٣٢٥) خەرائیتی لە (هواتف الجان) لە ئەبو جەعفەر موحەممەدی کوڕی عەلی و ئیبن عەساکیر لە سوادی کوڕی قارب بە رانیش هێناویانە.

## موعجیزەی (٢٢٢) عوسمانی کوڕی عەففان بە بینینی موعجیزەیەك موسوڵمان بوو:

واقدی لە عاصمی کوڕی عومەرەوە هێناویەتی کە عوسمانی کوڕی عەففان خوا لێی ڕازی بێ وتی: لەگەڵ کاروانێك چووین بۆ شام پێش ئەوەی پێغەمبەری خوا ببێت بە پێغەمبەر، لەنزیك شام بووین لەوێ ژنە کاهینێ هەبوو هاتە ڕێمان وتی: هاوەڵەکەم هات بۆ لام و لەبەر دەرگامدا وەستا وتم: نایەیتە ژوورەوە؟ وتی: ڕێی ئەوە نادرێ ئەحمەد هاتووە و بارێ هاتووە کە لە توانادا نییە، پاشان گەڕامەوە بۆ مەککە سەیرمکرد پێغەمبەری خوا لە مەککە بانگەواز دەکات بۆ خوا[٣٢٦].

## موعجیزەی (٢٢٣) ڕاهیبێك پێی وت: چاکترینی پێغەمبەرانە نەکەی هیچ کەسێ پێشت بکەوێ بۆ لای:

ئەبو نەعیم لە تەمیمی داریەوە خوا لێی ڕازی بێ هێناویەتی کە ووتویەتی، کاتێك کە پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ وەحی بۆهات من لەشام بووم، ئەوە بۆ ئیش و کارێکی خۆم دەرچووم و شەوم بەسەردا هات، وتم: ئەمشەو خۆم ئەخەمە پەنای گەورەی ئەم شیوەوە، دەڵێت کاتێك کە ڕاکشام بۆ خەوتن، گوێم لەدەنگێك بوو بانگی ئەکرد، بەلام ئەم بینی، پەنا بەخوا بگرە، چونکە جینینی لە حزووری خوادا ئەوێ شەرمی یە ناکەن و پەنای هیچ کەس نادەن وتم: سوێند بەخوا ئەڵێیت وتی: پێغەمبەری ئومیەکان (عەرەب) پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾

---

[٣٢٦] (البداية النهاية ج٢، ص٣٣٨) داوا هاتووە، ئەبو نەعیم لە (الدلائل ص٢٩) لەڕێگەی واقدیەوە بەهەمان شێوە هێناویەتی.

دەرکەوتووە، لە حەجوون لەدوایەوە نوێژمان بەجێ هێناو موسوڵمان بووین و شوێنی کەوتین و فروفێڵی جن تیاچوو، ئەستێرەی کشاویان تێگیرا، بڕۆ بۆ لای موحەممەدی پێغەمبەری (رب العالمین) و موسوڵمان ببە، تەمیم ئەڵێت:

کە ڕۆژم لێ بوویەوە چووم بۆ گوندی (دیر ایوب) دیر ئەییوب: گوندێکە لە حەوران لە دەوروبەری دیمەشق، ئەییوب پێغەمبەر سەلامی خوای لێ بێ لەو گوندەدا ژیاوە و هەر لێرەشدا خودای گەورە تاقیکردۆتەوە ئەو کانیەشی تێدایە کە پێی دا لەزەوی و بەفەرمانی خوای هەڵقولی بووە مایەی چاك بوونەوەی قەبرەکەشی هەر لەوێیە، تەمیمی داری دەڵێ: لەوێ پرسیارم لە راهیبێك کرد و، هەواڵەکەم پێدا، راهیبەکە وتی: راستیان پێ وتویت، ئەو پێغەمبەرە لە حەرەمدا دەردەکەوێت لە حەرەمیشەوە کۆچ ئەکات و، چاکترینی پێغەمبەرانە، ئەکەی هیچ کەس پێشت بکەوێ بۆ لای تەمیم دەڵێ: هەوڵم ئەدا بەسەر شاخ و گرددا سەر بکەوم، تا ئەوە بوو گەیشتمە پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ و موسوڵمان بووم[٣٢٧].

بەڕاستی موعجیزەیەکی گەورەیە سوپاس و ستایش بۆ خوای گەورەو درووود بۆ گیانی پاکی پێغەمبەرەکەی﴿ﷺ﴾

---

[٣٢٧] (کذا في البداية ٢/٣٥٠ شرح حياة الصحابة: ٤/٣٩١-٣٩٢).

## موعجیزەی (٢٢٤) لەخەوەکەیدا بینی کەسێك هات بۆ لای و فڕێی دەدایە ناو ئاگر پێغەمبەریشی ﴿ﷺ﴾ بینی دەیگرت تا نەکەوێتە ناویەوە:

بەیهەقی لە جەعفەری کوڕی موحەممەدی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عوسمانەوە هێناویەتی، دەڵێت: موسوڵمان بوونی خالیدی کوڕی سەعیدی کوڕی عاص کۆنە، ئەو یەکەم کەسی ناو براکانی بوو کە موسوڵمان بوو، سەرەتای موسوڵمان بوونی ئەوە بوو لە خەوی دا بینی لە کەناری ئاگرا وەستێنراوە، باسی فراوانی ئاگرەکە دەکات کە هێندەی خوا خۆی دەزانێت فراوان بووە، لەخەوەکەدا وا دەبینێت، کەسێك هات بۆلای و فڕێی دەدایە ناو ئاگرەکەو پێغەمبەریشی﴿ﷺ﴾ بینی دەیگرت تا نەکەوێتە ناویەوە، لەخەوەکەیدا ترسا ئینجا کە هەستا لە خەو وتی: سوێند بەخوا ئەم خەوە ڕاستە، ئەبوبەکری کوڕی ئەبو قوحافەی بینی و باسی ئەوەی بۆ کرد، ئەبو بەکریش وتی: خێری تێدا بووە ئەوە پێغەمبەری خوایە﴿ﷺ﴾ دەی شوێنی بکەوە چونکە ئەگەر شوێنی بکەویت لەگەڵیدا ئەچیتە ناو ئیسلام ئیسلامیش ڕێ نادات بچیتە ناو دۆزەخ لەکاتێکدا باوکت کەوتۆتە ناو دۆزەخەوە، ئەویش گەشت بە پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ لەو کاتەدا پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ لە ئەجیاد بوو وتی:ئەی پێغەمبەری خوا ئەی موحەممەد بانگەواز بۆچی دەکەیت؟ پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ فەرموی: ( أدعوك الى الله وحده لاشريك له وأن محمداً عبده و رسوله وتخلع ما أنت عليه من عبادة حجر لا يسمع ولايبصر ولا ينفع ولا يدري من عبده ممن لا يعبده ) واتە: بانگت دەکەم بۆ لای خوای تاك و تەنهای بێ هاوەڵ و ئەوەی موحەممەد پێغەمبەر و بەندەیەتی واز لە پەرستنی ئەو بتانە بهێنیت و کەلە بەرد دروستکراون و نابیستن و نابینن و سودیان نیەو نازانن کێ دەیان پەرستێت و کێ نایان پەرستێت و خالید وتی: شایەدی دەدەم هیچ خوایەك نیە جگە لە

(الله)، تۆش پێغەمبەری خوایت، پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ بە موسوڵمان بوونی دڵخۆش بوو، خالید دوور کەوتبویەوە باوکی بە موسوڵمان بوونی زانی بوو، بۆیە ناردی بە شوێنیدا و هێنایان، بەو پەڕی توندی و هەڕەشەوە دواندی و بە داردەستێك لەدەستی بوو لێیدا و شکاندیەوە بە سەریدا، وتی سوێند بەخوا نانت لێ دەگرمەوە، خالید وتی ئەگەر لێم دەگریتەوە خوا هێندە ڕۆزیم دەداتێ پێی بژیم، چوو بۆلای پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ ئەویش ڕێزی لێگرت و پێکەوە بوون[٢٢٨].

## موعجیزەی (٢٢٥) لەخەوەکەیدا بینی کە ڕووناکیەك لە کەعبەوە دەرکەوت تا شاخی یەسریبی ڕوناك کرد:

ڕەویانی و ئیبن عەساکیر لە عەمری کوڕی مورەی جوهەینیەوە خوا لێی ڕازی بێ هێناویانە دەڵێت: لەسەردەمی نەزانیدا بە کۆمەڵێکی هۆزەکەمەوە هاتین بۆ حەج و لەخەومدا بینیم لە مەککە بووم کە ڕووناکیەکی درەوشاوە لە کەعبەوە دەرکەوت تا شاخی یەسریبی بۆ ڕۆشن کردەوە لە ڕوناکیەکەوە گوێم لە دەنگێك بوو دەیوت: ستەمکاران لەناوچوون و ڕووناکی دەرکەوت و کۆتایی پێغەمبەران نێردرا، پاشان ڕووناکیەکی تری دایەوە سەیری کۆشکەکانی حیرەو سپیایی مەدائینم کرد، لە ڕووناکیەکەوە گوێم لە دەنگێك بوو دەیوت: ئیسلام سەرکەوت و بتەکان شکان و پەیوەندی خزمایەتی گەیەنرا، منیش لە ترسا بێدار بوومەوە و پێم وتن: سوێند بەخوا لەم شوێنەی قورەیشدا ڕووداوێك دەبیستن، وتم کە چ خەوێکم بینیوە کە گەیشتینەوە وڵاتی خۆمان هەواڵ هات کەسێك بەناوی ئەحمەدەوە نێردراوە، منیش چووم تا

---

[٢٢٨] لە (البداية النهاية ج٢ ص٣٢دا واهاتووە)

گەیشتمە لای وتم چ خەوێکم بینیوە؟ ئەویش فەرموی: ئەی عەمری کوڕی موڕە، من پێغەمبەری نێردراوم بۆ هەموو بەندەکان و بانگیان دەکەم بۆ ئیسلام (وامرهم بحقن الدماء وصلة الارحام، وعبادة الله وحده، ورفض الاصنام، وبحج البيت وصيام شهر رمضان – شهر من اثنى عشر شهرا فمن اجاب فله الجنة ومن عصى فله نار، فامن يا عمرو، يؤمنك الله من هول جهنم) واتە: فەرمانیان پێدەکەم تا خوێن نەڕێژن و پەیوەندی خزمایەتی بگەیەنن و خوای تەنها بپەرستن و بەرپەرچی بتەکان بدەنەوە حەج بکەن و ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان بگرن مانگێك لەناو دوازدە مانگدا، هەر کەس بێت بەدەم ئەمەوە بەهەشتی بۆ دەبێت، هەر کەسێکیش سەر کەش بێت دۆزەخی بۆ هەیە، ئەی عەمر دەی بڕوا بهێنە خوا دەتپارێزێت لە گوڕوتینی دۆزەخ، منیش شایەتمانم هێناو وتم: باوەڕم هێنا بەهەرچی حەلاڵ و حەرامێك کە دەڵێیت، پاشان چەند دێرە شعرێکم لەسەر وت،

کاتێك بیستم هاتووە، بتێکمان هەبوو کە باوکم خزمەتکاری بوو، منیش هەستام و شکاندم، پاشان گەیشتم بە پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ودەموت:

| | |
|---|---|
| شهدت بان الله حق وانني | الالهة الاحجار اول تارك |
| وشموت عن ساق الازارمهاجرا | اجوب اليك الوعث بعد الدكادك |
| لاصبح خير الناس نفسا و والد | رسول مليك الناس فوق الحبائك |

پێغەمبەریش ﴿ﷺ﴾ فەرمووی: (مرحبا يا عمر) وتم: بە دایك و باوکمەوە بە قوربانت بم بمنێرە بۆ لای هۆزەکەم بەڵکو خوای گەورە بەهۆی منەوە منەتباریان بکات وەك چۆن تۆ منەت بارت کردم، ئەویش ناردمی و فەرمووی: (عليك بالرفق والقول السديد و لاتكن فظاو ولا متكبرا ولا حسودا) واتە: نەرمونیان بەو قسەی درووست بکەو ڕەق و تون و خۆ بەزلزان و حەسوود مەبە منیش چوومەوە لای هۆزەکەم وتم: بەنی ڕەفاعە بەڵکو ئەی کۆمەڵی جوهەینە

من نێردراوی پێغەمبەری خوام بانگتان دەکەم بۆ ئیسلام و فەرمانتان پێدەکەم تا خوێن نەڕێژن و پەیوەندی خزمایەتیتان هەبێت و خوای تاك و تەنها بپەرستن و بت نەپەرستن و حەج بکەن و ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان بگرن کامتان ڕازی بوو بەهەشتی بۆ دەبێت، کامیشتان یاخی بوو دۆزەخ بەشیەتی، ئەی کۆمەڵی جوهەینە خوای گەورە بە چاکترینی ئەوانەی لەون و ئەوەی لای عەرەبی تر خۆشەویست بوو لەسەردەمی نەفامیتاندا لای ئێوە ناشیرنی کردووە، چونکە ئەوان دوو دوو خوشکیان پێکەوە دەهێناو لە مانگی حەرامدا شەڕیان دەکرد و کەسێك لەدوای باوکی ژنەکەی باوکی دەهێنایەوە، دەی وەرن بەدەم ئەم پێغەمبەروە کە لەبەنی لوئەی کوڕی غالبدا نێردراوە، بەوە سەر بەرز و بەڕێزی دونیاو دواڕۆژ دەبن، هەر کامێکیان دەهات بۆلام دەیوەت: ئەی عەمری کوڕی مورە خوای گەورە ژیانی والێکردوویت فەرمانمان پێدەکەیت تا واز لە خواوەندەکانمان بهێنین و لە ئاینی باب و باپیرانمان واز بهێنین بۆ ئەوەی ئەو قوڕەیشیەی ناو توهامە بانگەشەی بۆدەکات؟ ئەوە هیچ خۆشەویستیو ڕێزدارێکی تێدانییە، پاشان پیسێکیان ئەم شعرەی وت:

ان ابن مرة اتى مقالة ... ليست بمقالة من يريد صلاحا

اني الاحسيب قول فعاله ... يوما وان طال الزمان ذباحا

ليسفه الاشياخ ممن قد مضى ... من رام ذالك لاصاب فلاحا

عەمریش وتی: خوا ژیانی درۆزنمان تاڵ بکات و زمانی لەگۆ بخات و سەری سپی بکات، سوێند بەخوا نەمرد و کوێر بوو عەقڵی لەدەستدا و نان خواردنی نەبوو، عەمری کوڕی ئەسلەمیش لەلایان چوو تا هاتنە خزمەتی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ و ئەویش سەلامی لێ کردن و بەخێرهاتنی کردن و نامەیەکی بۆ نووسین بەم جۆرە:

بسم الله الرحمن الرحيم :

( هذا كتاب من الله العزيز على لسانه رسوله بحق صادق وكتاب ناطق مع عمرو بن مرة لجهينة بن زيد، ان لكم بطون الارض و سهولها وتراع الادوية وظهورها على ان ترعو انياتها وتشربو ماء ها على ان تؤدوا الخمس وفي الغنيمة والصريمة شاتان اذا اجتمعا فان خرفتنا فشاة شاة ليس على اهل المثيرة صدقة ولا على الواردة ليقه، والله شهيد على ما بيننا ومن حضر من المسلمين )[٢٢٩] واتە : ئەمە نامەیەکی خوای بەدەسەڵاتە لەسەر زاری پێغەمبەرەکەی بە هەقێکی ڕاست و کتێبێکی دەربڕ کە بە عەمری کوڕی موڕەی بۆ زیدی کوڕی جوهەینە، ناوو دەشت و دەرو دۆڵ و سەری زەویتان بۆهەیە تا درەخت و گیای سەرپشتی بکەن و ئاوی بخۆنەوە بەرامبەر بەوەی پێنج یەك بدەن و پێنج نوێژەکە بکەن و لە دەستکەوتی صەریعیشدا دوو بەرخ ئەگەر کۆبوونەوە، ئەگەر جیا بوونەوە یەك یەك لە سەر خەڵکی، خواش شاهێدە لەسەر ئەوەی لە نێوان ئێمەو ئامادەبوانی موسوڵمانانندا هەیە

## موعجیزەی (٢٢٦) ئەم ووشانە لە تیر و تەواویدا گەیشتونەتە بەرزترین پلە:

موسلیم و بە یهەقی لە ئیبن عەبباسەوە خوایان لێ ڕازی بێ هێناویانە دەڵێت: زەماد پیاوێکی ئەزدی شەنووئە بوو هات بۆ مەککە گوێی لە هەندێ گەمژەی خەڵکی مەککە بوو دەیانوت: موحەممەد شێتە ئەویش وتی: ئەو پیاوە لەکوێ یە؟ بەڵکو خوا لەسەر دەستی من شیفای بدات، دەڵێ چووم بۆلای موحەممەد وتم من نوشتە دەکەم بۆ چاك بونەوەی شێتی،

---

[٢٢٩] لە کنز العمال ج٧ ص٦٤ داهاتووە، هەروەها ئەبو ئەعیم بە دوور و درێژی هێناویەتی لە بدایە والنهایە ج٢ ص٣٥١ دا هاتووە و تەبەرانی بە دوور و درێژی هێناویەتی لە الجمع ج٨ ص٢٤٤ دا هاتووە.

خوای گەورە کێی بوێت لەسەر دەستی من شیفای دەدات، دەی وەرە موحەممەد فەرموی: ( ان الحمد الله نحمده ونستعينه، من يهده الله فلا مضل له ومن يضلل فلا هادي له، اشهد ان لا اله الا الله وحده لا شريك له ) واتە: سوپاسی خوا دەکەین و پشتی پێ دەبەستین، هەر کەس خوا ڕێنوێنی بکات گومڕایی بۆ نییە، هەر کەسیش گومڕا بێت ڕێنوێنی بۆ نی یە، شایەتی دەدەم هیچ پەرستراوێك نییە، جگە لەخوای تاك و تەنهای بێهاوەڵ، سێ جار ئەوەی فەرموو، ئەویش وتی: بەخوا گوێم لە قسەی فاڵچی و جادوگەر و شاعیران بووە، بەڵام شتی وام نەبیستووە، دەستت بێنە با بەیعەتی موسوڵمان بوونت پێبدەم، پێغەمبەریش فەرمووی: بەیعەتی هۆزەکەشتم پێبدە بانگیان بکەیت بۆ ئیسلام ئەویش بەیعەتی پێدا، دوایی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ سوپایەکی نارد دایان بە پاڵ هۆزی زەماددا، بەرپرسی سوپاکە بە سریەکەی وت: هیچتان لەو هۆزە بردووە یەکێکیان وتی: من پاککەرەوەیەك (مەسینە) یەکم لێبردن ئەویش وتی: بیگێڕەوە بۆیان چونکە ئەوانە کەسانی زەمادن، لە گێڕانەوەیەکی تردا، زەماد پێی وت: قسەکانت دووبارە بکەرەوە بۆم، چونکە گەیشتونەتە نێوەندی دەریا واتە: لەو پەڕی بەهێزیدان [٣٣٠].

هەروەها نەسائی و بەغەوی و موسەددەیش لە موسنەدەکەیدا و ئیبن حەجەر لە الاصابه ج٢ ص٢١٠ دا هێناویانە، ئەبو نەعیمیش لە دلائل النبوه ص٧٧ لە ڕێگەی واقدیەوە هێناویەتی دەڵێت: موحەممەدی کوڕی سولەت لە باوکیەوە لە عەبدولڕەحمانی عەدەویەوە بۆی گێڕامەوە وتی: چوم بۆ مەککە تا عەمرە بکەم، لەکۆڕێکدا دانیشتم ئەبو جەهل و عوتبەی کوڕی ڕەبیعەو ئومەییەی کوڕی خەلەفی تێدا بوون، ئەبو جەهل وتی: ئەم پیاوە مەبەستی پێغەمبەرە ﴿ﷺ﴾ نێوانی تێکداوین و بە سوك سەیری هیواکانمان دەکات، ئومەییە وتی:

---

(٣٣٠) لە البداية والنهاية ج٣ ص٣٦ دا واهاتووە.

بێگومان شێتە، زەماد وتی: منیش ئەم قسەیەم لای خۆم لێکدایەوە و وتم: من کەسێکم تووشبوانی شێتی چاك دەکەمەوە لە کۆڕەکە هەستام چوم بەدوای پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ بەڵام ئەم ڕۆژە نەمبینی، بەیانی هات و چوم بۆلای دەبینم لە پشت مەقامەوە نوێژ دەکات، منیش دانیشتم تا لێبویەوە، پاشان لای دانیشتم و وتم: کوڕی عەبدوالمتەلیب ئەویش ڕوی تێکردم و فەرموی: چیت دەوێ؟ وتم من چارەسەری تووشبوانی شێتی دەکەم، ئەگەر حەزدەکەی چارەسەرت دەکەم، شتەکەت لەسەر سەخت نەبێت، من چارەسەری کەسی وام کردووە کە لەتۆ زیاتر توش بووە و چارەسەری وەرگرتووە، من گوێم لە هۆزەکەت بوو چەند خەسڵەتێکی خراپی تۆیان دەوت کە ڕێزت تێك داون و ئەوەی لەوان مردووە بە گومڕای دەزانی و گاڵتە بە پەرستراوەکانیان دەکەیت، تەنها کەسێك ئەمە دەکات کە جۆرە شێتییەك لێی دابێت، پێغەمبەریش ﴿ﷺ﴾ فەرمووی:

( ان الحمد الله نحمدوه و نستعينه، من يهده الله فلا مضل له ومن يضلل فلا هادي له، اشهد ان لا اله الا الله وحده لا شريك له ) زەماد دەڵێت: قسەیەکم بیست هیچ کات شتی وام لەوە جوانتر نەبیستبوو، داوام کرد دووبارەی بکاتەوە بۆم، ئەویش دووبارەی کردەوە، وتم: بانگەواز بۆچی دەکەیت؟ فەرمووی: (الى ان تؤمن بالله وحده لا شريك له تخلع الأوثان من رقيبتك وتشهد اني رسول الله ) واتە: بۆ بڕواهێنانت بە خوای تاکی بێهاوتا و لابردنی پەرستشی بتەکان لە سەر گەردنت و شایەتی بدەی من پێغەمبەری خوام، وتم: ئەگەر ئەمە بکەم چیم بۆ دەبێت؟ فەرمووی: ( لك الجنه ) واتە: بەهەشتت بۆ دەبێت منیش وتم: شایەتی دەدەم هیچ پەرستراوێك نی یە جگە لەخوا و پەرستشی بتەکان لەسەر گەردنم ناهێڵم نکۆڵیان لێدەکەم و شایەتی دەدەم تۆ بەندەو پێغەمبەری خوایت، ئینجا لەگەڵ پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ هەستام چەند سورەتێکی قورئان فێر بووم، پاشان گەڕامەوە ناو هۆزەکەم، عەبدوڵلای کوڕی عەبدولڕەحمانی عەدەوی دەڵێت پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ علی کوڕی ئەبو تالیبی

بە سریەیەکەوە نارد و لە شوێنێك ٢٠ وشتریان گرت و بەرێیان خستن، عەلی کوڕی ئەبو تالیب بیستی ئەوانە لە هۆزی زەمادن بۆیە وتی: بیان گێڕنەوە بۆیان، ئەوانیش ٢٠ وشترەکەیان بۆ گێڕانەوە.

## موعجیزەی (٢٢٧) لەتکردنی سنگی پیرۆزی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾:

ڕۆژێکیان موحەممەد ﴿ﷺ﴾ و برا شیریەکەی کە لەتەمەنی چوار ساڵی دا بوون، لە پشتی ماڵەکانەوە بەلای مەڕەوە بوون، لەناکاو براکەی ڕای کردەوە بۆماڵەوە هاواری کرد: دوو پیاو کە جل و بەرگی سپیان لەبەردا بوو هاتن برا قوڕەیشیەکەمیان گرد و پاڵیان خست و سکیان دڕی حەلیمەش لەگەڵ مێردەکەی بە پەلە بەرەو لای پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ ئەڕۆن ئەبینن وا هەستاوەتەوە سەر پێ و ڕەنگیشی هەڵبزکاوە حەلیمەو مێردەکەی ئەی گرن و ماچی ئەکەن و حاریث لێ ی دەپرسێ: ڕۆڵە گیان چیت بەسەر هاتووە؟ فەرموی: ( جاء ني رجلان عليها ثياب بيض، فأضجعاني، وشقا بطني، ثم استخرجا منه شيئا لاأدري ماهو؟فطرحاه ثم رداه كماكان ) واتە: فەرمووی: دوو پیاوی جل و بەرگ سپی هاتن و پاڵیان خستم و سکیان دڕیم پاشان شتێکیان تیا دەرهێنا کە نازانم چی بوو، فڕێیان داو، پاشان وەکو خۆیان لێکردەوە ئیتر دەیهێننەوە ماڵەوە، حاریث لەم ڕووداوە تێناگات و ترسی لێدەنیشێ کە موحەممەد تووشی شتێکی خراپ هاتبێ، بۆیە داوا لە حەلیمە دەکات کە هەتا زووە و مەترسییەکی لێوەدەر نەکەوتووە بیبەنەوە بۆلای کەس و کاری و با لەجیاتی چاکەو پیاوەتی بەخێو کردنی خەجاڵەت نەبن کوڕە بەناچاری هەڵدەگرن و ئەیبەنەوە مەککە لای دایکی کە دایکی ئەمە دەبینێ سەری سوڕ دەمێنێ بۆیە پرسیار دەکات: ئەی دایەنی دڵسۆز چۆن هێناوتەتەوە لەکاتێکدا کە تۆ زۆر لەسەر ئەوە سوور بویت لەلات بمێنێتەوە؟ حەلیمە وەڵامی ئەداتەوە

لەخوا بەزیاد بێ کوڕەکەم گەورە بووە و ئەوەی لەسەر شانم بووە جێبەجێم کردووە خوانەخواستە دەترسام شتێکی لێڕوبدات، بۆیە منیش بەو شێوەیەی کە تۆ پێت خۆش بێت هێناومەتەوە بۆت، خاتو ئامینە بڕوای بە قسەکانی حەلیمە نەکرد، بۆیە وتی ئەمە کاری تۆنییە ڕاستیەکەیم پێبڵێ وازی نەهێنا تا حەلیمە ڕاستی باسەکەی بۆ دایکی گێڕایەوە ئەویش وتی ترسایت شەیتان دەستی لێ بوەشێنێ؟ وتی بەڵێ،دەڵێ وتی نەبەخوا، شەیتان دەستی بەسەردا ناڕوا و ئەم کوڕەشم پایەدار دەبێت، هەواڵت بۆ بگێڕمەوە؟ حەلیمە دەڵێ بەڵێ، کاتێ کە سکم پێوەی پڕ بوو چاوم لێبوو نورێکم لێوەدەر چوو کە کۆشکەکانی بوصرای لە وڵاتی شام ڕوناککردنەوە بۆم، پاشانیش بەخوا نەمدیوە هیچ سکێك ئەوەندە سوك و ئاسان بێت، کاتێکیش کە لەدایك بوو کەوتە سەر زەوی هەردووە دەستی لە سەر زەوی داناو سەری بۆ ئاسمان بەرز کردەوە گوێی مەدەرێ وازی لێ بێنەبەم شێوەیە دایکی دڵی حەلیمەی دایەوە و بەوپەڕی ڕێز و ئیحتیرامەوە خوا حافیزی لێکرد و ڕەوانەی وڵاتی خۆیانی کردەوە، کۆمەڵێك لە هاوەڵانی پێغەمبەری خواش ﴿ﷺ﴾ پێی دەڵێن: ئەی پێغەمبەری خوا هەواڵی خۆتمان بۆ باس بکە فەرموی: بەڵێ (أنا دعوة أبي إبراهيم، وبشرى أخي عيسى، ورأيت أمي حين حملت بي أنه خرج منها نور أضاءت لها قصور الشام، واستر صعت في بني سعد بن بكر، فبينا أنامع أخ لي خلف بيوتنا نرعى بهما لنا إذا اتاني رجلان عليها ثياب بيض بطست من ذهب مملوءة ثلجا، ثم أخذاني فشقا بطني، واستخرجا قلبي فشقاه، فاستخرجا منه علقة سوداء فطرحاها، ثم غسلا قلبي وبطني بذالك الثلج حتى أنقياة، ثم قال أحدهما لصاحبه: زنه بعشرة من أمته، فوزنني بهم، فوزنتهم، ثم قال: زنه بمائة من امته فوزنني بهم، فوزنتهم، ثم قال: زنه بألف من أمته، فوزنني بهم، فوزنتهم ثن قال: دعه عنك، فوالله لو وزنته بأمته لوزنها)[٣٣١].

---

[٣٣١] سيرة ابن هاشم ١/١٦٦ قال ابن كثير: وهذا إسناد جيد قوي.

واتە: فەرمووی: بەڵێ من ئەنجامی نزاو پاڕانەوەی ئیبراهیمی باوکە گەورەمم و مژدەکەی عیسای برامم و کاتێکیش کەلەسکی دایکما بووم، دایکم نورێکی وەهای بینی کە لێوەی دەرچوو کۆشکەکانی شامی ڕووناك کردەوە لەناو ئەوەی سەعدی کوڕی بیکریش دا شیرم پێ دراوە کاتێك لەگەڵ برایەکم دا لە پشتی ماڵەکانمانەوە خەریکی مەڕ لەوەڕاندن بووین دوو پیاوی جل و بەرگ سپی( کە جبریل و میکائیلن ) هاتن و تەشتێکی لە ئاڵتون دروستکراویان پێ بوو کە پڕ لەبەفر بوو منیان گرت و سکیان لەت کردم و دڵیان دەرهێنام و لەتیان کرد و ئەڵقەیەکی ڕەشیان تیایا دەرهێناو فڕێیان دا پاشان دڵ و سکمیان بەو بەفرە وەها شۆردن هەتا پاك پاکیان کردنەوە و پاشان یەکێکیان بە هاوڕێکەی وت: ( بە دەکەسی ئوممەتەکەی دا کێشانەی بکە، ئەویش کێشانەی کردم و من لەهەموویان قورس تر بووم پاشان وتی: بە سەد کەسی ئوممەتەکەیدا کێشانەی بکە کێشانەی کردم من لە هەموویان قورستر بووم پاشان وتی بە هەزار کەسی ئوممەتەکەیدا کێشانەی بکە ئەویش کێشانەی کردم من لە هەموویان قورستربووم ، پاشان وتی بەهەموو ئوممەتەکەیدا کێشانەی بکە ئەم لەهەموویان قورستر دەبێت.

وەهەروەها لە صەحیحی موسلیمیشدا هاتووە:

( عن أنس بن مالك: أن رسول ﴿ﷺ﴾ أتاه جبريل عليه سلام وهو يلعب مع الغلمان فأخذه فصرعه فشق عن قبله فاسخرج القلب، واستخرج منه علقة سوداء، فقال: هذا حظ الشيطان، ثم غسله في طست من ذهب بماء زمزم، ثم لأمة، ثم أعاده في مكانه، وجاء الغلمان يسعون إلى أمه يعني ظئره فقالوا أن محمدا قد قتل، فاستقبلوه وهو منتقع اللون قال أنس: وقد كنت أرى أثر ذلك المخيط في صدره )[٢٣٢].

---

[٢٣٢] ( صحيح مسلم بشرح النووي: ٢/٢١٦ ).

دەگێڕێتەوە کە جبریل سەلامی لێ بێ دێتە لای پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ کە لەگەڵ منداڵان دا یاری دەکرد، گرتی و دای بەزەویدا و سنگی لەت کرد و دڵی دەرهێنا و ولەتی کرد و ئەڵقەیەکی ڕەشی لەناویا دەرهێناو فەرموی: ئەمە بەشی شەیتانە، پاشان لە تەشتێکی زێڕیندا بە ئاوی زەمزەم شۆردی، پاشان لکاندیەوە خستیەوە شوێنی خۆی و منداڵانیش بە پەلە خۆیان گەیاندە لای حەلیمەو وتیان: موحەممەدیان کوشت کە چوون بە پیریەوە دەبینن وا بەرەنگ هەڵبزرکاوی هاتەوە ئەنەس دەڵێ: شوێنی ئەو دورینەوەیەم لەسەر سنگی بەدی دەکرد بەڕاستی موعجیزەیەکی گەورەیە هەزاران درووود بۆ گیانی پاکی ئەو پێغەمبەرە پایە بەرزە ﴿ﷺ﴾.

## موعجیزەی (٢٢٨) مۆری پێغەمبەرایەتی لەسەر شانی پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ هەبوو:

چەندین ریوایەت دەربارەی ئەوە هاتووە کە پارچە گۆشتێکی بەرزەوە بووو بەموو داپۆشراو لەسەر شانی چەپی پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ هەبووە بەوێنەی هێلکەی پۆر یان کۆتر وەك لە صەحیحی بوخاری و مسلیمدا هاتووە ، ئەمەش بە مۆری پێغەمبەرایەتی ناسراوە، جا ریوایەتەکان ئەوە دەگەیەنن کە ئەم مۆرە لە کتێبە پێشوەکان دا بە یەکێك لە نیشانەکانی پێغەمبەرایەتی لە قەڵەم دراوە وەك لە چیرۆکی بوحەیرای راهیب داهاتووە ، ئەوە بوو بە هەر حاڵ هەوڵی دا تا چاوی بە مۆرەکەی سەرشانی کەوتو کە لەلای یەقین بوو خۆیەتی ئەبو تالیبی مامەی تێگەیاند ئەوەی راستی بێ ئەم مۆرە دوای لە دایك بونی لەسەرشانی پەیدابووەو راست تریش دوای لەت کردنی سنگی هەردوو پێشەوا ،ئیمامی بوخاری وموسلیم بەسەندی خۆیان لە سائیبی کوڕیەیەزیدەوە لە صەحیحەکەیاندا ریوایەتیان کردووە کە ووتویەتی : پوورم بردمی بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾

ووتی ئەی پێغەمبەری خوا ئەم خوشکەزایەم ئازاری هەیە ، ئەوەیش دەستی موبارەکی هێنا بەسەرم داو دووعای فەڕوبەرەکەتی بۆ کردم پاشان دەست نوێژی گرتوو لە ئاوی دەست نوێژەکەیم خواردەوەو لەپشتیەوە وەستام و لە نیوان هەردوو شانی دا سەیری مۆری پێغەمبەرایەتیم کرد وەك هێلکەی پۆڕ وەها بوو[٣٣٤] ئیمامی موسلیمیش بەسەنەدی خۆی لە جابیری کوڕی سەمورەوە ریوایەتی کردووە کە وتویەتی :لەسەر پشتی پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ مۆرێکم بینی کەوەك هێلکەیەی کۆتر وەهابوو[٣٣٥]

## موعجیزەی ( ٢٢٩ )مانگایەك شایەتی بۆ ڕاستگۆیی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ دەدات:

. پێشەوا ئەحمەدلە موجاهیدەوە هێناویەتی دەڵێت بە تەمەنێك کەسەردەمی نەفامی دیبوو لە غەزای ( رۆدس ) دا قسەی بۆ کردم ، ناوی ئیبن عیسا بوو ، وتی من مانگایەکی ماڵەوەمان دەلەوەڕاند کە لە ناو سکیەوە دەنگێکم بیست دەیوت (یا آل ذریح ) ووشەیەکی رەوانبێژانە کەسێکی ئامۆژگاری کار دەڵێ هیچ پەرستراوێك نیە جگە لە خوا ، دەڵێت :چووینە مەککە سەیرمانکرد پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ لەمەککە بانگەواز دەکات[٣٣٦]

بەڕاستی ئەوە موعجیزەیەکی ئەوندە گەورە یە کەوەك ڕۆژی ڕووناك پێغەمبەرایەتی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ دەسەلمێنێت و دڵنیایی وئاسودەیی تەواو دەبەخشێ بە دڵ و دەروون هەزاران درود بۆ گیانی پاکی ئەم پێغەمبەرە پایەدارە ﴿ﷺ﴾ .

---

[٣٣٤] صحیح البخاري کتاب المناقب ـ باب ختم النبوة
[٣٣٥] صحیح مسلم کتاب الفضائل ـ باب صفة خاتم النبوة
[٣٣٦] هه یثه می له ج٨ ص ٢٤٣ ده ڵێت که سه کانی سه نه ده که جێ متمانه ن

## موعجیزەی (٢٣٠) هەركە پێغەمبەری خوا (ﷺ) گۆچانەكەی دا لەووشترەكە ئەوەندە خێرابوو پێش ووشترەكانی تر دەكەوت :

جابیری كوڕی عەبدولا – خوایان لێ ڕازی بێت – ووتی : لە غەزایەكدا لە خزمەتی پێغەمبەردابووم ، ووشترەكەم لە ژێر ماوە ستاو لە سوپاكە بەجێ مام ، پێغەمبەر (ﷺ) لەدوای سوپاكەوە بوو ، تەشریفی هات وبەمن گەیشت فەرمووی جابیر عەرزم كرد : بەڵێ فەرمووی : ئەوە چیتە وا جێماوی؟ وتم : ووشترەكەم پەكی كەوتووە و وەستاوە لەبەر ئەوە بە جێماوم ، جا پێغەمبەر(ﷺ) لە ولاخەكەی دابەزی و بە گۆچانەكەی خۆی چەند گۆچانێكی دا لە ووشترەكەی من ،ئەو جا فەرمووی: سوار بە منیش سواربوومەوە سەرنجم دا ووشترەكە خێرابوو، ناچاربووم كە جڵەوی بگرمەوە نەوەكو پێش ووشترەكەی پێغەمبەر(ﷺ) بكەوێ . پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی : ئەیجابیر ژنت هێنا ؟ ووتم : بەڵێ، فەرمووی: چیت هێناوە كچ یان بێوەژن ؟ جابیر دەڵێ : وتم بێوەژنێكم هێناوە فەرمووی : ئەی بۆ چی كچێكت نەهێنا پێكەوە یاری ودەست بازی بكەن ؟ وتم : ئەی پێغەمەری خوا خۆت دەزانی كە عەبدوڵلای باوكم لە غەزای ئوحود دا شەهید بوو باوكم كەمرد حەوت خوشك و یا هەشت منداڵكاری بەسەردا بە جێ هێشتم لەبەر ئەوە بێوە ژنێكم هێنا كە كارامەبێ ، ماڵ و مێردی بینیبێ هەتا سەرپەرشتیان بكاو نەهێڵێ سەریان لێ بشێوێ و سەریان شانە بكاو سەروكاریان بكا جا پێغەمبەر(ﷺ) نزای باشی بۆكردم و فەرمووی : ئەوا دەڕۆیتەوە كە چویتەوە هۆشیار بە نەكەی بەهۆی دووریەوە بۆسەرجێیی جڵەوی هۆش لە دەست بدەی ئەو جار پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی : ئایە ووشترەكەت دەفرۆشیت ؟ وتم :

بەڵێ جا بە ئۆقیەك كە دەكاتە چل دەرهەمی زیوو لێی كریم ئەنجا پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ لە پێش منەوە گەیشتەوە ماڵەوە ، منیش بۆ بەیانی گەیشتمەوە جێ ڕۆشتم بۆ مزگەوت و تەماشم كرد پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ لە بەر دەرگای مزگەوت بو ، فەرمووی: ئێستا گەیشتیتەجێ ؟ وتم : بەڵێ فەرمووی: دەوشترەكەت بەردە بچۆرە ناومزگەوت و دووركات نوێژی سوننەتی گەڕانەوە لەسەفەر لەناو مزگەوت دا بكە منیش چوومە ژوورەوەو نوێژەكەم كرد، ئەوجا پێغەمبەر﴿ﷺ﴾فەرمانی بە بیلال كرد ئۆقیەیی زیوی لە جیاتی ووشترەكەم بۆم كێشاو ولە كێشانەكەیش سلاوی دایەو قورس كێشای منیش پارەكەم وەرگرت و ڕۆیشتم تا پشتم هەڵكرد لەوان بەرەو ماڵ كەوتمەڕێ ،كەچی گوێم لێی بوو فەرمووی : جابیرم بۆ بانگ بكەرەوە منیش لە دڵی خۆمدا وتم : ئەی ئێستا وشترەكەم دەداتەوە بەسەردا وە لە دڵەوە لەوەم پێ ناخۆش تر نەبوو كە وشترەكەم بداتەوە بەسەردا كەچی پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ فەرمووی:وشترەكەت بەرەوە بۆ خۆت و پارەكەیش هەر بۆ خۆت [٢٣٧]

## موعجیزەی (٢٣١) ڕێگای بۆچۆڵ كەن و وازی لێ بێنن لەبەرئەوەی فەرمانی پێ كراوە :

لە كاتی گەشتەكەی لەمەككەوە بەرەو مەدینە پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ڕۆژانی دووشەممەو سێ شەممەو چوارشەممەو پێنج شەممە لە ( قوباء ) مایەوە و ڕۆژی هەینی بەرەو ( طیبة ) واتە : مەدینەی پیرۆز كەوتەڕێ و لەڕێگادا گەیشتە شوێنی نیشتەجێ بوونی نەوەی سالمی كوڕی عەوف كاتی نوێژی هەینی هاتەبەرەوە و لەومزگەوتەدا كەدەكەوێتە ناو شیوە ( رانوناء ) دەوە

---

[٢٣٧] ( حدیث صحیح : أخرجه مسلم فی صلاة المسافرین وقصرها باب استحباب تحیة المسجد رقم ٧١٥

، ئێستە پێی دەوترێ مزگەوتی جومعە ، نوێژی جومعەی لەگەڵ موسڵمانەكاندا بەجێ هێناو ئەوەش یەكەم نوێژی جومعە بوو كە پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ئەنجامی دابێ ،لەووتاری یەكەم جومعەی پێغەمبەری ئازیزمان ( ﷺ ) زۆربەكاریگەری باسی ئیمان و یەقینی كردو ئامۆژگاری موسڵمانانی كرد دوای نوێژی جومعە ئەوەی سالمی كوڕی عەمری كوڕی عەوف هاتنە خزمەتی و ، وتیان ئەی پێغەمبەری خوا لەناومان دا لەناو پیاوی زۆرو چەك و هێزوپارێزگاری دا ، بمێنەرەوە دەستیان بەجڵەوی وشترەكەیەوە ئەگرت بەشكو لەلایەن بمێنێتەوە ئەویش دەی فەرموو : ( خلو سبیلها فانها مامورة ) واتە : ڕێی بۆ چۆڵ كەن و وازی لێ بێنن چونكە فەرمانی پێكراوە،جڵەوی وشترەكەشی شل دەكردو هەرچی بەلای ماڵێكی ئەنصاری دا كەلەڕێگاكەی دا بوون ، تێ ئەپەڕی داوایان لێ دەكرد لەلای پیاوی زۆوچەك وپارێزگاریدا بمێنێتەومو هەمان فەرمانیشی پێ دەفەرموونەوە ، هەتا ئەوە بوو گەیشتە شوێنی مزگەوتە پیرۆزەكەی و لەوێ وشترەكە چۆكی دا داو پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) بەسەریەوە دانەبەزی و وشترەكە هەستایەوە و كەمێك ڕۆیشت و پێغەمبەری خواش ( ﷺ ) جڵەوی بۆ شل كردبوو ،كەچی وشترەكە ئاوڕی بۆ دواوە دایەومو گەڕایەوە شوێنی چۆك دا دانی یەكەم جاری و چۆكی دا دایەوە ، مزگەوتەكەی پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) لە مەدینە بنیاتنرا ئەوەبوو لەو شوێنەدا بنیاتیان نا كە وشترەكە چۆكی دادا ، كەلەبنەڕەتدا باخ بوو و هەندێكی وێران بوویوو و كرابوویە قەبرستان و هەندێكیشی كرابوویە خەرمانی ووشك كردنی خورما و هی دووبرای هەتیو بوو بەناوی سەهل و سوهەیلی كوڕانی عەمر ، كە ئەسعەدی كوڕی زوراره سەرپەرشتی دەكردن ، پێغەمبەر ( ﷺ ) ویستی موعامەلەیان لەگەڵ دا بكات هەتا شوێنەكە بكڕێ بۆ مزگەوت كەچی دووبراكە ڕازی نەبوون بی فرۆشن و وتیان :

دەی بەخشین بە خواو پێغەمبەرەکەی ، بەڵام پێغەمبەری ئازیز (ﷺ) ڕازی نەبوو و بڕیاریدا دەبێ بەکڕین بێ ئەوەبوو کڕی بە دە دینار و ئەبوبەکریش پارەکەی دا ، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمانی دا دار خورماکان ببڕن و زەوی یەکەشی تەخت بکرێ ئا بەوجۆرە مزگەوتە پیرۆزەکەی مەدینە دروست کرا لەو شوێنەدا کە وشترەکە چۆکی لێ دادا بەڕاستی ئەوەش موعجیزەیەکی گەورەیە[٣٢٨]

## موعجیزەی(٢٣٢) تیژ ڕەوەبوونی ئەسپەکەی ئەوبو تەلحە:

ئیمامی بوخاری و پێشەوایانی تری فەرموودە دەگێڕنەوە کە : شەوێك دانیشتوانی مەدینە لە دەنگێك ڕاچڵەکین ،هەندێکیان ڕووەو دەنگەکە ڕۆیشتن لە ڕێگا دا گەیشتن بە پێغەمبەر(ﷺ) کەلەو سەرەوە دەهاتەوەو پێش ئەوان بەرەو دەنگەکە ڕۆیشتبوو دەیفەرموو: مەترسن شتێکی ئەوتۆ نی یە مەترسی ببێت پێغەمبەر(ﷺ)بەسواری ئەسپەکەی ئەبوو تەلحە بەرەو دەنگەکە ڕۆیشتبوو ، کە ئەسپەکەش زینی لەسەر نەبوو شمشێرێکیش کرابووە ملی پاشان بە ئەبوو تەلحەی فەرمووی : (إنا وجدنا فرسك بحراً) واتە : ئەسپەکەت زۆر تیژڕەوە ، ئەم ئەسپەش زووتر لەڕۆشتندا زۆر سست بوو ، بەڵام پاش ڕوداوی ئەم شەوە هیچ ئەسپێکی تری پێ نەدەگیشتەوە .[٣٢٩]

---

[٣٢٨] ژیانی ئازیزمان (ﷺ) بەرگی (١) لاپەڕ ٤٧٥-٤٧٦-٤٧٧-٤٨٦) .
[٣٢٩] صحيح رواه بخاري و مسلم و أبو داود والترمذي و ابن ماجه و احمد

## موعجیزەی (٢٣٣) تا پێغەمبەر (ﷺ) لە نوێژەکەی بووەوە ئەسپەکە هیچ ئەندامێکی خۆی نەجوڵاند :

بەریوایەتێکی صەحیح چەسپاوە کە: پێغەمبەر (ﷺ) لەسەرفەرێکدا هەڵسانوێژ بکات، بەئەسپەکەی خۆی فەرموو: خوا فەرو بەرەکەتت پێ ببەخشێت لە جێی خۆت مەجوڵێ هەتا نوێژەکەمان دەکەین ئەمەی فەرموو :ئینجا لە ڕوی قیبلەوە داینا هەتا پێغەمبەر (ﷺ) لە نوێژ بووەوە ئەو ئەسپە هیچ ئەندامێکی خۆی نەجوڵاند[٢٤٠]

بەڕاستی جێی سەرسوڕمانە بەد بەختانی دوور لە دین ئەم هەموو بەڵگەو موعجیزە گەورانە دەبینن کەچی ڕێگای ڕاست ناگرنەبەرو بەرەو هەڵدێری گومڕایی و سەرلێشواوی هەڵدەخلیسکێن وە ئیمان ناهێنن .

## موعجیزەی (٢٣٤) سکاڵای وشترێك لە خزمەتی پێغەمبەردا (ﷺ)

ئەم ڕوداوا بریتی یە لە بەسەرهاتی ئەوە ووشترەی کە لە پێنج شەش ڕێگاوە لە هاوەڵە بەناوبانگەکانەوە گێڕدراوەتەوە وەك : ئەوبو هورەیرە، ثە علبە ی کوڕی مالیك ، جابیری کوڕی ئەبوو ئەوفا و چەند کەسێکی تریش لە هاوەڵانی وەك ئەمانە جا هەموو ئەم هاوەڵانەلەوەدا یەکدەنگن کە : ووشترەکە هاتە خزمەتی پێغەمبەر (ﷺ) و سوژدەی ڕێزی لە بەردەم بردوو قسەی لەگەڵ کرد هەر ئەم هاوەڵانە لە چەند ڕێگاو ریواتەتێکی

---

(٢٤٠) الشفا ١ / ٣١٥ نسيم الرياض ٣ / ٩٥

تردا دەگێڕنەوە کە : ئەو ووشترە لە باخێکدا هەڵچووبوو، هەر کەسیش بڕۆیشتایەتە ناو باخەکە هەڵمەتی بۆ دەبرد ، بەلاّم کە پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ ڕۆیشتە ناو ئەو باخە ووشترەکەی بانگ کردو دەمو لمۆزی پێ نایە سەرزەوی و لەغاوی لەدەم کرد [٣٤١] لە فەرموودەیەکی تردا دەگێڕنەوە کە پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ لێی پرسین : بۆچی وا ئەو وشترە هەڵچووە؟ لە وەلاّمدا عەرزیان کرد : ویستمان سەری ببڕین [٣٤٢]

لە ریوایەتێکی تر دەڵێت : پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ فەرمووی: ئەم وشترە سکالاّی ئەوەی لەلا کردم کە لەو کاتەوە بچووك بووە تا ئێستا لە ئیشوکاری قورسدا کاریان پێ کردووەو ئێستاش وویستویانە سەری ببڕن لەوەلاّمدا عەرزیان کرد : بەڵێ وایە .

## موعجیزەی (٢٣٥) لە پاش وەفاتی پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ ووشترەکەی وازی لە خواردن و خواردنەوە هێنا و مانی گرت :

ووشترەکەی پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ کە ناوی (العضباء) بوو، لەپاش کۆچی دوایی پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ هیچی نەخواردوو نەخواردەوە هەتا مرد [٣٤٣]

بەڕاستی ئەوانەموعجیزەی نەوەندە گەورەن کە بەقەد تۆزقاڵێك گومان و دوودڵی ناهێڵن لە ناو دڵەکان داو وەك ڕۆژی ڕووناك پێغەمبەرایەتی پێغەمبەری ئیسلام ﴿ﷺ﴾ دەسەلمێنن .

---

[٣٤١] احادیث تکلم الجمل وردت باسانید صحیحة و جیدة

[٣٤٢] صحیح رواه احمد باسناد جید واخرجه حاکم وقال صحیح الاسناد ولم یخرجاه ووافقه الذهبی

[٣٤٣] الشفا ١ /٣١٢

## موعجیزەی (٢٣٦) ئاسکێك شاهیدی دەدات کە خوا تاك و تەنهایە و موحەممەدیش پێغەمبەری خوایە :

لە ئوم سەلەمەوە خوای لێ ڕازی بێت – دەگێرنەوە کە دەڵێ : جارێکیان پێغەمبەر(ﷺ) لە بیابانێکدا بوو لەو کاتە دا ئاسکێك بانگی کرد : ئەی پێغەمبەری خوا دەڵێت ئاسکەکە ڕای دەکردو دەیوت {أشهد أن لاإله إلاالله وأنك رسول الله}[٣٤٤]

بەڕاستی جێی سەرسوڕمانە بەدبەختانی دوور لە دین ئەم هەموو بەڵگەو موعجیزە گەورانە دەبینین کە چی ڕێگای ڕاست ناگرنە بەرو بەرەو هەڵدێری و گومرایی و سەرلێ شیواوی و ماڵ وێرانی هەڵدەلیسکێن و ئیمان ناهێنن .

## موعجیزەی (٢٣٧) بزن مژەیەك شاهیدی بۆ پێغەمبەر(ﷺ) دەدات و دێتە قسەکردن بەهۆی ئەو موعجیزەیە گەورە ناوادارە هەزار کەسی دوور لە دین موسڵمان دەبن :

لە عومەری کوڕی خەتتابەوە – خوای لێ ڕازی بێ – دەڵێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەناو هاوەڵانی دا بوو ئەعرابیەك لە هۆزی بەنی سولەیم کە بزن مژەیەکی پێ بوو کە ئەو کۆمەڵەی بینی وتی : ئەوە چیە ئەو خەڵکە ؟ وتیان ئەوە ئەو پیاوەیە کە دەڵێ من پێغەمبەرم کابرای ئەعرابی هات بە ناو ڕیزی خەڵکەکە دارەت بوو دەستی کرد بە هەرەشەکردن لە پێغەمبەر(ﷺ) و زۆر بە توندی قسەی لەگەڵ کرد عومەری کوڕی خەتتاب - خوای لێ ڕازی بێ – ووتی : لێم گەڕێ ئەی پێغەمبەری خوا با هەستم بدەم

---

(٣٤٤) رواه الطبراني والبيهقي وصححه ابن حجر لوروده من طرائق اخر

لە ملی ئەو ئەعرابیە و بی کوژم پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ کە خاوەنی سۆزو بەزییە ڕێگای نەدا بە عومەر کە بی کوژێ ، ڕوی کردە ئەعرابیەکە قسەی خێری لەگەڵ کرد ئەعرابیەکە وتی : بەلات وعوززا ئیمانت پێ ناهێنم هەتا ئەو بزن مژەیە ئیمانت پێ نەهێنێ، بزن مژەکە هاتە بەردەستی پێغەمبەری خوا﴿ﷺ﴾ پێغەمبەری خوا پێی فەرموو : ئەی بزن مژەکە ، بزن مژەکە هاتە قسەو وەڵامی دایەوە بە زمانی عەرەبی ڕوونو ڕەوان خەڵکەکە هەموویان گوێیان لێ بوو ووتی : بەڵێ : لە خزمەتت دام پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ پێی ووت : کێ دەپەرستی ئەی بزن مژە: وتی ئەوەی عەرشەکەی لە ئاسمانە واتە : خوای گەورە ، موڵك و دەستەڵاتی لەزەویدایە ، وەلە دەریادایە ڕێگاکەی و ڕەحمەت و بەزەیی لە بەهەشتدایە وەسزاکەی لە ئاگردایە ، ئەوە جار پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ فەرمووی من کێم ئەی بزنمژەکە : ووتی :

تۆ پێغەمبەری پەروەردگاری جیهانیانی وە کۆتایی پێغەمبەرانی ئەو کەسە بەختەوەر بووەو سەرکەوتووە کەبڕوا بە تۆ دێنێ بەڕاستت دەزانێ وەدۆڕاو ماڵ وێرانە ئەوەی بڕوابە تۆ ناکات ئەعرابیەکە لە پاش ئەوەی کە ئەوە قسەکردنەی بزن مژەکەی بە چاوی خۆی بینی و بە گوێی خۆی گوێی لێ بوو ،بە تەواوی بۆی دەرکەوت کە ڕاست دەکات و پێغەمبەری خوایە وتی : سوێند بە خوا کە هاتم بۆلات لەسەر پشتی زەویدا ڕقم لە هیچ کەسێك نەبوو ئەوەندی ڕقم لە تۆ بوو ، بەڵام ئەمڕۆ ئێستا تۆ ئەوەندە لەلام خۆشەویستی هەتا خۆشترم دەوێی لە دایك وباوکم وەلە چاوەکانم جا ئەو جار شایەتمانی هێناو موسڵمان بوو وتی (أشهد أن لاإله إلاالله وأنك رسول الله ) پێغەمبەری خوا﴿ﷺ﴾ فەرمووی: سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە هیدایەتی دایت بە هۆی منەوە، ئەوئاینە ئاینێکی زۆر بەرزە هیچ شتێك لەو بەرزتر نیە وە ئەوەش وەرناگیرێ بە نوێژ ئەنجام دان نەبێ وەنوێژیش وەرناگیرێ ئەگەر قورئانی تیادا نەخوێندرێ وتی : فێرم کە ئەویش فێری کرد سورەتی { قل هوالله أحد } وتی : زیاترم فێر

کە پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ فەرمووی : ئەی ئەعرابی ئەوە کەلامی خوایە ئەگەر تۆ {قل هوالله أحد} بخوێنی جارێك پاداشتەکەی وەك ئەوەوایە کە سێ یەکی قورئانت خوێندبێ ، وەئەگەر سێ جار بیخوێنی وەك ئەوەوایە هەموو قورئانت خوێندبێ ئەعرابییەکە وتی : بەڵێ پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ فەرمووی : ئایە ماڵو داراییت هەیە ؟ ووتی : لە ناو بەنی سولەیم دا هیچ کەسێکی تێدا نیە لەمن فەقیرتر بێ پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ فەرمووی : بە هاوەڵاکانی ببەخشن پێ و کۆمەکی بکەن ، ئەوانیش وەڵامی بانگەوازکەی پێغەمبەریان ﴿ﷺ﴾ دایەوەو پێیان بە خشی ماڵ و دارایی و کۆمەکیان کرد ، کە ئەعرابییەکە گەڕایەوە بۆ شوێنی خۆی تووشی هەزار ئەعرابی هۆزی بەنی سولەیم بوو، لەسەر هەزار ووڵاخ سوار بووبوون، وەپێیان بوو هەزار شمشێرو هەزار ڕم پێی ووتن چیتان دەوێ و بۆ کوێ دەڕۆن ؟ وتیان دەڕۆین بۆ سەر ئەوەکەسەی کە قسە بە پەرستراوەکانمان دەڵێ دەی کوژین مەبەستیان پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ بوو ئەعرابییەکە ووتی : وامەکەن من شاهێدی دەدەم و دەڵێم {أشهد أن لاإله إلاالله وأن محمداً رسول الله} وە دەنگ و باسەکەی بۆ گێڕانەوە واتە :بەقسەهاتنی بزن مژەکە کە ئەو موعجیزە گەورەیان بۆ باس کرا هەر هەموویان وتیان : {أشهد أن لاإله إلاالله وأن محمداً رسول الله} وە هەزار کەسەکە هەرهەموویان موسڵمان بوون و هاتنە خزمەتی پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ دەیان ووت {أشهد أن لاإله إلاالله وأن محمداً رسول الله} ئەوجار وتیان ئەی پێغەمبەری خوا فەرمانمان پێ بکە فەرمووی : لە ژێر ئاڵای خالیدی کوڕی وەلید دابن هیچ کەسێك لە عەرەبو غەیرە عەرەبیش وەك ئەو هەزار کەسە ئاوا بە کۆمەڵ هەموویان تێکرا موسڵمان نەبوون

{ الله أكبر} لەو موعجیزە گەورەیە و بە ناوبانگە بەڕاستی بەتەنها ئەو موعجیزەیە بەسە کە ببێتە گەورەترین بەڵگەو نیشانە لەسەر ڕاست و دروستی پێغەمبەرایەتی ئەو پێغەمبەرە﴿ﷺ﴾ بەڕاستی پێویستە ئیماندارانیش بەو موعجیزەگەورانەی

**پێغەمبەر(ﷺ) زیاتر دڵخۆش بن و ئیمانیان پتەو و دامەزراو بێ و شانازی بکەن بەوەی کە خوای گەورە کردوونی بە ئوممەتی ئەو پێغەمبەرە پایەدارە وە هەوڵ بدەن کە ئەوە موعجیزانە پێشکەشی مرۆڤە سەرگەردانەکان بکەن کە گەورەترین دیاری یەو مایەی سەرفرازی دنیاو قیامەتە** [٣٤٥]

## موعجیزەی (٢٣٨) گورگێك قسە دەکات وشاهێدی لەسەر ڕاست گۆیی پێغەمبەر (ﷺ) دەدات :

**بەسەرهاتی بەناوبانگی گورگەکە لە چەندین ڕێگاوە گێڕدراوەتەوە لە زۆرێك لە هاوەڵ بەناوبانگەکانەوە وەرگیراوە وەك ( ئەبوسەعیدی خودری، سەلەمەی کوری ئەکوەع و ئیبن ئەبی وەهەب و ئەبو هوریرە)- خوا لە هەموویان ڕازی بێت :- هەروەها ئەم هاوەڵەش کەبەسەرهاتەکەی بەسەردا هاتووە کە ناوی ( ئوهبانی ) شوانە** [٣٤٦]

**هەموو ئەوانە لەچەند ڕێگایەکی جیاجیاوە دەگێڕنەوە کە : لەو کاتە دا شوانێك خەریکی لەوەڕاندنی مەڕەکانی بوو گورگێك هەڵمەتی بۆ یەکێك لە مەڕەکانی برد شوانەکەش مەرەکەی لەدەست ئەو گورگە دەربازکرد ئینجا ،گورگەکەلەولاوە هەڵتروشکاو کەوتە قسەکردن و بە شوانەکەی ووت:ئایە لە خوا ناترسیت وانەتهێشت ڕۆزی یەکەم بخۆم ؟ شوانەکەش وتی: شتێکی سەیرە گورگ وەك مرۆڤ قسە بکات گورگەکەش ووتی : لەوە سەیرترت پێ بڵێم؟ لەوەسەیرتر ئەوەیە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە مەدینە دا دەنگ و**

---

[٣٤٥] اخرجه ابو نعیم فی الدلائل ص ٣٢٠ واخرجه البیهقی فی الدلائل ٦ /٣٨، ٣٦ وذکره ابن الکثیر فی البدایة ٦ / ١٤٩ والسیوطی فی الخصائص ج ٢ ص ٦٥

[٣٤٦] رواه البخاري فی التاریخ الکبیر والبیهقی وابو نعیم

باسی ئەوانەی پێشو دەگێڕێتەوە دەرگاكانی بە هەشتی بۆ خراوەتە سەر پشت و ئێوەی بۆ بانگ دەكات تاكو لێیانەوە بڕۆنە ژوورەوە ئەبوهریرە –خوای لێ رازی بێت- دەیگێڕێتەوە دەڵێ : لەوەكاتەدا كە ئەو گورگە وای بە شوانەكە ووت ، شوانەكە وتی : جا كێ سەرپەرشتی مەڕەكانم بۆ دەكات تا دەڕۆم و دێمەوە ؟گورگەكە ووتی :من شوانەكەش مەڕەكانی پێ سپارد و ڕۆیشت، ئینجا لە ریوایەتەكەدا بەدرێژی بەسەرهاتەكەی وموسڵمان بوونی و بەخزمەت گەیشتنی پێغەمبەری خوای ﴿ﷺ﴾لەكاتی جەنگدا گێراوەتەوە[٢٤٧]

پاشان كە گەڕاوەتەوە بۆلای مەڕەكانی سەیری كردووەگورگەكە وەك شوانێكی دەست پاك سەرپەرشتی مەڕەكانی كردووە ژمارەیان كەمی نەكردووە ئینجا لە پاداشتی ڕێنمایی كردنەكەیدا مەڕێكی بۆ گورگەكە سەربڕیوە .

## موعجیزەی (٢٣٩) وتی ئەگەر ئەو موعجیزەیە لەمەككەدا باس بكرێت كەسی تێدا نامێنێت و چۆڵ دەبێت

ریوایەت كراوە كە جارێكیان ئەبوسوفیان ی كوڕی حەرب و صەفوانی كوڕی ئومەییە ، شتێكی سەیریان بەسەرهات ، ئەوەبوو گورگێكیان بینی كەوتبووە دوای ئاسكێك ،ئاسكەكەش خۆی كرد بە ( حەرەم ) داو ئیتربەوە گورگەكە وازی لێ هێنا، ئەوانیش سەریان لەم كارە سوڕما ، گورگەكە هاتە زمان و ووتی : سەرتان سووڕ نەمێنێت ،لەمەسەیرتر موحەممەدی كوڕی عەبدوللایە ﴿ﷺ﴾ لەمەدینە بانگتان دەكات بۆ بەهەشت ئەبوسوفیان بە صەفوانی كوڕی

---

[٣٤٧] رواه الامام احمد وغيره

ئومەییەی ووت : بەلاتو عوززا ئەگەر ئەوە لەمەککە دا باس بکەیت کەسی تێدا نامێنێت و چۆڵ دەبێت (٣٤٨)

بەڕاستی ئەوە مەعجیزەیەکی ئەوەندە گەورەیە کە زۆر بەڕاشکاوی بەبێ گومان پێغەمبەرایەتی پێغەمبەری ئیسلام ﴿ﷺ﴾ دەسەلمێنێت وە دڵنیایی وئاسودەیی تەواو دەبەخشێ بە دڵ و دەروون سوپاس و ستایشی بێ پایان بۆ خوای گەورە وە درود بۆ گیانی پاکی پێغەمبەرەکەی ئیسلام ﴿ﷺ﴾ .

## موعجیزەی (٢٤٠) کۆمەڵە گورگێك دێنە خزمەتی پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ داواکاری یەکانیان دەخەنەڕوو:

بەیهەقی لە حەمزەی کوڕی ئوسیدەوە هێناویەتی دەڵێت : پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾لەگەڵ تەرمی پشتیوانێکدا چوو بۆ بەقیع ، گورگێك لەسەر ڕێگەکەقاچەکانی ڕاخستبوو ، پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾فەرمووی: هاتووە داوای ماف بڕینەوە دەکات دەی بەشی بۆ ببڕنەوە {هذا جاء يستفرض فارفضواله} وتیان بڕیارت لەسەر چەندێکە بۆی ببڕینەوە ئەی پێغەمبەری خوا فەرمووی { من کل سائمة شاة في کل عام } واتە ( لەهەر ڕانەگەلێك سەرێك بۆ هەرساڵێك وتیان

ئەی پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾زۆرە ، پێغەمبەریش ﴿ﷺ﴾ئاماژەی کرد بۆ گورگەکە وازیان لێ بێنە ، گورگەکەش وازی هێناو لاچوو ،هەروەها واقیدی لە کەسێکەوە لە موتەلیبی کوڕی عەبدوللای کوڕی حەنتەبەوە هێناویەتی دەڵێت : پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾لە مەدینە بوو کە

---

(٣٤٨) الشفا ١ /٣١١ نسیم الریاض٢ /٨٤

گورگێك هات و لەبەردەستیدا وەستاو پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾فەرمووی: ئەمەوەفدی دڕندەکانە بۆتان ، ئەگەریش حەزدەکەن شتێکی بۆ ببڕنەوە بۆ جگە ئەوی تێمە پەڕێنن،ئەگەریش حەزمدەکەن وازی لێ بێنن و کەناری لێ بگرن چی برد ئەوە ڕۆزیەتی، ووتیان ئەی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ دڵمان هیچ ناگرێ هیچی پێ بدەین ، پێغەمبەریش ﴿ﷺ﴾بە سێپە نجەی ئاماژەی کرد بۆ گورگەکەو وازیان لێ بێنە ڕێی خۆت ببڕە ، ئەویش بە لووره لور دەرچوو وە هەورەها ئەبونەعیم لە جوهەینەوە هێناویەتی دەڵێت : وەفدی گورگەکان کە نزیکەی سەد گورگ بوون هاتن بۆ لای پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ پێغەمبەریش﴿ﷺ﴾ نوێژی دەکرد بۆیە دانیشتن پێغەمبەر﴿ﷺ﴾فەرمووی: ئەوە وەفدی گورگەکان هاتن بۆلاتان ، داواتان لێدەکەن لەبەشەخۆراکتان بەشیان بۆ ببڕنەوە لە جگە لەوە دڵنیاو بێ خەم بن ، ئەوانیش سکالآیان لاکرد، پێویستیان پێیەتی ، پێغەمبەر﴿ﷺ﴾فەرمووی : {فأدبرهم} { دەی پشتیان لێ بکەن و بڕۆن} ئەوانیش لاچوون و لوورەیان دەهات [٢٤٩] بەڕاستی موعجیزیەکی گەورە و بە ناوبانگە .

## موعجیزەی (٢٤١) هەرکەباسی پێغەمبەری خوای ﴿ﷺ﴾ لای شێرەکە کرد شێرەکە زیانی پێ نەگەیاندو ڕێگاکەی پێشاندا:

حاکم لە {ج ٣ ،ص٦٠٦} لە موحەممەدی کوڕی مونکە دیرەوە هێناویەتی،سەفینەی مەولای پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ وتی: چوومە دەریاو ئەو کەشتیەی تیایدا بووم شکا بۆیە چوومە سەر پارچەیەکی فڕێی دامە شوێنێك کە شێرێکی تێدا بوو بەرەو ڕووم هات،من وتم :ئەی ئەبو

---

(٢٤٩) بەیهەقی و بەزار لە ئەبوو هورەیرەوە بەکورتی هێناویانە لە (البداية والنهاية )ج٦،ص١٤٦دا واهاتووە

حارث من مەولای پێغەمبەری خوام ئەویش سەری دانەواندوبە شانی خۆی دایە لام و پاڵی پێوەنام و تالەوێ دەریکردم وبردمیە سەر ڕێگەکەو سووکە نرکەیەکی کرد ،وامزانی ماڵئاواییم لێ دەکات ئەوەکۆتا بینینشم بوو بۆی [٣٥٠]

هەروەها بەزار لە سەفینەوە هێناویەتی دەڵێت : من لە دەریا دا بووم کە کەشتیەکەمان شکا،ڕێگەمان نەزانی تا ئەوە بوو شێرێك هاتە ڕێمان ، هاوەڵانم دواکەوتن و من لێی نزیك بوومەوە ، وتم من سەفینەی هاوەڵی پێغەمبەرم ﴿ﷺ﴾ و ڕێمان ونکردووە ئەویش لەبر دەممەوە چوو تا چووینەسەر ڕێگەکە دواتر نزیك بوویەوەو پاڵی پێوەنام وەك ئەوەی ڕێگەکەم نیشان بدات وا تێدەگەیشتم ماڵئاواییمان لێدەکات[٣٥١]

بەڕاستی موعجیزەیەکی ئەوەندە گەورەو ناوادارە کە بەقەد تۆزقاڵێك گومان و دوودڵی ناهێڵێت لە ناو دڵەکان داو ئاسوودەیی و دڵنیایی تەواو دەبەخشێ بە دڵ ودەروون و وەك ڕۆژی ڕووناك پێغەمبەرایەتی پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ دەسەلمێنێ .

---

(٣٥٠) حاکم دەڵێت ئەم فەرموودە لە سەر مەرجی موسلیم صەحیحە و بوخاری و موسلیم نەیان هێناوە زەهەبیش لەسەری کۆکە بوخاری لە ( التأريخ الكبير ج٢ ص ١٧٩ لە ئیبن مونکەدیرەوە وە لە سەفینەوە هێناویەتی ئیبن مندەش هێناویەتی وەك لە ( البیدایه والنهایه ) ج٥ ص ٣١٦ ) دا هاتووە تەبەرانیش هێناویەتی وەك لە ( المجمع ج ٩ ص ٣٦٦ ) لە سەفینەوە بەهەمان شێوە هێناویەتی .

(٣٥١) هەیسەمی لە ج٩ ص ٣٦٧ ) دەڵێت کەسەکانی بەزار و تەبەرانی جێ متمانەن

## موعجیزەی (٢٤٢) کۆترەکانی شاری مەککە سێبەریان بۆ پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ کرد :

ئیبن وەهب دەگێڕێتەوە : کە لەو ڕۆژەدا فەتحی مەککەکرا، کۆترەکانی شاری مەککە سێبەریان بۆ پێغەمبەر﴿ﷺ﴾کرد ، پێغەمبەریش﴿ﷺ﴾ دووعای بەرەکەتی بۆکردن[٣٥٢]

## موعجیزەی (٢٤٣) کۆترەکە کە ڕێزی دەگرت لە پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ :

عائیشە دایکی ئیمانداران – خوای لێ ڕازی بێ – دەڵێ : کۆترێکیماڵیمان هەبوو تا پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ لە ماڵەوە بوایە ئەو کۆترە بۆخۆی لە جێی خۆیدا دەسرەوت نەدەهات و نەدەڕۆیشت، بەلام هەرکە پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ لەماڵەوە دەردەچوو، ئەو دەکەوتە هاتوچۆو جموجۆڵ"[٣٥٣]

واتە ئەو کۆترە گوێرایەڵی پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ بووەو هەتا پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ لەماڵەوە بوایە ئەو لە جموجۆڵ کەتووە. بەڕاستی پێویستە ئیمانداران بەبینینی ئەم موعجیزانە زۆر دڵخۆش بن و شانازی بەوەبکەن کە خوای گەورە کردوونی بە ئوممەتی ئەو پێغەمبەر پایەدارە ﴿ﷺ﴾ وەهەوڵ بدەن ئەو موعجیزە گەورانە پێشکەش بکەن بە مرۆڤە سەرگەردانەکان کە گەورەترین دیاری یەو مایەی سەرفرازی دنیاو قیامەتە.

---

(٣٥٢) الشفا ١ / ٣١٣

(٣٥٣) صحيح رواه احمد والبزار وابو يعلى والبيهقى والطبراني

## موعجیزەی(٢٤٤) هیچ عەترو میسكێك بۆنی لە عەرەقی پێغەمبەر(ﷺ) خۆشتر نەبووە :

عەرەقی پێغەمبەر(ﷺ) موعجیزە بووە دووكەس كەزۆر نزیكی پێغەمبەری خوابوون ، یەكێكییان عائیشەی خێزانیەتی – خوای لێ رازی بێت – دەڵێ { كان عرق رسول الله(ﷺ)في وجهة مثل الؤ لؤ اطيب من مسك الاصفر . واتە : شێوەی ئارەق بەروخساری پێغەمبەر(ﷺ) وەك مرواری وابووە ئەبریسكایەوەو بۆنەكەشی لە میسكی {أصفر} خۆشتربوو ، خۆشترین بۆن بۆنی میسكەو لە ناو جۆرەكانی میسكیشدا خۆشترینیان {أصفر}ە هەروەها ئەنەسی كوڕی مالیك – خوا لێ ڕازی بێ- دووەم كەسیانە كە نزیك بە پێغەمبەر(ﷺ) بووەو دەوری دەساڵ خزمەتكاری بووەو دەڵێ :

{ما شممت عنبرا ولا مسكا اطيب من ريح رسول الله(ﷺ)} [٣٥٤]

واتە: هیچ عەترو میسكێك بۆنی لە عەرەقی پێغەمبەری خوا خۆشترنەبووە كاتێكیش تەوقەی لەگەڵ كەسێكدا بكردبایە بۆنی دەستی ئەوكەسەش خۆش دەبوو.

## موعجیزەی (٢٤٥) نووری رووخساری پیرۆزی پێغەمبەر(ﷺ) دەدرەوشایەوەو ڕووناكی دەبەخشی :

عائیشە – رەزای خوای لێبێت – دەڵێ { استمرة ابرة من حفصة بنت رواحة فطلبتها فلم اقدر عليها}

---

[٣٥٤] صحيح رواه الشيخان

واته :داوای دەرزییەکم لە حفصەکرد،دەرزی درووومان بۆ دوورینەوەی هەندێ جلو بەرگی پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ پاشان لێم ونبوو گەرام بۆم نەدۆزاریەوە {فدخل رسول الله ﴿ﷺ﴾ { فتبینة الابرة بشعاع وجه} واته کاتێ پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ خۆی کرد بە ژووردا دەڵێ : یەکسەر دەرزیەکەم دۆزیەوە بەهۆی ڕووناکی و نووری ڕوخساری پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ (٢٥٥)

## موعجیزەی (٢٤٦) گریانی بنە دارێك لە تاو دوورکەوتنەوەی پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ لێیەوە :

بێتاقەتی ئەو بنە دارە وشکەی کە لە مزگەوتەکەی پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ دابوو لەتاو ئەو جیابونەوە کاتی یەی لە پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ دەستی کرد بە ناڵەو گریان لەبەردەم کۆمەڵێکی زۆر لە هاوەڵاندا،مزگەوتەکەی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ لە مەدینە دا لە سەر چەند بنەدارێکی ووشکی دارخورما سەری گیرابوو، جا هەرکات پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ بیویستایە وتاریان بۆ بدات ، پاڵی بەیەکێكێ لەو بنە دارانەوە دەدا ،بەڵام کاتێ کە داونگەیان بۆ دروست کردو ووتاری لەسەر خوێندەوە ، دەنگێکی وەك دەنگی وشتری ئاوس لەو بنە دارە بیسترا کەدە ینالآندو دەگریا لەم گریانەشیدا بەردەوام بوو هەتا پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ تەشریفی هات و دەستی خستە سەری و قسەی لەگەڵ کردوو دڵی دایەوە،ئینجا بنەدارەکە بێدەنگ بوو،ئەم موعجیزە گەورەیە و بە ناو بانگە لە چەند ڕێگایەکی جۆراوجۆرەوە باس کراوە،ئەوهاوەڵە بەڕێزانەی کە ئەم موعجیزەیان گێڕاوەتەوە بریتین لە ( ئەنەسی کوڕی مالیك ، جابیری کوڕی عەبدوللاّ ، عەبدوللاّکوڕی عومەر ، عەبدوللاّی کوڕی عەباس ، سەهلی کوڕی سەعد ، ئەبو سەعیدی خودری ، ئوبەی کوڕی کەعب ، بوڕەیدە ، ئوم سەلەمەی دایکی بڕواداران – خوای گەورە لە

---

(٢٥٥) رواه ابن عساكر فی الدلائل ودیلمی فی مسند الفردوس وفی ( جامع الكبیر )

هەموویان رازی بێ -) ئیمامی بوخاری وموسلیم جگەلە وانیش لە خاوەنی کتێبە صەحیحەکانی فەرمووده ئەم موعجیزه گەورەو ناوداره یان ڕیوایەت کردووه ( جابیر ) – خوای لێ ڕازی بێ – دەڵێ : کاتێك پێغەمبەر(ﷺ) ووتاری بخوێندبایەوه پاڵی بەیەکێك لەو بنەدارانەوه دەدا کە بنمیچی مزگەوتەکەیان لەسەر دانرابووو ، کاتێك کە داونگەکەیان بۆ دروست کرد و پێغەمبەر(ﷺ) بۆ ووتار خوێندنەوەرۆیشتە سەری دەنگێکی وەك دەنگی وشتری ئاوسمان لەو بنەداره بیست ، هەتا پێغەمبەر(ﷺ) تەشریفی هات و دەستی لەسەر دانا ، ئینجا بێدەنگ بوو[٣٥٦]

ئەنەس دەڵێ بەڕادەیەکی وابوو کە مزگەوتەکە لەبەر ناڵە ناڵی ئەو بنە داره ، کەوتە لە رینەوه[٣٥٧]

سەهلی کوڕی سەعد یش دەڵێ :خەڵکەکەش کە ئەم گریانەو بێتاقەتیەی بنەدارکەیان بینی و بیست زۆر گریان[٣٥٨]ئوبەی کوڕی کەعبیش دەڵێ : ئەوەندە گریا تالەت وپەت بوو[٣٥٩]

یەکێکی تریش شتێکی زیاتر دەگێڕێتەوه دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی:( إن هذا بكى لما فقد من الذكر )[٣٦٠]واتە: ئەوه لەبەرئەو زیکره گریا کە لەدەستی چووو،یەکێکی کەش دەگێڕێتەوه دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی:( والذى نفس بيده لولم ألتزمه لم يزل هكذا الى يوم القيامه )[٣٦١]

---

(٣٥٦) صحيح رواه البخاري والترمذى وابن ماجه واحمد والدارمي

(٣٥٧) أخرجه الضياء فى المختارة ٤/ ٢٥٧ ورواه احمد والدارمي

(٣٥٨) ا خرجه ابن سعد فى الطبقات الكبرى ١ / ٢٥٠ وقد عزى الخفاجى ٣ : ٦٢/ رواية الى الشيخين

(٣٥٩) صحيح رواه ابن ماجه والضياء فى المختارة ٢٩٢/٣ والشافعي و احمد و الدارمي

(٣٦٠) صحيح رواه البخارى واحمد وابن ابى شيبة

(٣٦١) رواه الدرامي عن أنس بن مالك وفي رواية ابن عباس ( فاتاه فاحتضنه فسكت قال ولو لم احتضنه نحن الى يوم القيامة ) قال العلامة احمد شاكر فى تحقيق المسند اسناده صحيح

واتە : بەوکەسەی کە گیانی منی بەدەستە ئەگەر باوەشم پێدا نەکردبایە و دڵم نەدایەتەوە تا ڕۆژی قیامەت ئاوا دەگریا.

بورەید دەڵێت : کاتێ بنەدارەکە گریا ، پێغەمبەر﴿ﷺ﴾دەستی موبارەك وپیرۆزی لەسەر داناو فەرمووی{إن شئت أردك إلى االحائط الذی کنت فیه ،ینبت لك عروقك و یکمل خلقك ویجد دلك خوص وثمرة ، وإن شئت أغرسك الى الجنة فیأکل أولیاالله من ثمرك} واتە :ئەگەر دەتەوێ دەتنێرمە وە بۆ ئەوە باخەی تیایدا بویت، بەچەشنێك کەرەگەکانت بڕوێنەوەو بە تەواوای درووست بکرینەوە ولق وپەل و پەرەکەشت نوێ ببنەوە ،ئەگەر دەشتەوێ لە بەهەشتدا دەتنێژم تاکو ئەولیاکانی خوا لەبەروبوومت بخۆن ، ئینجا پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ گوێی بۆ بنەدارەکە ڕاگرت تاکو بزانێ چی دەڵێت،ئەویش لەوەڵامدا وتی:{بل تغرسني في الجنة فیأکل مني أولیاء الله وأکون في مکان لاأبلي فیه} واتە :بەڵکو دەمەوێت لە بەهەشتدا بمنێژیت ،تاکو ئەولیاکانی خوا لەبەرەوبوومم بخۆن و لە جێگایەکدا بم هەرگیز دانەرزێم هەموو ئەوانەی کەڵێی نزیك بوون گوێیان لەم وەڵامە بوو، پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ فەرمووی{ قد فعلت} واتە جێ بەجێم کرد ، پاشان فەرمووی{ إختار دار البقاء على دار الفناء} [٣٦٢] واتە خانەی هەمیشەیی بەسەر خانەی فانی دنیاد هەڵبژارد .ئەبوو ئیسحاقی ئیسفرایینی کە یەکێکە لە پێشەوایانی (زانستی کەلام )ووتویەتی پێغەمبەر﴿ﷺ﴾خۆی ئەڕۆیشتووە بۆ لای بنەدارەکە،بەڵکو بانگی کرد،ئەویش ڕێگای بڕی و هاتە خزمەتی و پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ باوەشی پێداکرد،ئینجا فەرمانی پێ دا بگەڕێتەوە بۆ جێگای خۆی ئەویش گەڕایەوە [٣٦٣] بەڕاستی ئەو موعجیزەیە ئەوەندە گەورەو ناوداره کەوەك ڕۆژی ڕووناك پێغەمبەرایەتی پێغەمبەری ئیسلام دەسەلمێنێ و ئارامی و دڵنیایی تەواو دەبەخشێ بە دڵ و دەروون .

---

(٣٦٢) رواه ابن ماجه والشافعي واحمد والدارمي الفتح الرباني احمد عبدالرحمن البنا ٢٢ /٤٩

(٣٦٣) شفا ١/٣٠٤

## لەبەرهەمەکانی موعجیزەکان :-

**یەکەم :** بۆ ئەوەی بڕوای بڕواداران زیاد بکا .

**دووەم :** یارمەتی دان و سەرخستنی پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ وەبەرگری لێ کردنی .

**سێ یەم :** بۆ ئەوەی هەموو خەڵك ئەوەبزانێ کە موحەممەد﴿ﷺ﴾ پێغەمبەری خوایە بەهەقو ڕاستی .

**چوارەم :** وە بۆ بانگ کردنی غەیرە موسڵمانان تا بڕوا بێنن بە پێغەمبەرایەتی پێغەمبەرمان ﴿ﷺ﴾ ئەوەش بۆ وەڵامدانەوە فەرموودەی خوای گەورە کە لە قورئانە پیرۆزەکەیدا فەرمویەتی : {إنا أرسلناك شاهداً ومبشراً ونذيراً * لتؤ منوا بالله ورسوله وتعزرو وتوقره وتسبحوه بكرة وأصيلا} الفتح ٨- ٩

واتە : بەڕاستی ئەی موحەممەد ﴿ﷺ﴾ تۆمان ناردووە بە شایەت و مژدەدەرو ترسێنەر بۆ ئەوەی باوەڕ بە خواو پێغەمبەرەکەی بێنن و پشتیوانی لێبکەن و ڕێزی لێ بگرن وە تەسبیحاتی خوا بکەن بە بەیانیان و ئێواران دا .

## موعجیزەی (٢٤٧)شایەتی دانی درەختێك لەسەر ڕاست گۆیی پێغەمبەر﴿ﷺ﴾:

زانای گەورەو ناودار قازی عەیاز لە کتێبی (الشفا) دا بەسەنەدێکی صەحیحەوە ، لە عبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە – خوایان لێ ڕازی بێ – دەگێڕێتەوە کە : کە لە سەفەرێکدا لە خزمەتی پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ دابووین پیاوێکی دەشتەکی لێی نزیك بووەوە پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ پێی فەرموو: (أين تريد ) پیاوەکە ووتی: بۆلای خێزان و منداڵم ،

پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ فەرمووی : هل لك إلى خير ؟ واتـە : حەزدەکـەی خێرێکت دەست بکـەوێت ؟ ئەویش ووتی : کام خێر؟ پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ فەرمووی : تشهد أن لاإلـه إلا الله وحـده لاشـريك لـه و أن محمـداً عبـده ورسـوله :واتـە : شـایە تمان بهێنیت کـە تـەنها خـوا گـەورە خوایـە وهاوبەشی نی یەو ، موحەممەدیش بەندەو نێردراوی ئەوە ،، پیاوەکە وتـی : جـا ئایـا کـێ شایەتە لەسەر ئەوەی کە تۆ دەیلێیت ؟ پێغەمبـەر﴿ﷺ﴾ فـەرمووی: هـذا الشـجرة السـمرة : واتە ئەو درەختی سەموورەیە، درەختەکەش لە لێواری شیوەکە دابوو، ئینجـا درەختەکـە ڕێگـای بڕی وهاتە بەردەستی پێغەمبەر﴿ﷺ﴾، پێغەمبەر﴿ﷺ﴾سێ جار داوای لـێ کـرد شـایەتی بدات،

درەختەکەش بەو جۆرەی کە پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ فەرمووی : شایەتی دا ،ئینجا ڕۆیشتەوە بۆ جێی خۆی [٣٦٤] هەروەها لەڕێی: ئیبن صاحیبی ئەسلەمی یەوە بەنەقڵێکی صەحیح و ڕاست لە بورەیدەوە دەگێڕنەوە کە دەڵێت : دەشتەکی یەك داوا ی نیشانەی لە پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ کرد پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ پێی فەرموو : ( قل لتلك الشجره رسول الله ﴿ﷺ﴾ يدعوك : واتە بەو درەختە بڵێ پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ بانگت دەکات کە پێی وت ، درەختەکە بەلای ڕاست وچەپ و بەردەم وپشتەوە ی خۆێ داتەکانی داو ڕەگەکانی قرتـاو کەوتە ڕێ ڕەگەکانی بەدوای خۆیدا کێش کرد تـا هاتە بەردەمی پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ ڕاوەستاو وتی : السلام و عليك يارسول الله : پیاوە دەشتەکی یەکە ووتی : فەرمانی پێ بدە بگەڕێتەوە شوێنی خۆی ، کە فەرمانی پێ دا ، گەڕایەوە و ڕەگەکانی شۆڕکردنەوە بۆ نـاو زەوی و لە جێی خۆیدا ڕاوەستاو جێگیر بووەوە، ئینجا پیاوە دەشتەکیەکە بە پێغەمبەری﴿ﷺ﴾ وت: ڕوخسەتم بـدە سوژدەت بۆ ببەم ، پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ فەرمووی: ئەگەر فەرمانم بە سوژدە بردنی کەسێك

---

(٣٦٤) صحيح رواه بويعلى بسند صحيح والبزار والطبراني وابن حبان في صحيحيه

بۆکەسێکی تر بدابایە ، فەرمانم بەژن دەدا سوژدە بۆ مێردەکەی ببات ، بەلاَم نابێ هیچ کەسێك سوژدە بۆ هیچ کەسێکی کە ببات دەبێ تەنها بەس بۆ خوای گەورە سوژدە دەبێ ببرێ : دەشتەکیەکە وتی : ڕێم بدە هەردوو دەست و هەردوو قاچت ماچ بکەم ، ئەویش ڕێی پێ دا[٣٦٥]

## موعجیزەی (٢٤٨) جیبریل – سەلامی خوای لەسەر بێ – موعجیزەیەك پیشانی پێغەمبەر (ﷺ) دەدات :

ئیبن ماجە و دارمی و بەیهەقی لەئەنەسی کوڕی مالیك و ئیمامی عەلی و بەزار و بەیهەقیش لە ئیمامی عومەرەوە –خوای گەورە لەهەموویان رازی بێ- دەگێڕنەوە: سێ کەس لە هاوەڵەکانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویانە : پێغەمبەر(ﷺ) لەوەی کە کافران بڕوایان پێ نەکردووە بەرپەرچیان دەدایەوە زۆر خەفەتبارو دڵگران بوو ،لەبەرئەوە لە خوا پاڕایەوە و فەرمووی : {اللهم أرنى أية لاأبالى من كذبنى بعدها}واتە: خوایە نیشانەیەکی وەهام پیشان بدە کە ئیتر گوێ بە هیچ کەسێك نەدەم بە درۆم بخاتەوە لە ریوایوتەکەی ئەنەسدا دەڵێت : جبریل- سەلامی خوای لەسەر بێ- کە پێغەمبەری(ﷺ) بەخەفەتباری بینی ، وتی : حەز دەکەیت نیشانەیەکت پیشان بدەم ؟پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: بەڵێ:ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) بۆ درەختێکی ڕوانی کە لە پشتی شیوەکە بوو جیبریل فەرمووی : ئەو درەختە بانگ بکە کە بانگی کرد درەختەکە کەوتەڕێ و هاتە بەردەمی پێغەمبەر(ﷺ)جیبریل وتی:فەرمان بدە بچێتەوە شوێنی خۆی ،کە پێغەمبەر(ﷺ)فەرمانی پێ دا،گەڕایەوە بۆ جێگای خۆی[٣٦٦]

---

(٣٦٥) اورده الهيثمى في المجمع (١٠/٩) وليس فيه ذكر السجود ، وقال الخفاجى : رواه البزار مسندا ، نسيم الرياض فى الشرح الشفا للقاضي عياض٣ /٤٩

(٣٦٦) حيدث حسن رواه البزار وابو يعلى والبيهقي

# موعجیزەی (٢٤٩) دارو بەردەکان داواکاری یەکەی پێغەمبەر (ﷺ) جێبەجێ دەکەن:

ئوسامەی کوڕی زەید - خوا یان لێ رازی بێ - کە یەکێکە لە فەرماندەی سوپاکانی پێغەمبەر (ﷺ) دەگێڕێتەوە و دەڵێ : لەسەفەرێك دا لەگەڵ پێغەمبەری خوادا بوین (ﷺ) جێگایەکی وا چۆڵیش نەبوو کە لە کەسەوە دیار نەبێت و بۆ ئەوە دەست بدات کە بکرێت بە شوێنی دەست بە ئاو گەیاندن ، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: { هل ترى من نخل أو حجارة} واتە : هیچ دارخورماو بەردەێك دەبینیت؟ وتم : بەڵێ چەند دارخورمایەك دەبینم لەیەکەوە نزیکن فەرمووی : {إنطلق قل لهن : أن رسول الله (ﷺ) يأمركن تأتين لمخرج رسول الله وقل للحجارة مثل ذلك} واتە: برۆ پێیان بڵێ : پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمانتان پێ دەدات کەبڕۆن بۆئەو جێگایەی دەستی تێدا بە ئاو دەگەیەنێت ، بەبەردەکانیش هەروەها بڵێ، منیش ئەوەم پێ ووتن ،بەو خوایەی پێغەمبەری (ﷺ) بەهەق ڕەوانەکردووە ، بەچاوی خۆم بینیم کە دارخورماکان لە یەکتر ی نزیك بوونەوە هەتا کۆبوونەوەو بەردەکانیش یەك لەسەر یەك کەڵەکە بوون لە پشتی دارخورماکانەوە ، کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) گەڕایەوە فەرمووی: {قل لهن يفترقن } واتە: پێیان بڵێ : لەیەك جیا ببنەوە، بەو خوایەی گیانی منی بەدەستە بە چاوی خۆم دەمبینی درەخت و بەردەکان بڵاوەیان کردو هەریەکیان ڕۆیشتەوە بۆ جێگای خۆی [٣٦٧] بەڕاستی موعجیزەیەکی گەورەو ناوازە هەزاران درودوبۆ گیانی پاکی ئەو پێغەمبەرە پایە دارە (ﷺ) .

---

(٣٦٧) حديث حسن : رواه احمد باسنادين والطبراني بنحويه واحد اسناد احمد رجاله رجال صحيح

## موعجیزەی (٢٥٠) درەختێك ڕوخسەت وەردەگرێت لە پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ تا سەلامی لێ بکات :

یەعلای کوڕی سەییابە دەگێڕێتەوە کە جارێکیان درەختی ( تەلح ) یان ( سەمورە ) بوو هات و یەك جار بە دەوری پێغەمبەر﴿ﷺ﴾گەڕاو پاشن ڕۆیشتەوە بۆ جێگاکەی خۆی ، پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ فەمووی : { إنها استأذنت أن تسلم علي } واتە : ئەم درەختە ڕوخسەتی وەرگت بێت سڵاوم لێ بکات[٣٦٨]

## موعجیزەی (٢٥١) درەختێك هەواڵی دا بەپێغەمبەر﴿ﷺ﴾ کەجنۆکەکان دەیانەوێت بێنە خزمەتی :

بوخاری و موسلم لە ئیبن مەسعودەوە دەگێڕنەوە ، دەڵێ : ئەو شەوەی کە جنۆکەکان هاتن گوێ یان لە پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ ڕاگرت ، درەختێك هەواڵی بە پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ دا کە جنۆکەکان دەیانەوێت بێنە خزمەتی ئەوەش لەو شەوەدا بوو کە جنۆکەکانی {نوصە یبین } لە { بطن نخلة } دا ناوی جێگەیەکە لە باکوری خۆرئاوای مەککە ڕۆژە ڕێ یەك لێیەوە دوورە، هاتنە خزمەتی پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ تاکو موسڵمان ببن ، جا درەختێك بوو هات هەواڵی هاتنی ئەو جنۆکانەی بە پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ ڕاگەیاند ، موجاهید لە ئیبن مەسعودەوە لە بارەی ئەم فەرموودەوە دەگێڕێتەوە و دەڵێت : جنۆکەکان عەرزی پێغەمبەریان ﴿ﷺ﴾ کرد : کێ شایەتیت بۆ دەدات ؟ لەسەرپێغەمبەرایەتی، پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ فەمووی ئەم درەختە ئینجا بە درەختەکەی فەرموو: درەختەکە وەرە ئەویش ڕەگەکانی لەگەڵ خۆیدا

---

(٣٦٨) صحيح رواه احمد والبيهقي والطبراني

کێش کردو دەنگە دەنگێکیی وەك دەنگی چەکی لیٚ دەهات و هاتە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ (٣٦٩)

بەڕاستی جێی سەرسوڕمانە کە بەدبەختانی دوور لە دین ئەم هەموو بەڵگە ڕون و ئاشکرایانە دەبینن کەچی هانیان نادات بۆ ئیمان هێنان بەرەو هەڵدێری گومرایی هەڵدەخلیسکێن و ڕێگای ڕاست ناگرنە بەر.

## موعجیزەی ( ٢٥٢ ) مل کەچ بوونی دار و درەخت بۆ پێغەمبەر﴿ﷺ﴾

عبادەی کوڕی وەلیدی کوڕی عبادەی کوڕی صامت – خوا لێی ڕازی بیٚ – دەڵێ : من و باوکم ڕۆیشتن بە دوای زانستدا دەگەڕاین لەناو تیرەی {انصار} دا بە ر لەوەی لەناو بچن یەکەم گەس توشمان هات{ أبو الیسر} ی هاوەڵی پێغەمبەربوو﴿ﷺ﴾ غولامێکی خۆی لەگەڵ بوو دەستەیەك کاغەزی پێچراوەی پێبوو{أبو الیسر} بردەیەك و معافری یەکی لەبەردابوو ، غولامەکەشی هەر بردەیەك و معافری یەکی لەبەردابوو ، باوکم پێی ووت : مامە شوێنەواری تومەبوون لەناوچاوتان بەدی دەکەم وتی : بەڵێ قەرزێکم هەبوو لەسەر فلانی کوڕی فلانی لە تیرەی حەرام ، چووم بۆلای منداڵەکانی سەلامم لێکرد ووتم فلان لەوییە ووتیان : نەخێر کوڕێکی منداڵی توندو تۆڵی هەبوو هات بۆلام و پێم ووت : باوکت لەکوێیە ؟ وتی : گوێی لەدەنگی تۆبوو خۆی کرد بە ناو چرپایەو پەردەکوللەکەی دایکمدا ، بانگم کرد: وەرە دەرەوە زانیم وای لە کوێدا هاتە دەرەوەو ووتم بۆچی خۆت لیٚ شاردەوە ووتی: سوێند بە

---

(٣٦٩) صحیح رواه بخاري و مسلم

خوا قسەت بۆ دەکەم و درۆت لەگەڵ ناکەم ، سوێند بە خوا لەوە ترسام قسەت بۆ بکەم و دۆرت لەگەڵ بکەم ، بەڵێنت پێ بدەم و بەڵێنەکەم نەبەمەسەر ، تۆ هاوڕێی پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ بووی سوێند بەخوا منیش هەژارم وتم توخوا ؟ وتی: بەخوا وتم ، توخوا؟ وتی بەخوا ؟ وتم توخوا ؟ وتی بەخوا دەڵێ قەرزنامەکەم هێناو بەدەستی خۆم سڕیەوە ، وتم : ئەگەربووت بمدەرەوە ، ئەگەر نەتبوو ئازادبە ، شایەتی دەدەم بینایی ئەم دووچاوەم بینی هەردوو پە نجەی دانا لەسەر چاوانی هەردووگوێم بیستی، دڵم وەریگرت ئاماژەی گرد بەبەندی دڵی پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ کەدەیفەرموو : هەرکەسێك مۆڵەتی هەژارێك بدات یان هەندێ لە قەرزەکەی دا شکێنێ خوا دەیخاتە ژێر سێبەری خۆی دەڵێ : پێم ووت : ئەی مامە ئەگەر بوردەی خزمەتکارت بۆ خۆت هەڵبگرتایە بۆ خۆت و بوردەکەی خۆتت بدابایە بەو ، ئەوکاتە تۆیش جلەکانت یەکرِنگ دەبوو، ئەویش جلەکانی یەکرەنگ دەبوو ؟ دەستی هێنا بەسەرمداو ووتی : ئەی خوایە فەرو پیرۆزی کەیت ، ئەی برازام بەبینایی ئەم دووچاوەم بەبیستنی ئەم دوو گوێیەم ، ئەم دڵە یشم ئاماژەی کرد بۆ بەندی دڵی وەریگرتووە لە پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ کە دەیفەرموو: خۆراکیان بدەنێ لەوەی خۆتان دەیخۆن و پۆشاکیان بۆ بکەن لەوەی خۆتان دەیپۆشن ئەگەر لە خۆشیەکانی دنیای بدەمێ لام ئاسانترە لەوەی لە چاکەکانی من بەرێ لەڕۆژی قیامەت، پاش ئەوەی ڕۆیشتین هەتا هاتینەلای جابری کوڕی عەبدوڵلا لەمزگەوتەکەیدا نوێژی دەکرد تەنهایەك پارچە جلی لەبەردابوو ئاڵاندبووی لە خۆیەوە هەنگاوم هەڵگرت بەسەر خەڵکەکەدا ، تا گەیشتمە لای ئەو ، دانیشتم لە نیوان ئەو قیبلەدا وتم خوا رەحمت پێ بکا ، بەیەك پارچە پۆشاکەوە نوێژدەکەیت و عەباکەیشت وا لە پاڵتا؟ ئاماژەی کرد بەدەستی بەرەو سینەم و پە نجەکانیشی بڵاوە پێکرد و خواری کردنەوە فەرمووی: ویستم گەوجێکی وەك تۆ بێتە لام و بمبینێت بزانێ من چۆن دەکەم وئەویش وەها بکات ، پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ هاتەلامان و ئالەم مزگەوتەدا لقێ دار خورمای {أبن خطاب}

بەدەستەوە بوو لە قیبلەی مزگەوتەكەدا بەڵغەمێكی دی بەسەری دارخورماكە كراندی، ئەمجا ڕووی تێكردین و فەرمووی: كێتان حەزدەكات خوا ڕووی لێ وەربگێڕێت ؟ دەڵێ : ڕاچڵەكاین دیسانەوە فەرمووی : كێتان حەز دەكات خوا ڕووی لێ وەربگێڕێت ؟دەڵێ ڕاچڵەكاین ؟ دیسانەوە فەرمووی : كێتان حەز دەكات خوا ڕووی لێ وەربگێڕێت ؟ وتمان كەسمان حەز ناكەین ئەی پێغەمبەری خوا فەرمووی: یەكێ لە ئێوە هەركات هەستا نوێژ بكات ئەوە بەڕاستی خوای بەرزو بڵند لەبەردەمیدایە ، باهیچ كەس لەبەردەمیدا و بەلای ڕاسیتدا تف ڕۆنەكات ، بەلای چەپیداو بەژێر پێی چەپدا تف ڕۆبكات، ئەگەر شتێك پەخەی پێگرتوو نەیتوانی وەها بكات بە جلەكانی بەم شێوەیە لێ بكات ئەمجا هەندێ لەجلەكانی پێچایەوە بەسەر هەندێكی تریدا پاشان فەرمووی : گولاوم بۆ بهێنن گەنجێكی ئەو گەڕەكە پەلاماری داو بە پەلە خۆی گەیاندەماڵەوەیان ، عەترێكی هێنا لەسەر لە پی دەستی پێغەمبەر(ﷺ) وەریگرت و خستی یە سەر لقی دار خورماكەو سووی بە شوێنەواری بەڵغەمەكەدا، جابر دەڵێ: لە وێوە یەكە بونی خۆشتان بردۆتە ناو مزگەوتەكانتان ڕۆیشتین لە خزمەتی پێغەمبەردا(ﷺ) لە جەنگی {بطن بواط} دا ، كەبەدوای {مجدی كوڕی عمروی الجهنی} دا دەچوو، پێنج وشەش وحەوت كەسمان بەنۆرە سواری یەك ووشتر دەبوین ، سەرە گەڕایەوە سەر پیاوێكی ، {أنصار} ی بۆسواری وشترێكی خۆی پیخی داو سواری بوو ، هەڵیسان، وشترەكە هەندێ هەلوێستەی كرد پێی ووت {شأ} واتە: هەچەلەعنەتی خوات لێ بێت ، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئەو كێ بوو لەعنەتی كرد لەو وشترەكەی؟وتی : من بووم ئەی پێغەمبەری خوا م فەرمووی : دابەزەو لەگەڵ لەعنەت لێكراودا هاوڕێمان مەبە ، دووعای شەڕ مەكەن لە خۆتان و منداڵتان و ماڵتان ، نەوەكو داواكەتان یەكبگرێ لەگەڵ ئەو ساتەدا داوای بەخشین تیادا وەربگێرێت و لەئێوەش وەربیگرێت ، ڕۆیشتین لە خزمەتی پێغەمبەر(ﷺ) هەتاكاتی ئێوارە وەختێك نزیك بووینەوە لە ئاوێك لە

ئاوەکانی عەرەبی دەشت پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: کام پیاو پێشمان دەکەوێ بۆئەوەی حەوزەکە سواق بداو کون بڕی بکات خویشی ئاو بخواتەوەو ئاویش بدات بە ئێمە، جابر دەڵێ: هەستام ووتم: ئەمە پیاوێکە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: کام پیاو لەگەڵ جابر دەبێت؟ {جباری کوڕی صخر} هەستا، ڕۆیشتین بۆ لای بیرەکە دولکەیی دوو دولکە ئاومان هەڵگۆست و کردمانە حەوزەکە، لە پاشدا قوڕمان دا، ئەمجا ئاومان تێکرد هەتا پڕمان کرد یەکەم کەس گەیشتە لامان پێغەمبەر(ﷺ) بوو فەرمووی: ڕێگام ئەدەن؟ وتمان: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا، دەستەجڵەوی وشترەکەی شل کرد تا ئاوی خواردەوە، ئەمجا دەستی لێ توند کرد، وشترەکە لنگی بڵاوکردەوە و میزی کرد، ئەمجا گێڕایەوە دواوەو پیخی دا، دوای ئەوە پێغەمبەر(ﷺ) هاتە سەر حەوزەکەو دەست نوێژی لێگرت، دوای ئەوە منیش هەستام دەست نوێژم گرت لە شوێنی دەست نوێژەکەی پێغەمبەر(ﷺ) جباری کوڕی صخریش ڕۆیشت سەرئاوی هەبوو، پێغەمبەر(ﷺ) هەستا نوێژبکات منیش بوردەکەیم لەبەردابوو ویستم چمکەکانی ڕاست وچەپ بکەم نەگەیشتەوە بوردەکە ڕیشوی هەبوو وەری گێڕامە لای ڕاستی خۆی، دوایی جباری کوڕی صخریش هات دەست نوێژی گرت و لای چەپی پێغەمبەر (ﷺ) وەستا ئەمجا ملم بۆ کورت کردەوە و بەملم کرتم بۆ ئەوەی نەکەوێ ئەمجا هاتم لەلای چەپی پێغەمبەر(ﷺ) دەستی هەردووکمانی گرت و پاڵینایین هەتا لەدوای خۆی یەوە ڕایگرتین و پێغەمبەر(ﷺ)چاوی تێبڕیووم من هەستم پێنە دەکرد، تا دواتر تێگەیشتم مەبەستی چی یە؟ بەدەستی ئاماژەی کرد، وەك ئەوەی بڵێ: ناوەڕاستت ببەستە لە کاتێکدا پێغەمبەر(ﷺ) لێ بوویەوە فەرمووی :ئەی جابر وتم: گوێڕایەڵتم ئەی پێغەمبەری خوا فەرمووی :ئەگەر بووردەکەت گەورە بوو ڕاست وچەپەکەی بهێنەرەوە سەریەك ،ئەگەر تەسك بوو لەسەر کەلەکەت ببیەستەڕۆیشتین لە خزمەتی پێغەمبەر(ﷺ) خواردنی ڕۆژانەی هەریەك لە ئێمە دەنکە خورمایەك بوو، دەیمژی و لە پاشا لەناو

جلەکانیدا گرێی ئەدا ، بەکەوانەکانمان گەڵا دارخورمامان دەومراند دەمان خوارد هەتا شەوێلگەمان بریندار بوو ،سوێند دەخۆم ڕۆژێ یەکێکیان لە بیر چو بوو، بردمان بۆلای خورما بەدەس هەڵمان دەگرت ، شایەتیمان بۆدا کە خورمای پێنەدراوە، پێیدرا، هەستا و وەریگرت ڕۆیشتین لە خزمەتی پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ هەتا گەیشتینە شیوێکی فراوان ، پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ چوو بۆ پێویستی سەرئاو جەوەنوەیەکئاوم بەدوا دابرد ، پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ تەماشای کرد شتێکی نەدی خۆی پێ بشارێتەوە، دوو درەخت لە کەناری ئەو شیوەدا هەبوون ، پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ ڕۆیشت بۆلای یەکێکیان لقێکی لێگرت و ڕایکێشا و فەرمووی بۆم دانەوە بەفەرمانی خوا ، لقەکە بۆی دانەوی وەك وشتری مەهارکراو کە بەدوای خاوەنەکەی دا دەڕوات ، ئەمجا چوو بۆ لای درەختەکی تر ، لقێکی ئەویشی ڕاکێشا و فەرمووی : بۆم دانەوە بە فەرمانی خوا ، ئەویش دانەوی لەگەڵیا بە هەمان جۆر، هەتا لە ناوەڕاستی هەردووکیاندا گەیاندی بەیەك و فەرمووی : بەیەکەوە بنوسێن لەسەر من بە فەرمانی خوا نوسان بەیەکەوە جابر دەڵێ : من بە پەلە لەو شوێنە دوور کەوتمەوە نەکو پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ هەست بکات بەنزیکی من و دوور بکەوێتەوە دانیشتم خەیاڵم لەگەڵ دەروونی خۆم دەکرد ، لەناکاو سەرێکم هەڵبری پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ بەرەو ڕووی من دەهات و درەختەکانیش لێك جیابوونەوە ، هەریەك لەسەربنکی خۆیان وەستابوون، پێغەمبەرم﴿ﷺ﴾ بینی هەڵویستەیەکی کردو ئاماژەی بەسەری کرد { أبو ئیسماعیلی (راوی ) یە بە سەری خۆی ئاماژەی لای ڕاست و چەپی کرد لە پاشدا بەرەو ڕووم هات ، کاتێ گەیشتە لام فەرمووی : ئەی جابر دیت لە کوێدا وەستا بووم ؟ وتم : بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا ، فەرمووی : بڕۆ بۆ لای ئەو دوو درەختە ، لەهەریەیان لقێکی ببڕەو بیانهێنە تا دەگەیتە شوێن وەستانەکەی من لەوێدا لقێکی بەلای ڕاستتەوەو لێقێکی بەلای چەپتەوە بەربدەوە ، جابر دەڵێ : هەستام بەردێکم هەڵگرت و شکاندم و تیژم کردو بۆم تیژبوو ،

چووم بۆلای هەردووك درەختەکەو لە هەر یەکەیان لقێکم بڕی ، هاتم و بەدوای خۆمدا ڕامدەکێشان هەتا لە شوێن وەستا نەکەی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ وەستام لقێکم بەردایەوە بەلای ڕاستمدا و لقێکیش بەلای چەپدا ، ئەمجا چووم بۆ خزمەتی و پێم ووت : ئەو کارەم ئەنجامدا ئەی پێغەمبەری خوا ئەوە لەبەرچی بو؟ فەرمووی : بەڕاستی من تێپەڕیم بەلای دوو قەبردا سزا دەدران ، حەزم کرد بە تکای من هەندێ سزایان لەسەر هەلگیرێ بەدانانی ئەو لقە تەڕە هەتا بە تەڕی مابن دەڵێ : هاتینە ناو سوپاکە پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ فەرمووی : ئەی جابر هاوارکە بۆ ئاوی دەست نوێژ منیش هاوارم کرد : ئایا ئاوی دەست نوێژ نیە ؟ ئایا ئاوای دەست نوێژ نیە ؟دەڵێ: وتم : ئەی پێغەمبری خوا لەم کاروانەدا یەك تنۆك ئاوم دەست نەکەوتووە پیاوێکی ئەنصاری هەبوو لە چەند کوندەیەکی کۆندا ئاوی بۆ پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ سارد دەکرد ، بەسیپایەکدا لە لقی دارخورما پێکهاتبوو ، جابر دەڵێ : پێمی فەرموو : بڕۆ بۆ لای فلآنی کوڕی فلآنی ئەنصاری تەماشا بکە ئایە کوندەکانی هیچ ئاویان تیادایە ؟ دەڵێ چووم تەماشایانم کرد هیچم تیادا نەدین جگە لە یەك تنۆك ئاو کە لە هەنگلی کوندەیەکیان دابوو ، ئەگەر دامبکردایە نەدەگیشتە دەمی کوندەکە ، هاتم بۆ خزمەتی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ وتم : ئەی پێغەمبەری خوا ئاوم دەست نەکەوت لەو کوندانەدا جگە لە یەك تنۆك لە هەنگلی کونەدەیەکدا ئەگەر ڕۆم بکردایە ووشکەکەی هەلیدەمژی ، فەرمووی : بچۆ ئەو کوندەیەم بۆ بهێنە، بۆم برد کوندەکەی بەدەستەوە گرت و شتێکی دەخوێند من نازانم چی بوو ؟ ئەمجا بەدەستی خۆی گوشاردی دایە دەست من فەرمووی : ئەی جابر بانگی تەشتێك بکە هاوارم کرد : ئەی تەشتی کاروان هەلیان گرت و بۆیان هێنام خستمەبەر دەستی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ دەستی خستە ناو تەشتەکە و بلأوی کردەوە و پەنجەکانی لێك جیا کردەوە و ئەمجا لە بن تەشتەکە دا دایناو فەرمووی : ئەی جابر کوندەکە بگرەو ئاوبکە بەسەر دەستمدا وبڵێ { بسم الله } ئاوم کرد بەسەر دەستیدا و

ووتم : { بسم الله } دیم ئاو هەڵدەقولا لە نێو پەنجەکانی پێغەمبەر(ﷺ) لە پاشدا تەشتەکە بە توندی ئاوی لێ هەڵدەقولاو ئاوەکە سووڕی دەخوارد، هەتا پڕبوو ، ئەمجا فەرمووی : ئەی جابر بانگ بکە کێ پێویستی بە ئاو هەیە دەڵێ :

خەڵك هاتن ئاویان خواردەوە هەتا پاراو بوونەوە وتم : ئایە کەس ماوە پێویستی بە ئاو بێ ؟ پێغەمبەر دەستی دەرهێنا لە تەشتەکە هێشتا پڕبوو خەڵك هاواری برسیەتیان برد بۆ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی : نزیکە خوای گەورە خواردنتان بۆ بنێرێت:هاتینە سەر کەناری دەریا ، دەریاکە شەپۆلێکی دا گیانلبەرێکی فڕیدایە دەر ئاگرمان لەسەر لایەیەکی کردەوە کولاندمان و برژاندمان و خواردمان تا تێربووین جابر دەڵێ : من و فلان و فلان پێنج کەسی ژماردچووینە ناو کالانەی چاویەوەکەس نەییینین تا هاتینە دەر ، پەراسوویەکمان هێناو خوارمان کردەوە گەورەترین پیاوی ئەو کاروانەمان ، بانگ کردو گەورەترین وشتر لە کاروانەکەدا گەورەترین کۆپان واتە : ئەو پیاوەی سواری ئەو وشترو کۆپانە بوو چوو ژێر ئەو پەراسووە سەری دانە دەخست [٣٧٠]

## موعجیزەی (٢٥٣) هەرکە پێغەمبەر(ﷺ) بانگی کرد هێشووە دارخورما کە بەتەکاندان هاتە خزمەتی:

ئیمامی ترمذی لە عەبدوڵلای کوڕی عەباسەوە- خوا لێ یان ڕازی بێ – دەگێڕێتەوە و دەڵێ : پێغەمبەر(ﷺ) بە پیاوێکی دەشتەکی وت : {أرأیت إن دعوت هذا العذق من هذه النخلة أتشهد أني رسول الله} واتە : ئەگەر بەو هێشووە خورمایە بڵێم : وەرە و ئەویش بێت

---

(٣٧٠) پوختەی صحیحی موسلیم بەرگی ٢ لاپەرە ٧٥٤- ٧٦٠

، ئایا شایەتمان دەهێنیت کەمن پێغەمبەری خوام ؟ وتی بەڵێ : پێغەمبەر(ﷺ) بانگی کرد ، هێشووەکەش بەتەکاندان هاتە خزمەتی، ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی : بگەڕێوە ئەویش گەڕایەوە جێی خۆی [٣٧١]

بەڕاستی پێویستە ئیمانداران بەو موعجیزە گەورەو ناودارانەی پێغەمبەر(ﷺ) زۆر دڵخۆش بن و شانازی بکەن بەوەی کەخوای گەورە کردوونی بە ئوممەتی ئەم پێغەمبەرە پایەدارە وەهەوڵ بدەن ئەو موعجیزانە پێشکەش بە مرۆڤە سەرگەردانەکان بکەن کە ئەوەش گەورەترین دیاری یەو مایە سەرفرازی دنیاو دواڕۆژە .

## موعجیزەی (٢٥٤) پێغەمبەر(ﷺ) بەوەنەوزەوە بەرێگادا دەڕۆیشت درەختێك هاتە رێی یەکسەر دەرەختەکە دووکەرت بوو :

ئیمامی ئیبن فەورەك کە زانای هەرە گەورەی چەرخی خۆی بووە و لەبەر ئەوەی کە خاوەنی فەزڵ و ئیجتیهادی تەواوبووە بە شافیعی دووەم ناویان بردووە ئەم پیاوە زاناو خواناسە دەگێڕێتەوەودەڵێ : لە شەوێك لە شەوەکانی غەزای تائیفدا ، پێغەمبەر(ﷺ) بەوەنەوزەوە بەرێگادا دەڕۆیشت درەختێك هاتە رێی ، یەکسەر درەختەکە دووکەرت بوو ، پێغەمبەریش (ﷺ) لە نێوانیانەوە تێپەڕیو تا ئێستاش ئەم درەختە هەربە دوو لەتی ماوەتەوە بەڕاستی موعجیزەیەکی گەورەو ناوادارە [٣٧٢]

---

(٣٧١) صحيح رواه الترمذي وغيره

(٣٧٢) الشفا ١ / ٣٠١ نسيم الرياض ٣ / ٥٧

## موعجیزەی (٢٥٥) پێغەمبەر(ﷺ) لە ئاسمانەوە خواردنی بۆ دەهات:

ئیبن سەعد (ج٧،ص٤٢٨) لە فەرموودەی ئەشعەثی کوڕی شوعبە لە ئەرتەئەی کوڕی مونزیر لە ضە مرەی کوڕی حوبەیب لە خالیدی کوڕی ئەسەدی کوڕی حەبیب لەسەلەمەی کوڕی نوفەیلەوە هێناویەتی دەڵێت /: پرسیارم کرد لە پێغەمبەر(ﷺ) وتم : لەئاسمانەوە خواردنت بۆ هاتووە ؟ فەرمووی : بەڵێ ، وتم : ئایا هیچت لێ زیاد مایەوە ؟ فەرمووی : بەڵێ ، وتم چی لێ هات ؟ فەرمووی : بەرزکرایەوە بۆ ئاسمان ، هەروەها حاکم لە (ج ٤،ص٤٤٧) لەسەلەمەی کوڕی نوفەیلی سکونیەوە کە لە هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) بوو هێناویەتی دەڵێت ئێمە لای پێغەمبەر(ﷺ) بووین کەکەسێك هات و وتی : ئەی پێغەمبەری خوا ئایا لە ئاسمانەوە خواردنت بۆ هاتووە ؟ فەرمووی : {اتیت بطعام مسخنة} خواردنێکی گەرمم بۆ هێنرا وتی : ئایا هیچت لێ زیاد بوو؟ فەرمووی : بەڵێ وتی چی لێ هات ؟ فەرمووی : بەرزکرایەوە بۆ ئاسمان وسروشی بۆ دەهێنام کەمن کەم کەم لە نێوانتاندا دەمێنمەوە تا دەڵێن تاکەی ؟ پاشان بەرەو ڕووی بەهەڵە زانین دەبنەوەو یەکدی لە ناودەبەن ، لەبەردەم ڕۆژی دواییدا مەرگانێکی سەختە دوای ئەوە سالآنی بوومەلەرزە دێن[٣٧٣]

---

[٣٧٣] حاکم دەڵێت ئەم فەرموودە لەسەر مەرجی بوخاری و موسلیم صەحیحەو نەیانهێناوە زەهەبی دەڵێت :هەواڵەکەفەرموودەکە لەغەریبە صەحیحەکانە لە (الاصابە ج٢ ص٦٨ ) دا لەباسی ژیانی سەلەمەی کوری نەوفەیلدا هاتووە

## موعجیزەی (٢٥٦) لە قاپە حەلوایەك سێ سەد كەس تێریان خوارد قاپەکەش هەر پڕبوو هیچی لێ کەم نەبوو بوو :

ئەنەسی کوڕی مالیك –خوا لێی رازی بێ –دەڵێ :پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ ژنی گواستەوە ،دەڵێ: {ئوم سلیم} ی دایکم حەلوای دروست کردو کردیە قازانێکی گەورەی مسەوە و پێی وتم : ئەنەس ئەم حەلوایە ببە بۆ پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ و پێی بڵێ دایکم ئەمەی بۆ ناردوویت و سڵاویشی لێدەکردیو دەیوت : ئەمە بۆ بەڕێزتان لەلایەن ئێمەوە ، شتێکی کەمیشە منیش بردم بۆ خزمەتی پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ پێم وت دایکم سلاوت لێدەکات و دەڵێ:ئەمە بۆ بەڕێزتان لە ئێمەوە ئەی پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ کەمیشە فەرمووی : داینێ پاشان بڕۆ فلأنە کەس و فلأن وفلأن و هەرکەسێکی ترت پێگەیشت بانگیان بکە ناوی چەند پیاوێکی تریش برد دەڵێ : ئەوانەی ناوی بردن و هەرکەسێکی تریش پێم گەیشت بانگم کردن، ڕاوی دەڵێ : پرسیم لە ئەنەس ژمارەیان چوەند کەس بوون ؟ ووتی نزیکەی سێ سەد کەس ، پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ فەرمووی: ئەی ئەنەس قازانەگەورەکە بێنە خەڵکەکە چوونە ژوورەوە تا هەیوانی مزگەوت و ژوورەوەش پڕبوو پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ فەرمووی : ئادەی دەکەس دەکەس ئەڵقە ببەستن باهەرکەسێ لەلای خۆیەوە بخوات ئیتر هەموویان نانیان خوارد هەتا تێربوون کۆمەڵێ دەچوونە ژوورەوەو کۆمەڵێ دەهاتنە دەرەوە هەتا هەموویان تێربوون پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ فەرمووی : ئادەی ئەنەس قازانەکە لابە ئەنەس دەڵێ : قازانەکەم لابرد نەمدەزانی ئەوەکاتەی دامنا زۆر تری تێدا بوو یان ئەوکاتەی هەڵمگرت؟ دەڵێ چەند کەسێکیان لە ماڵی پێغەمبەردا مانەوەو دەستیان کردبە قسە کردن پێغەمبەریش دانیشتبوو ، هاوسەرەکەشی ڕووی کردبوە دیوارەکە ئەو حاڵەیان لەلاگران بوو لە سەر دڵی پێغەمبەر﴿ﷺ﴾، پێغەمبەری خوا﴿ﷺ﴾ سڵاوی لە خێزانەکانی کردو گەڕایەوە هەستیان

کرد لەسەر دڵی قوورس بوو ، ئەنەس دەڵێ : بەخێرایی ڕوویان کردە دەرگاکەو هەموویان چوونە دەرەوە پێغەمبەریش﴿ﷺ﴾ هات و پەردەکەی دادایەوە هاتە ژوورەوە من لە ژوورێك دا دانیشتبووم ، زۆری پێنەچوو تەشریفی هاتە دەرەوە لای من بوو ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە : {یأیهاالذین أمنوا لاتدخلوا بیوت النبي إلا أن ئوذن لکم إلى طعام غیر ناظرین إناه ولکن إذا دعیم فادخلوا فإذا طعمتم فانتشروا ولا مستانسین لحدث إن ذلکم کان ئوذی النبي } پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ چووە دەرەوەو ئایەتەکەی خوێندەوە بۆ خەڵکەکە ئەمە ماناکەیەتی : ئەی گرۆی ئیمانداران مەڕۆنە ماڵەکانی پێغەمبەرەوە﴿ﷺ﴾مەگەر مۆڵەتتان پێ بدرێ بۆنان خواردنێك بێ ئەوەی چاوەڕوانی پێگەیشتنی بن،بەڵام ئەگەر بانگهێشت کران بڕۆنە ژوورەوە ئەگەر نانتان خوارد بڵاوی لێبکەن و بەدیار قسەو باسەوە دامەنیشن ،چونکە ئەو کارەتان ئازاری دڵی پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ دەدات جا شەرمیشتان لێدەکات، بەڵام خواشەرم لەهەق و ڕەوا ناکات ئەگەر داوای کەل و پەلیشتان لە هاوسەرانی پێغەمبەر کرد ئەوە لە پشتی پەردەوە داوا بکەن [٣٧٤]

بەڕاستی بەتەنها ئەو موعجیزەگەورەیە و بەناوبانگە بەسە بۆ کەسانێك کە دوورن لە پەیامی ئەم پێغەمبەرە ﴿ﷺ﴾ بۆ ئەوەی گومان و دوو دڵی لە ناو دڵەکانیان نەمێنێ و بەتەواوی دڵنیابن .

---

[٣٧٤] صحیح رواه‌البخاری النکاح رقم : ٤٨٦٨ ، ٤٨٧٣

## موعجیزەی (٢٥٧) هەر پاروویەکیان هەڵدەگرت لە بنەوە زیادی دەکرد زیاتر لە پاروەکە:

لە عەبدوڕحمانی کوڕی ئەبوبەکرەوە دەڵێ: { أصحاب الصفة } چەند کەسێکی هەژار بوون ، پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ جارێکیان فەرمووی : هەرکەس خواردنی دوانی لا هەیە باسیان بەرێتەوە، هەرکەس چواری لاهەیە با پێنج،شەش بەرێتەوە یان شتێکی لەم جۆرەی فەرموو: ئەبوبەکر هاتەوە بەسێ کەسەوە، پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ ڕۆیشت بەدەکەسەوە، ئەبوبەکر بەسیانەوە ، وتی : ئەو و من و باوکم و دایکم ، نازانم ئایە وتی : خێزانم و خزمەتکارێك لە نێوان ماڵی ئێمەو ماڵی ئەبوبەکردا ، وتی :ئەبوبەکر نانی ئێوارەی خوارد لە خزمەت پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ پاشان لەوێ مایەوە هەتا نوێژی عیشا کرا، دیسان گەڕایەوەو مایەوە تا پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ خەو دایگرت ، هاتەوە دوای ئەوەی شەو ئەوندە لێ ڕۆیی کە خواویستی ، خێزانەکەی پێی وت: چی دوای خستیت لەمیوانەکانت ؟ نانیان نەخوارد تا تۆ بێیتەوە نانیشیان بۆ دانان، بەڵام قسەی خۆیان سەر خست ، عەبدوڕەحمان دەڵێ : من ڕۆیشتم خۆم شاردەوە لە ترسی باوکم بانگی کردم ئەی ڕەزیل ، ئەی نەزان دووعای لێکردم و قسەی پێوتم وتی نان بخۆن عافیەتتان نەبێ {والله} من قەت لەگەڵتان ناخۆم ، عەبدوڕەحمان دەڵێ : سوێندم بەخوا هەر پارویەکمان هەڵدەگرت لە بنەوە زیادی دەکرد زیاتر لە پاروەکە ، دەڵێ: هەتا تێرمان خوارد زیاتر بوو لە جاران ، ئەبوبەکر -خوای لێ ڕازی بێ -تەماشای کرد وەك خۆی مابوو یان زیاتر ، بە خێزانەکەی وت : ئەمەچی یە ئەی خوشکی { بني فراس } ؟ واتە وتی: نەخێر چاووم ڕوون ئێستا سێ قات زیاترە لە جاران ، عەبدوڕەحمان دەڵێ : ئەبوبەکر لێی خواردوو وتی : ئەوە یش لە شەیتانەوە بوو ، مەبەستی سوێندەکەی بوو، لە پاشدا پاروویەکی لێخواردو بردی بۆ پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ شەو تا بەیانی لای ئەو مایەوە ،

دەڵێ : لە نێوان ئێمەو قەومێك پەیمانێك هەبوو ماوەیەکەی تەواو بوو هاتن بۆ مەدینە دوانزە کەسمان لێکردن بە عەریف هەریەکێ لەوانیش چەند کەسێکیان لەگەڵ بوو خوا دەزانێ یەکی چەند کەسیان لەگەڵ بوو ، بەلام پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ بە واندا خواردنەکەی نارد بۆیان هەموویان بەگشتی لێیان خوارد (٣٧٥)

## موعجیزەی (٢٥٨) جگەری مەڕێك بەرەکەت داربێ و بەشی خەڵکێکی زۆر دەکات :

عەبدوڕەحمانی کوڕی ئەبوبەکر – خوا یان لێ ڕازی بێ –دەڵێ:سەدو سی کەس لەگەڵ پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ بووین، فەرمووی: ئایە کەستان خواردنتان پێ یە ؟ پیاوێك مەنێ ،یان نزیکی مەنێ خواردنی پێبوو کرایە هەویر ، دوای ئەوە پیاوێکی موشریکی قژ گژی درێژ هات بڕگەیەك مەڕی دابوو لەبەر، پێغەمبەر﴿ﷺ﴾فەرمووی:فرۆشتنە یان بەخشینە؟ ووتی :نەخێر فرۆشتنە مەڕێکی لێکڕی کرابەمەرەگە ئەمجا پێغەمبەر﴿ﷺ﴾فەرمانی دا جگەرەکەی ببرژێندرێ عەبدوڕەحمان دەڵێ: سوێندم بە خوا ئەو سەدو سی کەسە کەس نەماوە پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ پارچەیەك لەو جگەرەی بۆ لێ نەکاتەوە ئەگەر ئامادەبووایە پێی دەدا ئەگەر لەوێش نەبوایە بۆی هەڵدەگرت دەڵێ:هەر لەو مەڕە دوولەگەن چێشتی درووست کرد هەموو لێمان خوارد و تێر بوین لێشی مایەومو خستمە سەر پشتی وشترەکە (٣٧٦)

---

(٣٧٥) صحیح رواه البخاري مواقیت الصلاه رقم ٥٧٧

( ٣٧٦ ) صحیح اخرجه البخاري / الهبة رقم ٢٤٧٥

## موعجیزەی (٢٥٩) پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ هەشتا کەسی تێر کرد بە پێخۆرێکی زۆر کەم :

موسلیم لە( ج٢، ص ١٧٨) لە ئەنەسەوە- خوای لێ رازی بێ – هێناویەتی دەڵێت : ئەبو تەڵحە بە ئوم سولەیمی وت : دەنگی پێغەمبەرم﴿ﷺ﴾ بیست کە لاواز بوو برسێتیم لێ بەدی کرد ،هیچمان هەیە بۆخواردن تا بانگی بکەم ، وتی : بەڵێ چەند مشتێك گەنمی دەرهێناو دواتر پەڕۆیەکی هێناو پێچایەوەو خستیە ژێر کراسەکەم و دواتر گێڕایەوە، ئینجا ناردمی بۆلای پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ چووم و سەیرمکرد پێغەمبەر﴿ﷺ﴾لەگەڵ خەڵکیدا دانیشتبوو، لە لایان وەستام پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ فەرمووی: ئەبو تەلعە تۆی نارد :وتم : بەڵێ فەرمووی : بۆ خواردنێکە؟ وتم بەڵێ: پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ بەوانەی چواردەوری فەرموو هەستن کەوتنەڕێ و منیش لە پێشیانەوە چووم تا چوومە لای ئەبوو تەلحەو و پێم وت :ئەبوتەلحە وتی :ئەی ئوم سولەیم پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ لەگەڵ هاوەڵانیدا هاتووە هیچمان نیە دەرخواردیان بدەین وتی : خواو پێغەمبەرەکەی باشتر دەزانن ئەبوتەلحە چووتا گەیشتە خزمەتی پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ولەگەڵی هات تا هاتنە ژوورەوە پێغەمبەر﴿ﷺ﴾فەرمووی:{هلمی ماعندك یا ام سلیم}واتە :ئوم سولەیم چیت لایە ئادەی بیهێنە،ئەویش ئەو نانەی هێنا پێغەمبەر﴿ﷺ﴾فەرمانی کرد پێی و ووردی کردو ئوم سولەیم جامێکی ڕۆنی هێناو پاشان پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ هێندەی خوا بیەوێت شتی لەسەر فەرمووو، پاشان فەرمووی:{أذن لعشرة}واتە :دەکەسیان بانگ بکە بۆ ژوورەوە مۆڵەتی دان و هاتن و تێریان خواردوو چوونە دەرەوە،دواتر فەرمووی: {أذن لعشرة}ئەوانیش هاتن و تێریان خواردو چوونە

دەرموەئەمجارەیش فەرمووی: مۆڵەتی دە کەسیان بدە بەو جۆرە هەموویان هاتن و تێریان خوارد هەموویان حەفتا یان هەشتا کەس بوون [٣٧٧]

بەڕاستی موعجیزەیەکی گەورەیە سوپاس بۆخوای گەورە وە درووود بۆ گیانی پاکی پێغەمبەرەکەی (ﷺ).

## موعجیزەی (٢٦٠) نان و خواردنێکی پڕ پیت و بەرەکەت لە ڕۆژی خەندەق دا :

بوخاری لە جابرەوە هێناویەتی و دەڵێت : لە ڕۆژی خەندەق چاڵمان هەڵدەکەند شتێکی ڕەق هاتەبەردەممان ، هاتن بۆلای پێغەمبەر(ﷺ) ووتیان : ئەم شتە ڕەقە لە چاڵەکە دا هاتووەتە ڕێمان ، فەرمووی : { انا نازل } واتە: من دادەبەزم بۆی پاشان هەستاو سکی بەبەردێك بەستبوو سێ ڕۆژ ماینەوە هیچمان نەخوارد پێغەمبەر(ﷺ) پێکەکەی هەڵگرت و لێیدابە توندی گەڕایەوە وتم : ئەی پێغەمبەری خوا مۆڵەتم بدە بۆماڵەوە بەژنەکەم وت: پێغەمبەرم(ﷺ)لەبارێکدا دی کە هی خۆگرتن نەبوو،هیچ خواردن هەیە؟وتی گەنم و بزنم هەیە،بزنەکەم سەربڕی و گەنمەکەم هاڕی وکردمە هەویرو تا گۆشتەکەمان ئامادە کرد دواتر هاتم بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و هەویرەکە ئامادەبوو و گۆشتەکەش لەسەر دوو بەردبوو ، خەریکبوو پێدەگەیشت، وتم سووکە نانێکم ئامادەکردووە ئەی پێغەمبەری خوا خۆت و کەسێك یان دووکەس وەرن فەرمووی : چەندێکە ؟ وتم : ئەوەندەیە فەرمووی :{ کثیر طیب قل لها لاتنزع البرمة والخبز من التنور حتی اتی}واتە: زۆرپاکە، بەژنەکەت بڵێ

[٣٧٧] بوخاریش لە ئەنەسەوە بەو جۆرە هێناویەتی لە (البدایة والنهایة ج ٩ ص ١٠٥ دا هاتووە

گلێنەكەو نانەكە لە تەنوورەكە دەرنەكات تادێم فەرمووی هەستن كۆچەران و پیشتوانان و هاودەمانیان هاتن / كاتێك چوو بۆ لای ژنەكەی وتی: قورپەسەر پێغەمبەر(ﷺ) كۆچەران وو پشتیوانان وهاودەمانی هێناوە وتی: مەگەر پێت وت ؟ وتی:بەڵێ فەرمووی : { ادخلو ولاتضاغطوا} واتە: بچنە ژوورەوە و قەرەباڵغی مەكەن نانەكەی پارچە پارچە دەكردو گۆشتی لەسەر دا دەناو كلێنەو تەنوورەكەی دەخستەكارو دەیدا بە هاوەڵانی و داوتر لایدەبرد، بەو جۆرە وایدەكرد تا هەموو تێر بوون و هەمووی مایەوە، فەرمووی {كلی هذا واهدی فان الناس اصابتهم مجاعة} واتە : بخۆو ببەخشە چونكە خەڵكی تووش برسێتی بون ئەم فەرموودەیە بوخاری هێناویەتی و، هەروەها بەیهەقی لە {الدلائل} لە جابرەوە بە زیاتر هێناویەتی و تیایدا دەڵێت : كە پێغەمبەر(ﷺ) بەبڕی خواردنەكەی زانی بەهەموو موسڵمانانی ووت{قوموا الی جابر} واتە : هەستن بچن بۆلای جابر، جابر دەڵێت : تووشی شەرمێك بووم كە تەنها خوا دەیزانێت ، وتم : لەسەر مشتێك بڕێ گەنم و شتمان بۆ هات ، چووم بۆلای ژنەكەم ووتم : حەیات چوو ، پێغەمبەر(ﷺ) هەموو خەڵكی خەندەقی هێناوە وتی : برسیاری لێ كردیت خواردنەكە چەندە ؟وتم بەڵێ : وتی دەی خواو پێغەمەرەكەی باشتر دەزانن ، دەڵێت: بەومژنەكەم خەفەتێكی زۆری لەسەر لابردم پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی : بزنێك زۆرە قەرەباڵغی مەكەن پێغەمبەر(ﷺ) سەرقاڵی چاككردنی گۆشتەكە بوو دەیدا بەخەڵكەكەتا هەموو تێربوون و پڕتر لەسەرەتا مابویەوە پاشان فەرمووی : {كلی واهدی } واتە : بخۆو بەدیاریش بنێرە ، ئەو ژنەش بەردەوام دەیخواردو ئەومرۆژەش دەیبەخشی ، هەروەها ئیبن شەیبە هێناویەتی لە كۆتاییەكەیدا دەڵێت : پێی وتم ئەوان هەشت سەد كەس بوون (٣٧٨)

---

(٣٧٨) صحیح ،لە( البدایة والنهایة ) ج ٤ ص٩٧ دا وا هاتووە

بەڕاستی ئەوە موعجیزەیەکی ئەوەندە گەورەیە کە وەك ڕۆژی ڕووناك پێغەمبەرایەتی پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ دەسەلمێنێت و دڵنیایی وئاسودەیی تەواو دەبەخشێ بە دڵ ودەروون .

## موعجیزەی (٢٦١) سێ سەد کەس تێریان خوارد لە خواردنەکەی ئوم سولەیم کەچی وەك خۆی مایەوەو کەمی نەکرد :

هەر شەش کتێبە صەحیحەکانی فەرمووده لە پێش هەموویانەوە ئیمامی بو خاری و موسلیم لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە دەگێڕنەوە کەدەڵێ : پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ ژنی هێناو دایکم {ئوم سولەیم } خواردنێکی بەم بۆنەیەوە درووست کرد کە پێی دەڵێن {حەیس} کە خواردنێکە لە خورماو ڕۆن و کەشك درووست دەکرێت ئینجا خستیە ناو دەفرێکەوەو وتی : بڕۆ ئەمە ببە بۆ خزمەتی پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ و عەرزی بکەو : دایکم سەلامی لێ دەرکردیت و ئەمەی بۆ ناردیت و عەرزیشی بکە : ئەمەی کە ئێمە هێناومانە زۆر کەمە ئەنەس دەڵێ : بردم بۆ پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ ئەویش فەرمووی: بڕۆ فلان وو فلان وفلان و هەرکەسێکی تریش لە ڕێگا دا پێی گەیشتی بانگیان بکە، منیش ڕۆیشتم ئەوانەی پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ ناوی بردن و هەرکەسێکی ترم بینی بانگم کردن کاتێ گەڕامەوە بینیم ماڵەکە پڕبووە لەم کاتە دا یەکێك لەئەنەسی پرسی ژمارەیان چەند بوو ؟ وتی : نزیکەی سێ سەد کەس دەبوون پاشان وتی:چاوم لێ بوو پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ دەستی پیرۆزی لەسەر خواردنەکە داناو چی خوا حەزبکات خوێندی بەسەریداو پاشان دەکەس دەکەسی بانگ دەکردن بۆ خواردن و پێی دەفەرموون:ناوی خوا بهێنن و هەرکەس لەبەردەمی خۆیەوە بخوات ئەوانیش ئەوەندەیان خوارد هەتا تێربوون،بەم جۆرە دەستەیەك دەهات و دەستەیەك دەڕۆیشت تا هەموویان

تێربوون،ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی : ئەنەس وەرە هەڵی بگرە ، ئەنەس دەڵێ: نازانم کە یەکەم جار دامنا زیاتر بوو یان کە هەڵمگرت[٣٧٩] بەڕاستی زۆر سەیرەو جێگای سەرسورمانە بەدبەختانی دوور لە دین ئەو موعجیزە گەورەو ناوادارە دەبینین کەچی ئیمان ناهێنن و ڕێگای ڕاست ناگرنە بەر و بەرەو هەڵدێری و گومڕایی هەڵدەخلیسکێن.

## موعجیزەی (٢٦٢) پێغەمبەری خوا (ﷺ) کۆمەڵێکی زۆری لە خەڵکی تێر کرد لەیەك مشت خواردەمەنی خواردەمەنیەکەش وەك خۆی مایەوە کەمی نەکرد :

ئیمای ئەحمد لە { المسند} دا (١/ ٥٩) لە ئیمامی عەلیەوە – خوای لێ ڕازی بێ- هێناویەتی کە فەرموویەتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەوەی عەبدولموتەلیبی کۆکردنەوە ، یان بانگی کردن، کە کۆمەڵێکی زۆر بوون و هەریەکەیان {جذعە} یەکی دەخوارد، {جذعە} بەو ئاژەڵە دەوترێ کە لاو و بەهێزبێ، جا ئەو وشترەی کە پێی نابێتە ساڵی پێنجەم ئەو مانگاو بزنەی پێیان نابێتە ساڵی دووەم و ، ئەو مەڕەی کە ساڵێکی تەواوکردبێ پێی دەڵێن {جذعە} یەك فەرەقیشی نەخواردووە {فەرەقیش } پێوانەیەکە کە شازدە ڕەتل دەبێتو یەك ڕەتڵیش دوازدە مشتە ئەوە بوو یەك مشت خواردەمەنی بۆ لێ نان ، هەر هەمەوویان دەستیان بە خواردن کردو تێریان خواردو خواردەمەنیەکەش وەك خۆی مایەوە، هەروەك دەستی لێنەدرابێ ، پاشان داوای دۆلکەیەکی بچووکی کرد ،هەموویان تێریان خواردەوەو خواردنەوەکەش وەك خۆی مایەوە ، هەروەك دەستی لێ نەدرابێ، یان لێی نەخورابێتەوە ،

---

(٣٧٩) صحيح رواه البخاري و مسلم وغيرهما

فەرمووی : { یابني عبدالمطلب إني بعثت إلیکم خاصة و إلى الناس عامة ، فقد رأیتم من هذه الأیة ما رأیتم ، فأیکم یبایعنی علی أن یکون أخي و صاحبي ؟} واته : فەرمووی: ئەی ئەوەی عەبدولموتە من پێغەمبەری ڕوانە کراوم بە تایبەتی بۆلای ئێوەو بەگشتیش بۆلای هەموو خەڵکی ، موعجیزەی ئەو نان و ئاوەشتان بەچاوی خۆتان بینی جا کێتان بەیعەتم دەداتێ هەتا براو هاوڵم بێت دەفەرمووێ: تاقە کەسێك هەڵ نەستایەوە ئیمامی علی دەڵێ من کە بچوك ترینی خەڵکەکە بووم هەستامەوە بۆلای و فەرمووی : دانیشە پاشان ئەمەی سێ جار فەرموو ، هەموو جارێك هەڵ دەستام و پێمی دەفەرموو دانیشە هەتا جاری سێ یەم ئەوەبوو دەستی دا بەسەر دەستم دا [٣٨٠]

## موعجیزەی (٢٦٣) هەموو ئەوانەی لەخواردنەکەیان خوارد موسڵمان بوون و بەیعەتیان لەگەڵ پێغەمبەر دا ﴿ﷺ﴾ کرد :

کاتێ پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ کۆچی بۆ مەدینە کرد ، میوانی ئەوبو ئەییوبی ئەنصاری بوو، ڕۆژێکیان ئەبو ئەییوب خواردنێکی بۆ پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ و ئەبوبەکر دروست کرد ، ئەوەندەی بەشیان بکات ، پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ بە ئەبوو ئەییوبی فەرموو: { أدع ثلاثین من أشراف الأنصار } واته: سی کەسم لە پیاو ماقوولانی یاریدەدەران بۆ بانگ بکە، ئەویش بانگی کردنو هاتن و تێریان خواردو لێیان مایەوە، ئینجا فەمووی: {ادع ستین} واته : شەست کەسی ترم بۆ بانگ بکە ، ئەوانیش تێریان خواردوو لێیان مایەوە ، پاشان فەرمووی {ادع سبعین}

---

(٣٨٠) التفسیر لابن کثیر ٢ /٢٥٠ شرح حیاة الصحابة ١ /٢٠٣ ـ ٢٠٤ هیثمی لە ٨ / ٣٠٢ دا وتوویە تی رواه احمد ورجاله ثقات

واته: حەفتا کەس بانگ بکە ، ئەوانیش بە هەمان جۆر تێریان خواردوو لێشیان مایەوە، هەموو ئەوانەی کە هاتن و لەو خواردنەیان خوارد

موسڵمان بوون و بەیعەتیان لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) دا کرد جا ئەبوو ئەییوب – خوای لێ ڕازی بێ – دەڵێ : سەدو هەشتا کەس لەو خواردنەی منیان خوارد [٣٨١]

## موعجیزەی(٢٦٤) ئەگەر نەیان پێوایە هەرلێیان دەخواردوو بەشیشی دەکردن :

لە صەحیحی موسلم و کتێبی { الشفا} و جگەلە وانیش چەسپاوە کە جابیر - خوا لێی ڕازی بێت – دەگێرێتەوە کە جارێکیان پیاوێك هاتە خزمەتی پێغەمبەر(ﷺ)و داوای خواردنی لێ کرد ،ئەویش نیوبار جۆی پێ دا،ئەم پیاوە خۆی و ژن ومیوانی ماوەیەکی زۆر لێیان دەخوارد ، هەتا جارێك بۆ ئەوەی بزانن چەندەی کەم کردووە پێوایان ،پاش پێوانەکە،دەرکەوت بەرەکەتە کەی نەماو وردە وردە کەم بوومەوە ، ئینجا هاتە خزمەتی پێغەمبەر(ﷺ)و بۆی گێڕایەوە ،ئەویش فەرمووی {لولم تكله لاكلتم منه ولقام بكم } واتە : ئەگەر نەتپێوایە هەر لێتان دەخواردو بەشیشی دەکردن [٣٨٢]

---

(٣٨١) رواه الطبراني والبيهقي (الشفا )١/٢٩٢

(٣٨٢) صحيح رواه مسلم

## موعجیزەی (٢٦٥) قاپە گۆشتێك هەر لە بەیانی تا شەو دەستە بەدەستە خەڵك لێیان دەخواردوو و دەڕۆیشتن :

کتێبە صەحیحەکانی فەرمووده وەك ( ترمذی و ، نەسائی ، ،بەیهەقی و ، کتێبی { الشفا} لەسەمموورەی کوڕی جوندو بەوە دەگێڕنەوە کە : جارێکیان قاپێك خواردنیان بۆ خزمەتی پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ هێنا کە هەندێ گۆشتی تێدا بوو، ئینجا هەر لە بەیانی یەوە تا شەو دەستە دەستە خەڵك دەهاتن لێیان دەخواردوو دەڕۆیشتن (٣٨٣)

## موعجیزەی (٢٦٦) کۆمەڵە خەڵکێکی زۆر لە خواردنەکەی دایکی جابیر یان خوارد لێشی مایەوە:

تەبەڕانی لە جابرەوە هێناویەتی دەڵێت:دایکم خواردنێکی ئامادەکردو وتی: برۆ بۆلای پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ داوای میوانداری بکە، دەڵێ : چووم بۆلای پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ و وتم : دایکم شتێکی ئامادەکردووە ئەوەیش بە هاوەڵانی فەرمووو : هەستن پەنجا کەس لەگەڵی هەستان لەبەر دەرگا دانیشتن و پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ فەرمووو: {ادخل عشرة عشرة } واتە : دە دە بیانبەرە ژوورەوە ، خواردیان تا تێر بوونو لێی مایەوە (٣٨٤)

---

(٣٨٣) صحیح رواه الترمذی

(٣٨٤) هەیسەمی لە ج٨ ص٣٠٨ دەڵێت کەسەکانی سەنەدەکە جێ متمانەن

## موعجیزەی (٢٦٧) خوای گەورە وەڵامی داواکاریەکەی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ دا دەداتەوە :

بەیهەقی لەواسلەی کوڕی ئەسقعەوە هێناویەتی دەڵێت : ڕەمەزان بوو ئێمەش خەڵکەکە ئەهلی صوفە بووین ڕۆژوومان گرت ، لە کاتی ڕۆژوو شکاندندا هەر کاممان لەگەڵ ئەهلی بەیعەتدا ، دەچووین، شەوێك کەس نەیبردینەوەو بەیانیمان کردەوە و هەمووماان کەس نەهات بمانباتەوە چووین بۆلای پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ ووتمان چی بووە ، ئەویش ناردی بۆلای هەریەك لە ژنەکانی تا پرسیاریان لێ بکات هیچیان لایە ؟ هەرکامیان هەرچی لابوایە لە ماڵەکەیدا دابەشی دەکرد ، پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ فەرمووی : کۆببنەوەو نزای کردوو فەرمووی : { خوایە داوای فەزڵ و ڕەحمەتی خۆت لێدەکەم ، چونکە بەدەستی خۆتە و جگەلە تۆ کەس بەدەستی نیە } هێندەی نەبرد هەرکەس داوای مۆڵەتی کرد بەرخێکی برژا و کولاو یشی هێنا پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ فەرمانی کرد خرایە بەردەستمان تا تێرمان خوارد پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ فەرمووی : ئێمە داوای فەزڵ رەحمەتمان لە خوا کرد ئەمەش فەزڵیەتی و ڕەحمەتەکەش بۆمان لەلای ماوە [٢٨٥]

## موعجیزەی ( ٢٦٨ ) ئەگەر هەموو خەڵکی سەر زەویش بهاتبانایە بەشی دەکردن :

سەلەمەی کوڕی ئەکوەع و ئەبووهورەیرە و عومەری کوڕی خەتتاب – خوایان لێ ڕازی بێ – دەیگێڕنەوە لە یەکێك لە غەزاکانی پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ برسێتی ڕووی کردە ئەو خەڵکەی کە

---

٢٨٥) حدیث حسن لە ( البدایة : والنهایة ) ج٦ ص ١٢٠ دا وا هاتووە

لە خزمەتی دا بوون، پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ داوای لێ کردین هەرچی خواردنیان پێ ماوە بیهێنن ، جا هی وا بو مشتێك یان زیاتری پێ مابوو ، دەیهێنا ئەوەی کە زۆری پێ مابوو صاعێك خورمای‌پێ مابوو دەیهێنا ، بەم جۆرە تا هەمووی هێنراو ئامادەکرا ئینجا لەسەر پارچە یەك کۆی کردنەوە سەلەمەی کوڕی ئەکوەع دەڵێ : قەبارەی بزنێك بەچۆکدا هاتبێت چەندەجێ دەگرێت ، ئەو خورماو خواردەمەنیەش هێندە جێ یان گرتبوو، ئینجا پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ داوای لەسوپاکەی کرد دەفرەکانیان لێ پربکەن ، بەڕادەیەك کە هیچ توورەکەو دەفرێك لە سوپاکە دا نەما پڕ نەکرێت ، سەرەڕای ئەمەش ، بەئەندازەی ئەوەی یەکەم جا کۆکرایەوە یان زیاتر ی لێ مابوویەوەخۆ ئەگەر هەموو خەڵکی سەر زەویش بهاتنایە بەشی دەکردن[٢٨٦]

بەڕاستی جێی سەرسوڕمانە کە بەدبەختانی دوور لەدین ئەم هەموو بەڵگەو موعجیزە گەورانە دەبینن کەچی هانیان نادات بۆ ئیمان هێنان بەرەو هەڵدێری و گومڕایی هەڵدەخلیسکێن و ڕێگای ڕاست ناگرنەبەر .

## موعجیزەی (٢٦٩) وەك چۆن یەکەم جار دانرابوو هەروەها بوو بەڵام جێگای پەنجەکانی تێدا دیاربوو :

چەند کەسێکی باوەڕ پێکراو وەك نووسەری پەرتووکی { الشفا} و ئیبن ئەبی شەیبەو تەبەرانی و چەند زانایەکی لێکۆڵەری تریش بەسەنەدێکی بەهێز و باشەوە دەگێڕنەوەکە ئەبوو هورەیرە – خوای لێ ڕازی بێت – دەڵێ : پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ فەرمانی پێدا ام هەموو ئەهلی (صوففە ) ی بۆ بانگ بکەم ئەهلی صوففەش هەژارە کۆچ کردووەکان بوون کەلە سەد

(٢٨٦) صحیح رواه البخاری ومسلم

کەس زیارت دەبوون و لە صوففەدا کە سەکۆیەکی مزگەوت بوو نیشتەجێ بوو بوون ، ئەبو هورەیرە دەڵێ : یەکە یەکە بە شوێنیان دا گەڕام تا هەموویانم کۆکردەوەو هێنامن ، ئینجا قاپێك خواردنمان لە بەردەم دا دانرا ، ئێمەش هەتا توانیمان لێمان خوارد ، کە لێبوینەوە وەك چۆن یەکەم جار دانرابوو ، هەروەها بوو ، ئەوەندە نەبێت کە جێگای پەنجەکانی تێدا دیاربوون[٢٨٧]

## موعجیزەی (٢٧٠) باوەڕدار لەیەك قاپدا دەخوات بەڵام بێباوەڕلە حەوت قاپدا دەخوات :

تەبەرانی لە مەیموونەی کچی حارسەوە هێناویەتی : دەڵێت : ساڵێکی ووشکە ساڵی هات و دەشتەکیەکان دەهاتن بۆ مەدینە ، پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ فەرمانی بە هاوەڵان دەکرد هەرکەسەو دەستی یەکێك بگرێت و بیباتەوە بۆ ماڵەوەو شەو میوانداری بکات ، شەوێکیان دەشتەکیەك هات ، پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ خواردنێکی سادەو بڕێ شیری لابوو ، دەشتەکیەکە هەمووی خواردوو هیچی بۆ پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ نەهێشتەوە،شەوێك یان دووشەو مایەوەو ئەویش هەموو خواردنەکەی دەخواردن منیش بە پێغەمبەرم﴿ﷺ﴾ وت : خوایە بەرەکەت نەدەیتە ئەم دەشتەکیە، نانەکەی پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ دەخوات و بەشی ناهێڵیت ، پاشان شەوێکی دیکە هێنایەوەو تەنها کەمێکی خوارد بە پێغەمبەرم﴿ﷺ﴾ وت : مەگەر ئەمە هەر ئەو نیە بە موسڵمانی هاتبوویەوە فەرمووی : { ان الكافر يأكل فى سبعة امعاء و إن المؤمن يأكل فى معى واحد} واتە : بێباوەڕ لە حەوت قاپدا دەخوات و باوەڕدار لەیەك قاپدا دەخوات[٢٨٨]

---

(٢٨٧) رواه الطبراني باسناد حسن

(٢٨٨) صحيح هه يثه مى له ج ٥ ص ٣٢ ده ليت : ته به رانى به ته واوه تى هيناويه تى ئه حمه د كورتاييه كه ى هيناوه كه سه كانى سه نه دى ته به رانى صه حيحن

## موعجیزەی (٢٧١) پێی فەرمووبخۆو بەشی ماڵ منداڵەکەشت بدە :

ئیبن جەریر لە حەسەنەوە – خوای لێ ڕازی بێ – هێناویەتی دەڵێت : لە {دومە تولجە ندە ل} قاپێکی هێنا ئەو خواردنەی تێدابوو کە بینیتان پێشکەشی پێغەمبەرم﴿ﷺ﴾ کرد ، ئەوکات سوێند بەخوا پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ و خێزانەکانی پێویستیان پێ بوو کەلە نوێژ بوویووە بەکەسێکی فەرموو تا بیگێڕێت بەسەر هاوەڵەکانیدا ، کەس هەبوو دەستی دەبردە ناوی و بڕێکی دەردەهێناو دەیخوارد و هێنای بۆ خالیدی کوڕی وەلید دەستی بردە ناوی وتی : ئەی پێغەمبەری خوا خەڵکی یەکجار هەڵیانگرت من دووجار فەرمووی : { کل واطعم اهلك} واتە : بخۆو بەشی ماڵ و منداڵەکەش بدە [٢٨٩]

## موعجیزەی ( ٢٧٢ ) ئەوە ڕزق و ڕۆزیەکە خوا بۆی دەرکردن :

بەیهەقی لە ڕێگەی ئەبو زوبەیر لە جابرەوە – خوایان لێ ڕازی بێ - هێناویەتی وەك لە { البداية والنهاية ج٤ ص٢٧٦} دا هاتووە دەڵێت : پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ بەسەرکردایەتی ئەبو عوبەیدە ناردینی بۆ گەیشتن بە کاروانێکی قوڕەیش و بارێك خورمای پێداین کە جگەلە وەمان بۆ نەبو ، ئەبو عوبەیدە بەدانە دانە پێیدەداین ، ئەبو زوبەیر وتی منیش وتم ئێوە چیتان پێدەکرد؟ جابر وتی : وەك منداڵ دەمانمژی دواتر ئاومان بەسەردا دەخواردەوە بەیانی تا ئێوارە ئاومان بۆ هەبوو، لەکەناری دەریادا شتێك وەك بەرزایەکی گەورە هەبوو

---

(٢٨٩) لە كنز العمال ج٤ ص٤٧ دا وا هاتووە

چووین سەیرمان کرد ئاژەڵێکە پێی دەوترێ {عەنبەر} ئەبوعوبەیدەوتی : مردووە مردارەوەبووە پاشان وتی نا ، بەڵکو ئێمە نێردراوی پێغەمبەری خواین لە ڕێ خوادا ، ئێوەش ناچارن دەی بخۆن مانگێ بەسێ سەد کەس لێمان خوارد وەك گایان پارچە گابوو ، ئەبو عوبەیدە سیازە کەسمانی لای چاویەوە داناو پارچە ئێسکێکی گرت و

ڕێکی کردەوە ، دواتر گەورەترین وشتری هێنایە ژێری ، چەند پارچە گرشتێکمان بەزەرکراوی هەڵگرت ، کەهاتینە مەدینە چوینە خزمەتی پێغەمبەر(ﷺ) و بۆمان باسکرد، ئەویش فەرمووی :ئەوە ڕۆزیەك بوو خوا بۆی دەرکردن ، ئایا هیچ لە گۆشتەکەیتان پێ یە دەرخواردمان بدەن ؟ هێنامان بۆ پێغەمبەر(ﷺ) لێی خوارد [٣٩٠]

## موعجیزەی (٢٧٣) ئەگەر وازی لێ بهێنابایە تا ڕۆژی دوایی دەستهارەکە دەیهاڕی :

ئەحمەد لە ئەبو هورەیرەوە هێناویەتی دەڵێت : کەسێ چوو بۆ لای ماڵ و منداڵی و بینی پێویستیان هەیە چوویە دەر بۆ شت پەیدا کردن ، کاتێ ژنەکەی بینی هەستا بۆلای دەستهاڕەکەو داینا تەنوورەکەی گەرمکرد دواتر وتی : خوایە ڕۆزیمان بدە ، سەیری کرد تەشتەکە پڕبووە ، چوو بۆلای تەنورەکەش ئەویش پڕبووە ، پیاوەکە گەڕایەوەو وتی دوای من هیچتان دەسکەوت ژنەکەی وتی : بەڵێ لە پەورەدگارمانەوە هەستان بۆلای دەستهاڕەکە ئەوەی باسکرد بۆ پێغەمبەر(ﷺ) ئەویش فەرمووی {اما إنه لولم یرفعها لم تزل تدور إلى یوم القیامة }

---

(٣٩٠) موسلیم و ئەبو داود لە ئەبو زوبەیرەوە هێناویانە وەك لە ( البدایة والنهایة ) ج٤ ص٢٧٦ ) دا هاتووە

واتە : ئەگەر بەرزی نەکردایەتەوە بەردەوام تا ڕۆژی دوایی دەسوڕایەوە { هە یثە می لە ج ١٠ ص ٢٥٦} دا دەڵێ : ئەحمەد و بەزار هێناویانە و دەڵێت : ژنەکەی وتی : خوایە ئەوندەمان پێببەخشە تا بیکەین بە ئاردو هەویرو نان سەیریکرد تەشتەکە پڕلەنانو دەستهاڕەکەش دەسوڕێ و تەنوورەکە پڕبووە لە نانی برژاو ، مێردەکەی وتی هیچتان لایە ؟ ژنەکەی وتی : ڕۆزی خوایە ، کابرا دەستهاڕەکەی هەڵگرت ونەوەی چواردەووری کۆکردەوە ، پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ پێی فەرموو ئەگەر وازت لێبهێنابایە تا ڕۆژی دوایی دەیهاڕی[٣٩١]

## موعجیزەی(٢٧٤) : دەرکەوتنی گەورەترین بەڵگەو نیشانە لەسەر ڕاستی و درووستی پێغەمبەرایەتی پێغەمبەر (ﷺ) :

بەیهەقی لە ئەبو هورەیرەوە هێناویەتی دەڵێت : لە ئیسلامدا تووشی سێ موسیبەت بووم کەشتی وا سەختم تووش نەبووە ، مردنی پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ کەمن هاودەمی بووم ، شەهید بوونی عوسمان و توێشووەکەی ، ووتیان ئەبوهورەیرە توێشوەکە چی یە ؟ وتی ئێمە لەسەفەرێکدا لەگەڵ پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ بووین کە فەرمووی ئەی ئەبوو هورەیرە ئایە هیچت پێیە ؟ وتم : بەڵێ خورما لە توێشووەکەمدا یە ،فەرمووی:بیهێنە منیش خورماکەم دەرهێناو هێنام بۆ خزمەتی پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ دەستی موبارەکی لێداو نزای لەسەر کرد دواتر فەرمووی دەکەس بانگ بکە دەکەسم بانگ کرد لە خورماکەیان خوارد تا تێر بوون، پاشان بەو جۆرە بوون تا هەموو سوپاکە نانیان خواردوو خورمایەکەم بۆ مایەوە لە توێشووەکەمدا پێغەمبەر﴿ﷺ﴾فەرمووی: ئەی ئەبو هورەیرە ئەگەر ویستت شتێکی لێ

---

(٣٩١) تەبەرانی لە ( المعجم الاوسط ) دا بە هە مان شیوە هیناویە تی کە سە کانی سە نە دە کە ی صە حیحن

وەربگریت دەست ببەرە ناوی و هەڵیمەدەرەوە ، منیش لەسەردەمی پێغەمبەرو(ﷺ) ئەبو بەکر و عومەر و عوسماندا لێم خوارد کە عوسمان شەهید کرا ئەوەی لە دەستم دابوو ئەوەی لە توێشوەکەمدا بوو بە تاڵان چو ، پێتان بڵێم چەندم لێ خوارد ؟ زیاتر لە دووسەد کۆڵم لێ خوارد [٣٩٢]

{ الله أكبر} لەو موعجیزە گەورە و بەناوبانگە بەڕاستی دەبوو ئەو کەسانەی کە لە ئەوپەڕی گومان و دوودڵی دان و لەئاینی ئیسلام دوورن کە ئەو موعجیزە گەورەیە دەبینن بەبێگومان بەتەواوی دڵنیابن و ڕووبکەنە ئەو بەرنامە پاك وپیرۆزەی ئیسلام سوپاس بۆ خوای گەورە وە درووود بۆ گیانی پاکی پێغەمبەر(ﷺ)

## موعجیزەی ( ٢٧٥ ) بەرەکەتێکی گەورە و ناودار بەهۆی نزای پێغەمبەری خوا( ) :

ئەحمەد لە ئەبوعەمرەی ئەنسارییەوە – خوا لێ ی ڕازی بێت – هێناویەتی دەڵێت : لەگەڵ پێغەمبەر (ﷺ) لە غەزایەکدا بووین خەڵکە تەواو تووشی برسیەتی بوون لای پێغەمبەر (ﷺ) داوای مۆڵەتیان کرد تا وڵاخەکانیان سەر ببڕن وتیان خوا بەوە دەمانگەیەنێت ، کاتێ عومەری کوڕی خەتتاب بینی پێغەمبەر (ﷺ) دەیەوێت مۆڵەتیان بدات بەسەر بڕینی هەندێ لە وڵاخەکانیان وتی : ئەی پێغەمبەری خوا ئەی ئەگەر سبەینێ بەکەسی برسی بەدوژمن گەیشتین چۆن دەبین، بەڵکو ئەگەر پێت باشە ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) نزامان بۆ بکەیت ئەو خۆراکەی ماویانە کۆی بکەیتەوە و لای خوا نزای بەرەکەتی بۆ بکەیت ، ئەوا خوا بەنزاکەت دەمانگەیەنێ یان بەرەکەت

---

(٣٩٢) لە (البداية والنهاية) ج٦ ص١١٦ ) دا وا هاتووە ئەبو نەعیم لە (الدلائل ص١٥٥ ) لە ئەبو هورەیرەوە بەهەمان شێوە و ترمذی و ئەحمەدیش بە کورتی بە و واتایە لێوەی هێناوە

دەخاتە نزاکەت بۆمان پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ داوای کرد چی ماوە لایان بیهێنن خەڵکی تیکە و دوو تیکە زیاتر خواردنیان دەهێنا ، زۆرترینیان ئەوەبوو مشتێ خورمای هێنا ، پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ کۆیکردەوە و ئینجا هەستا هێندەی خوا بیەوێ نزای کرد دواتر داوای کرد سوپاکە قاپاخەکانیان بێنن و لێیبەن هەموویان قاپەکەیان پڕکردن و ئەوەندەش مایەوە ، پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ پێکەنی تا دانەکانی پێشەوەی دەرکەوتن و فەرمووی : ( شایەتی دەدەم هیچ پەرستراوێك نیە جگە لەخوا و منیش پێغەمبەری خوام، هەربەندەیەکی باوەڕدار بەو دووانە بگاتەوە بەخوا ، ئەوا لەڕۆژی دواییدا دۆزەخی لەسەر قەدەغە دەکرێت . [٣٩٣]

## موعجیزەی ( ٢٧٦ ) زەماوەندەکەیان پڕ پیت و بەرەکەت بوو:

بەڕیوایەتێکی صەحیح چەسپاوە کە : کاتێ پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ فاتیمەی کچی لە ئیمامی عەلی مارە کرد ، فەرمانی فەرموو بە بیلال بچێت چوار پێنج مشت خۆراك لە قاپێکدا ئامادە بکات و یەکسەر حوشتریش بهێنێت تا سەری ببڕێت بۆ ئاهەنگ و زەماوەندەکەیان بیلال دەڵێ هێنامن و پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ وشترەکەی سەربڕی و پاشان فەرمانی فەرموو کە میوانەکانی دەستە دەستە بێنە ژوورەوە ، ئەوانیش هاتن و لە خواردنەکەیان خوارد هەتا تێربوون ، ئینجا بەشێکی لێ زیاد بوو ، پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ دووعای بەرەکەتی بەسەردا خوێند و فەرمانی دا ببرێت بۆ خێزانەکانی و پێی فەرموون : خۆتان و ئەوانەش دێن بۆلاتان لێ ی بخۆن . [٣٩٤]

---

[٣٩٣] ئەسائی بەهەمان شێوە هێناویەتی لە ( البداية والنهاية ج٦ ، ص١١٤ )دا هاتووە ، ئیبن سەعد ( ج١،ص١٨٠ ) لە ئەبو عەمرەوە بەهەمان شێوە هێناویەتی ، ئەبو نەعیم لە ( الدلائل ، ص١٤٨ ) لە ئەبوهورەیرە و جابرەوە و موسلیمیش لەو دووانە هێناویانە ، ئەحمەد و موسلیم و نەسائی لە ئەبوهورەیرەوە بەهەمان شێوە هێناویانە لە ( البداية والنهاية ج٦ ، ص١١٢ ) دا واهاتووە .

[٣٩٤] الشفا ٢٩٧/١ .

## موعجیزەی ( ٢٧٧ ) هەزار و چوار سەد کەس لێیان خوارد کەچی کەمی نەکردبوو و وەك خۆی مابوو:

ئەبو یەعلا لە ئیاسی کوڕی سەلەمەوە لە باوکیەوە هێناویەتی دەڵێت : ئێمە لە غەزای خەیبەر لەگەڵ پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ بووین ، فەرمانی پێکردین چیمان پێیە کۆی بکەینەوە ، واتە : خورما ، ئێمەش شتێکمان ڕاخست و لەسەری بڵاومان کردەوە و وەستام سەیرم کرد و دەورمدا وەك پەچەی مەڕ و ئێمەش چواردە سەدی بووین ، واتە : هەزار و چوارسەد کەس لێمان خوارد و دواتر سەریم کردەوە وەك خۆی مابوو ، ئینجا فەرموودەی بەرەکەتی ئاوەکە دێنێ . [٣٩٥]

## موعجیزەی( ٢٧٨ ) دەعوەتێکی ناودار و پڕ پیت و فەڕ :

ئیمام جەعفەری صادق لە ئیمام موحەممەدی باقری باوکیەوە ئەویش لە ئیمام زەینولعابیدینی باوکیەوە ئەویش لە ئیمامی عەلیەوە- خوای گەورە لەهەموویان ڕازی بێ – دەگێڕێتەوە کە : فاتیمەی کچی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ قازانێك خواردنی بۆ خۆی و ئیمامی عەلی لێنابوو ، پاشان داوای لە ئیمامی عەلی کرد بچێت بەدوای پێغەمبەردا ﴿ﷺ﴾ تاکو ئەویش بەشداری ئەو خواردنەیان بکات ، کاتێ کە پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ تەشریفی هێنا فەرمانی بە فاتیمەدا – خوا لێ ی ڕازی بێ – بۆهەریەکە لە خێزانەکانی قاپێك تێ بکات ، ئینجا خۆی و

---

[٣٩٥] موسلیم لە ئیاس لە باوکیەوە هێناویەتی دەڵێت : نانمان خوارد تا تێربووین ، ئینجا جویکانە و شتەکانمان پڕ کردن ، لە ( البداية والنهاية ج٦،ص١١٥ )دا هاتووە .

ئیمامی عەلی و بۆ فاتیمە ، پاشان کە خواردنەکە هەڵگیرا ، قازانەکە هەر لێوان لێوبوو فاتیمە – خوا لیٚ ی ڕازی بیٚ – دەڵیٚ :تا خوا حەزیکات لیٚمان خوارد . (٣٩٦)

## موعجیزەی ( ٢٧٩ ) هەموو خەڵکەکە لە خواردنەکەیان خوارد تەنها سیٚ یەکیان لیٚ خوارد دوو بەشی لیٚ مایەوە .

تەبەرانی لە عەبدوڵلای کوڕی عەباسەوە - خوا لیٚ ی ڕازی بیٚ – هیٚناویەتی دەڵیٚ : پیٚغەمبەر ﴿ﷺ﴾ خەندەقی لیٚدەدا و هاوەڵان لەتاو برسیەتی بەردیان لەسەر سکیان بەستبوو ، کاتیٚ پیٚغەمبەر ﴿ﷺ﴾ ئەوەی بینی فەرمووی : ﴿ هل دللتم علی رجل یطعمنا أکلة ﴾ واتە : ئەریٚ کەس دەناسی شتیٚ خواردنمان پیٚ بدا؟ کەسیٚ وتی : بەڵیٚ فەرمووی : ئا بڕۆ و بمانبە بۆلای چوو بۆ ماڵی کابرا و ئەو لەخەندەقەکەدا پشکی خۆی وەردەگرت ، ژنەکەی هەواڵی نارد با بیٚتەوە، چونکە پیٚغەمبەر ﴿ﷺ﴾ هاتووە بۆ لامان و کابرا خیٚرا هاتوو وتی بە دایك و باوکمەوە بە قوربانت بم ، بزنیٚکی هەبوو کاریٚکیشی هەبوو گرتی ، پیٚغەمبەر ﴿ﷺ﴾ فەرمووی : ﴿ الجدی من ورائها ﴾ کارەکەی لە دواوەیە ئەویش کارەکەی سەر بڕی و ژنەکە هەویریٚکی بۆ شیٚلا و نانی کرد و کردی بە تریت و لەبەردەم پیٚغەمبەر ﴿ﷺ﴾ و هاوەڵانیدا خواردنەکەی دانا پیٚغەمبەر ﴿ﷺ﴾ پەنجەی خستە ناوی و فەرمووی : ﴿ بەناوی خوا خوایە بەرەکەتی بخەیتە ناو ، بخۆن ﴾ ، هەموو خواردیان و تەنها سیٚ یەکیان لیٚ خوارد و دوو بەشی مایەوە ، ئەو دەکەسەی لەگەڵی بوون ڕایسپاردن بچن و دوای ئەوان هیٚندەی دی بیٚنن ، دە کەس دە کەس تا هەموویان تیٚربوون ، پاشان هەستاو نزا ی کرد بۆ ژنی ماڵەوە و ناوی خوای هیٚنا لەسەر ژنەکە و خیٚزانەکەی پاشان چوو بۆ خەندەقەکەو

---

(٣٩٦) الشفاء ٢٩٤/١ .

فەرمووی : ﴿ بمان بەن بۆلای سەلمان ﴾ بەردێك لەبەردەستی دابوو بۆی نەدەشکا پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ فەرمووی :

﴿ وازم لێ بێنن با من یەکەم کەس بم لێی بدەم ﴾ فەرمووی : بەناوی خوا لێیدا سێ یەکی شکا فەرمووی : الله أكبر سوێند بە پەروەردگاری کەعبە کۆشکەکانی شام ، پاشان دیسان لێیدا و بەشێکی دیکەی شکا و فەرمووی : سوێند بە پەروەردگاری کەعبە کۆشکەکانی فارس ، ئەو کات دوو ڕوومکان وتیان ئێمەش خەندەق لێدەدەین و ئەویش بەڵێنی کۆشکەکانی فارس و ڕۆممان پێدەدات.[٣٩٧]

## موعجیزەی ( ٢٨٠ ) قاپە خورماکە و موعجیزەیەکی گەورە و ناودار :

ئیبن عەساکیر لە عرباضەوە – خوا لێ ی ڕازی بێ – هێناویەتی دەڵێت : من لەسەفەر و ماڵەوە لەبەردەرگای پێغەمبەردا﴿ﷺ﴾ بووم شەوێك لە تەبووك بووین یان بۆ پێویستیەك چووین گەڕاینەوە بۆ لای پێغەمبەر ﴿ ﷺ﴾ سەیرمان کرد خۆی و ئەوانەی دەوری نانیان خواردووە ، فەرمووی : لە ئێوارەوە لە کوێ بوون ؟ منیش هەواڵم پێدا جوعالەی کوڕی سوراقە و عەبدوڵڵای کوڕی مەعقەلی موزەنی دەرکەوتن ، ئێمە سێ کەس بووین هەموومان برسی بووین ، پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ چوویە ماڵی ئوم سەلەمە و داوای شتێکی کرد تا بیخۆن ، بەڵام هیچی لادەست نەکەوت بیلالی بانگ کردوو فەرمووی : هیچ شتێ نیە ؟ ئەویش قاپە پێستینەکەی هەڵگرت و حەوت خورمای کۆ کردەوە و خستیە قاپێك پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ دەستی

---

[٣٩٧] لە ( البداية والنهاية ج٤ ، ص١٠٠ )دا هاتووە .

لەسەر دانان و ناوی خوای هێنا و فەرمووی : بەناوی خواوە بخۆن ، ئێمەش خواردمان ، من پەنجا و چوار خورمام ژمارد هەموویان دەژمارد و ناوکەکەشیانم لەدەستەکەی دیکەمدا بوون ، دوو هاوڕێکەشم هەمان شتیان دەکرد ، هەرکامیان پەنجا خورمایان خوارد دەستمان بەرزکردەوە سەیرمان کرد حەوت خورماکە وەك خۆی ماون ، پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ فەرمووی : ﴿ یا بلال ارفعهن فی جرابك ﴾ واتە : ﴿ بیانخەرە ناو ﻗﺎپە پێستینیەکەت ﴾ بۆ بەیانی خستیە قاپێك و پێغەمبەر﴿ﷺ﴾ فەرمووی : بەناوی خواوە بخۆن و ئێمەش خواردمان تا تێربووین ، ئێمەش دە کەس بووین ، دەستمان هەلگرت خورماکان وەك خۆیان بوون، پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ فەرمووی :﴿ ئەگەر شەرم کردنم لە پەروەردگار نەبوایە لەم خورمایانەم دەخوارد تا کاتێ دەگەڕێینەوە مەدینە ﴾ کاتێ گەڕایەوە مەدینە گەیشت بە غولامێ لە خەلکی مەدینە و خورماکانی دا بەو غولامە،ئەویش خورماکانی دەمژی و دەچوو . (394)

بەڕاستی موعجیزەیەکی گورە و بەناوبانگە سوپاس بۆ خوای گەورە وە درووود بۆ گیانی پاکی پێغەمبەرەکەی ﴿ﷺ﴾.

## موعجیزەی ( ٢٨١ ) سێ مشتە جۆ شەش مانگ لێیان خواردوو هیچی کەم نەکرد :

حاکم لە ( ج٣،ص٢٤٦ ) لە نەوفەلی کوڕی حارثی کوڕی عەبدولموتەلیبەوە هێناویەتی ، بۆ هاوسەرگیری داوای یارمەتی لە پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ کردووە ئەویش ئافرەتیکی لێ مارە کردووە ئەویش بۆ شتێ گەڕاو هیچی دەست نەکەوت پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ ئەوبو ڕافع و ئەبو

---

(394) لە ( البداية والنهاية ج٦ ، ص١١٨ )دا هاتووە .

ئەیوبی بە قەڵغانەکەی ناردە لای جولەکەیەك بەسێ مست جۆ بەرەهنیدا ، پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ خواردنەکەی دا بە من و نیو ساڵ لێمان خوارد دواتر کێشامان ، سەیرمان کرد وەك سەرەتای وایە نەوفەل وتی : ئەوەم باسکرد بۆ پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ فەرمووی : ئەگەر نەتکێشایە تا دەمایت لێت دەخوارد . (٣٩٥)

بەڕاستی ئەوە موعجیزەیەکی ئەوەندە گەورەیە کە وەك ڕۆژی ڕووناك پێغەمبەرایەتی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ دەسەلمێنێ وە گومان و دوودڵی لا دەبات لەناو دڵەکاندا .

## موعجیزەی ( ٢٨٢ ) خورماکان بەدەوری جلەکەدا دەکەوتن لەبەر زۆری :

ئەبو نەعیم لە ( الدلائل ص١٨٠ ) لە سەعیدی کوڕی مینائەوە هێناویەتی کچی بەشیری کوڕی سەعد خوشکی نوعمانی کوڕی بەشیر وتی : عەمرەی کچی ڕەواحە بانگی کردم و پڕی دوو مشت خورمای کردە ناو چاکم و وتی : کچی شیرینم ئەوە ببە بۆ باوکت و خاڵت ، عەبدوڵلای کوڕی ڕەواحە تا نانەکەیان بخۆن ، منیش گرتم و کەوتمە ڕێ و دام بەلای پێغەمبەردا ﴿ﷺ﴾ کاتێ بۆ باوکم و خاڵۆم دەگەڕام پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ فەرمووی : بیهێنە منیش کردمە دەستی پێغەمبەر و پڕی کرد ، فەرمانی کرد جلێ ڕاخراو خورماکانی لەسەر داناو لەسەر جلەکە بوو ، پاشان بەکەسێکی لای خۆی فەرموو ( لەناو خەڵکی خەندەقدا هاوار بکەن وەرن بۆ نان خواردن خەڵکی خەندەق لەسەری کۆبوونەوە و لێیان دەخوارد خورماکەش زیادی دەکرد تا هەموویان لێبوونەوە و خورماکەش بە چواردەوری جلەکەدا دەکەوت لەتاو زۆری . (396)

---

(396) لە ( البداية والنهاية ج٦ ، ص١١٦ ) لە ئیبن ئیسحاق لە سەعیدەوە بە هەمان شێوە هێناویەتی ، بەڵام واهاتووە : فەرمانی کرد جلێ ڕاخرا پاشان خورماکەی داواکردوو لەسەر جلەکە ڕشتی .

## موعجیزەی (٢٨٣) تێشووی سوارەکانی تیرەی ئەحمەس و ڕوودانی موعجیزەیەکی گەورە :

پێشەوایانی وەك : ئەبو داود و ئەحمەدی کوڕی حەنبەل و بەیهەقی لە دووکەینی ئەحمەسی کوڕی سەعیدی موزەینەوە و لە نوعمانی کوڕی موقەڕرینی ئەحمەسی موزەینەوە کە خۆی و هەر شەش براکەی بە هاوەڵیەتی پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ شەرەفمەند بوون هەروەها لە ڕیوایەتی جورەیر و چەند ڕێیەکی ترەوە دەگێڕنەوە کە : پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ فەرمانی بە عومەری کوڕی خەتابدا- خوا لێ ی ڕازی بێ - تێشوو بەچوار سەد سوارەی تیرەی ئەحمەس بدات عومەر عەرزی کرد : ئەی پێغەمبەری خوا هەرچیەك هەیە تەنها چەند صاعێکە پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ فەرمووی : بڕۆ بیاندەرێ عومەر ڕۆیشت و لەو خورمایەی کە بەئەندازەی جێ ی بەچکە وشترێك کە ( یخ بوویێت ) جێگای گرتبوو ، بەشی هەموویانی داو پاشان وەك خۆیشی مایەوە . (397)

## موعجیزەی (٢٨٤) پەرداخە شیرەکە گەورەترین بەڵگەی پێغەمبەرایەتیە :

ئەبو هورەیرە - خوا لێ ی ڕازی بێ – دەی وت : سوێند بەو خوایەی هیچ پەرستراوێکی بەهەق نیە جگە لەو هەندێکجار لەبەر برسیەتی زۆر دەیدا لە جەرگم و دادەنیشتم لەسەر زەوی ، هەندێ جار بەردم دەبەست بەسەر سکمەوە لەبەر برسیەتی ، ڕۆژێکیان لەو سەرە

---

(397) ( رواه أحمد والطبراني ، ورجاله رجال الصحيح .

ڕێیە دادەنیشتم کە مسوڵمانان پیایدا تێدەپەڕن ، ئەبوبەکر - خوا لێ ی ڕازی بێ – تێپەڕی پرسیارێکم لێ کرد دەربارەی یەکێ لە ئایەتەکانی قورئان بۆ ئەوەش بوو کە خواردنێکم بداتێ و تێربم و تێپەڕی و هیچی نەدامێ پاشان عومەر - خوا لێ ی ڕازی بێ – تێپەڕی و پرسیارێکم لێ کرد دەربارەی قورئان بۆ ئەوە بوو تێرم بکات ، بەلاّم ڕۆیشت و هیچی نەدامێ پاشان ئەو ( أبوالقاسم ) پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ تەشریفی هێنا کاتێ بینیمی زەردەخەنەیەك گرتی زانی چی لەدڵ و ڕوخسارم دایە پاشان فەرمووی : ئەی ( ئەبو هر ) لەبەر خۆشەویستی بەو جۆرە بانگی کردووە وتم : لە خزمەتتدام ئەی پێغەمبەری خوا فەرمووی : وەرە بەدوامدا ، ڕۆیشت و چووم بەدوایدا ، چووە ماڵێك و مۆڵەتی خواست و مۆڵەتی منیشی دا ، پەرداخێ شیری دەستکەوت فەرمووی : ئەم شیرە لەکوێوە دەستکەوتووە ؟ وتیان : فلاّنە کەس بەدیاری بۆتی ناردووە ، فەرمووی : ( أبو هر ) وتم : بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا فەرمووی : بچۆ لای ( أهل الصفة ) بانگیان بکە بۆ لام ئەبو هورەیرە - خوا لێ ی ڕازی بێ – دەڵێ :

( أهل الصفة ) میوانانی ئیسلام بوون ، بێ خێزان و بێ ماڵ و بێ کەس بوون ، هەر کات خێرێ بهاتبایە بۆ پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ هیچی لێ هەڵنەدەگرت و هەمووی دەنارد بۆ ئەوان ، هەرکات دیاریەکیشی بۆ بهاتبایە هەندێکی بۆ ئەوان دەنارد و بەشداری دەکردن ، منیش ئەمەم پێناخۆش بوو ، بۆیە وتم جا ئەم چۆرە شیرە چ سودێك بە ( أهل الصفة ) دەگەیەنێ ؟ مەبەستی ئەوە بوو پەرداخێك شیر بۆ خەڵکێکی زۆر چۆن بەش دەکات ؟ ئەم شیرە بۆمن باشە ، بیخۆمەوە و گۆڕێکم بەبەردا بێنێ ، بەلاّم کە فەرمانی پێدام دەبوا شیرەکەیان بۆ بگێڕم بیرم کردەوە کە ئەم چۆرە شیرە چ سودێکی دەبێت ، بەلاّم هەر دەبێ گوێڕایەڵی خوا و گوێڕایەڵی پێغەمبەرەکەی بم ﴿ﷺ﴾ بەهەر حاڵ چووم بۆ لای ( أهل الصفة ) و بانگم کردن و هاتن و مۆڵەتیان خواست و مۆڵەت دران و لە ماڵەکەدا دانیشتن ، پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ فەرمووی : ( أبو

هر ) عەرزم کرد : بەڵێ لەخزمەتدام ئەی پێغەمبەری خوا ، فەرمووی : شیرەکە هەڵگرە و بیانده‌رێ ئەبو هورەیرە دەڵێت : پەرداخە شیرەکەم هەڵگرت و دەستم کرد بە گێرانی و یەکە یەکە دەمدا بە پیاوەکان و هەریەکەیان لێ ی دەخواردەوە تا تێر دەبوو پاشان پەرداخەکەی دەدامەوە و بەهەمان جۆر دەمدا بە یەکێکی تریان تا تێر دەبوو ئەویش دەیدامەوە بەو جۆرە تا گەیشتمە سەرەی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ پەرداخەکەی گرت و خستیە سەر دەستی ، سەیرێکی منی کرد و ، زەردەخەنەیەکی کردوو فەرمووی : ( أبو هر ) عەرزم کرد : بەڵێ لە خزمەتدام ئەی پێغەمبەری خوا ، فەرمووی: من و تۆ ماوین عەرزم کرد : ڕاست دەفەرموویت ئەی پێغەمبەری خوا ، فەرمووی : دانیشە تۆش بخۆرەوە دانیشتم و شیرەکەم خواردەوە فەرمووی : بخۆرەوە خواردمەوە بەردەوام دەیفەرموو : بخۆرەوە تا گەیشتە ئەوەی وتم : نەخێر : سوێند بەو زاتەی تۆی بەهەق ڕەوانە کردووە ، ئیتر جێ نەما تا بەڕێیکەم فەرمووی : دەی پەرداخەکەم بدەرێ ، منیش پەرداخەکەم دایە دەستی ، ئەویش سوپاس و ستایشی خوای کردوو ناوی خوای بردو پاشماوەی شیرەکەی خواردەوە.[398]

بەڕاستی تەنها ئەو موعجیزە گەورە و بەناوبانگە بەسە تا گەورەترین بەڵگە بێ لەسەر ڕاست و دروستی پێغەمبەرایەتی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ پێویستە بڕواداران بە بینینی ئەو موعجیزانە زیاتر دڵخۆش بن و بڕوایەکەیان پتەو تر بێ وە هەوڵ بدەن ئەوموعجیزە ناودارانە پێشکەش بە مرۆڤە سەرگەردانەکان بکەن کە گەورەترین دیاریە و مایەی سەرفرازی دنیا و قیامەتە .

---

[398] ( پوختەی صەحیحی بوخاری لاپەرە ٩٠٨ – ٩٠٩ ) .

## موعجیزەی ﴿٢٨٥﴾ ئافرەتەکە ناوی لە پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ نابوو موبارەك :

بەیهەقی و ئیبن عەساکیر لە ئەبوبەکرەوە - خوا لێ ی ڕازی بێ – هێناویانە کە فەرموویەتی : لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ لە مەککەوە کەوتینە ڕێ لەگەشتی کۆچکردندا تا گەیشتینە ئاوەدانیەکی عەرەب پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ سەیری ماڵێکی کرد لە کەنارەوە و ڕووی لێنا کە دابەزین ،

تەنها ئافرەتێکی لێ بوو ئەویش وتی : ئەی بەندەی خوا من ئافرەتم و کەسیشم بەلاوە نیە ، ئەگەر میوانداریتان ئەوێ بچن بۆلای سەرداری هۆز پێغەمبەری خوا﴿ﷺ﴾ بەگوێ ی نەکرد ئەمەش لای ئێوارەوە بوو کوڕێکی ئافرەتەکە چەند بزنێکی خۆی دابووە بەر و هاتەوە دایکی پێی وت ڕۆڵە ئەم بزن و چەقۆیە بەرە بۆ ئەو دوو پیاوە و پێیان بڵێ : دایکم دەڵێت : ئەم بزنە سەر ببڕن و خۆتان تێر گۆشتی لێ بخۆن و بەشی ئێمەش بدەن کاتێك هاتە خزمەتی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ فەرمووی : ﴿ انطلق بالشفرة وجئني بالقدح ﴾ واتە : چەقۆکە بەرەوە و قاپێکم بۆ بهێنە وتی : نەلەووەڕاوە و شیری تێدا نیە فەرمووی : بڕۆ کوڕەکە ڕۆیشت و قاپێکی هێنا پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ دەستی بەگوانی بزنەکەدا هێنا پاشان شیری دۆشی هەتا قاپەکەی پڕ کرد پاشان فەرمووی : ﴿ انطلق به الى أمك ﴾ واتە : بیبە بۆ دایکت ئافرەتە کە تێر شیری خواردەوە پاشان کوڕەکە قاپەکەی هێنایەوە و فەرمووی : ﴿انطلق بهذه وجئني بأخرى ﴾ واتە : ئەم بزنە بەرەوە و یەکێکی ترم بۆ بهێنە وەهاشی بەمیش کرد و ئەبوبەکری لە شیر تێر کردو بزنێکی تری هێناو وەهاشی بە میش کردو پێغەمبەریش لەشیر تێر بوو ئەو شەوە لەوێ مانەوە و پاشان کەوتینە ڕێ ئەو ئافرەتە پێغەمبەری ﴿ ﷺ﴾ ناونابوو

موبارەك ئەوەبوو مەڕەکانی ئەوەندە زۆر بوون جەڵەبێکی لێیان هێنا بۆ مەدینە لەو کاتەدا ئەبوبەکر تێپەڕی و کوڕی ئافرەتەکەش چاوی پێکەوت و ناسیەوە وتی : دایە گیان ئەمە ئەو پیاوەیە کە لەگەڵ موبارەکدا بوو ، دایکیشی هەستا بۆلای و وتی : ئەی بەندەی خوا ئەو پیاوەی کە لەگەڵتدا بوو کامەیە ؟ وتی : نازانی کێیە ؟ وتی : نەخێر، وتی : ئەوە پێغەمبەرە ﴿ ﷺ ﴾ وتی : دەبمبە بۆلای ئەبوبەکر بردیە خزمەتی و پێغەمبەریش ﴿ ﷺ ﴾ دەعوەتی کرد و دیاری پێشکەش کرد ئافرەتەکەش هەندێ کەل و پەلی ئەعرابی پێشکەش کرد و پێغەمبەریش ﴿ ﷺ ﴾ جل و بەرگی بۆ کرد و دیاری تری دایە ئەویش مسوڵمان بوو . (399)

## موعجیزەی ( ٢٨٦ ) ئوم مەعبەد و موعجیزەی گەورە و ناوداری شیرەکە :

هەر لەڕێ ی مەدینەدا پێغەمبەر و هاوەڵانی بەلای چادرەکەی ئوم مەعبەدا تێپەڕین کە لەوێش موعجیزەیەکی تری گەورە و بەناوبانگی تری پێغەمبەر ﴿ ﷺ ﴾ دەرکەوت زۆرێك لە ئیمامانی فەرمووده بەتایبەت ئیمامی بەیهەقی لە حوبەیشی برای ئوم مەعبەد و هاوەڵی پێغەمبەری خواوە ﴿ ﷺ ﴾ ریوایەتی کردووە کە وتویەتی کاتێك پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) لەگەڵ ئەبوبەکر و عامیری کوڕی فوهەیرە کۆچیان کردوو کوڕی ئورە یقیطیش ڕێگای پیشان ئەدان گەیشتنە ( قودەید ) و

لایان دایە لای ئوم مەعبەد : عاتیکەی کچی خالیدی کوڕی خولەیدی خوزاعی دا کە ئافرەتێکی پاك داوێنی بەساڵاچووی بەهێز بوو و بە بۆنەی زۆری تەمەنیەوە نەئەچۆ پەنای

---

(399) قال ابن کثیر : سنده حسن کذا في الکنز ٨/ ٣٣٠ .

پەردەوە و لەبەردەم چادرەکەیدا دادەنیشت و هەرکەس لەوێوە تێپەڕی بکردایە لـە نـان و ئـاو تێری دەکرد جا پێغەمبەر و هـاوەڵانی لـە بـەرگرانی سـاڵەکە و کـەم خـۆراکی خواردنەکـەیان تەواو بوو بوو ، لەبەر ئەوە پرسیاریان لێ کرد کە ئایا شیر یان گۆشتی بەلاوە هەیە بیکڕن ؟ کەچی هیچی بەلاوە نەبوو وتـی : بەخوا ئەگەر شتێکم بەلاوە ببوایـە دەمـامنکردە میـوانٚ داری بۆتـان پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ سەیری مەڕێکی کرد کە لەلایەکی چـادرەکەدا بـوو بـە بۆنـەی لاوازی و بێهێزییەوە لەڕان بەجێ مابوو ، پرسیاری لێکرد ( هل بهـا مـن لـبن ؟ ) واتـە : ئـەوە شیری تێدایە ؟ وتـی زۆر لاوازترە ، فەرمووی : ﴿ أتـأذنين لي أن أحلبها ﴾ واتە : ماومم دەدەی بیدۆشم ؟ وتـی : بەڵێ دایك و باوکم بەقوربانت بن ئەگەر شیری تێـدا شـك ئەبـەی بیدۆشـە .

فەرمانی دا مەڕەکەیان هێناو گرتی و دەسـتی بـەگوانی مەڕکـەدا هێنـا لـە ڕیوایـەتێکی تـردا دەستی بە پشتی داهێنا و ناوی خوای لێهێنا لە ڕیوایەتێکی تردا دوعای بەسەردا خوێند ئـیتر پێی بلاو کردنەوە و شیری تـێ هـات و داوای قـاپێکی وەهـای کـرد کـە کۆمەڵێك لـە شـیر تێـر بکات شیرێکی زۆری دۆشیە ناو قاپەکە و هاوەڵانی لە شیر تێر کردوو ئوم مەعبەدیشـی لـە شیر تێر کرد ، پاشان لە دوای هەموویان شیری خواردەوە و فەرموشی : ( ساقي القـوم أخـرهم شربـا ) واتە : ئەو کەسەی شیر دەرخواردی خەڵك ئەدات خـۆی لـەدوای هـەموویان ئەخواتـەوە پاشان جارێکی تر قاپەکەی پڕکردەوە و هـەر هـەموویان دووبـارە خواردیانـەوە و پاشـان بـۆ سێهەم جار پڕی کردەوە لە لای ئوم مەعبەد جێی هێشت لە ڕیوایەتێکی تـردا پێـی دەفـەرمووێ : ( ارفعي هذا لأبي معبد اذا جاءك ) واتە : ئەمەش هەڵگرە تـا ئەبو مەعبـەد بێتـەوە پاشـان سواری وڵاغەکانیان بوون و ڕۆیشـتن زۆری پێنەچـوو ئـەبو مەعبـەدی مێـردی هاتـەوە و چـەند بزنێکی لاوازیش لەبەردەمیەوە لەبەر لاوازی لارە لار بـەڕێوە ئەچـوون و ئێسقانیشـیان مـۆخی تێدا نەمابوو کە ئەبو مەعبەد چاوی بەشیرەکە کەوت سەری سوڕما و وتـی : ئوم مەعبەد ئـەوە چیە ؟ ئەمەت لەکوێ بوو ؟ خـۆ مەڕەکـە نەلـەوەڕاوە و سکیشـی پـڕ نیـە و مـەڕی شـیر دەریـش

لەماڵدا نیە وتی : نا بەخوا بەڵام پیاوێكی موبارەك كە ئاوەها و ئاوەها بوو لێرەوە تێپەری كردوو وتی : ئوم مەعبەد وەصفی بكە بۆم بە سەلیقەیەكی یەكجار زۆر وردەوە وەصفی پێغەمبەری خوای ﴿ ﷺ ﴾ كرد وتی : ( رأيت رجلا ظاهر الوضاءة ، مبلج الوجه ، حسن الخلق ، لم تعبه ثجلة ، ولم تزربه صحلة ، وسيم قسيم ، في عينيه دعج ، وفي أشفاره وطف ، وفي صوته صحل ، أحور ، أكمل ، أزج ، أقرن ،شديد سواد الشعر ، في عنقه سطح ، وفي ليحيته كثاثة ، اذا صمت فعليه الوقار ، واذا تكلم سما وعلاه البهاء ، وكأن منطقه خرزات نظم يتحدرن ، حلوالمنطق ، فصل ، لانزر ولا هذر ، أجهر الناس ، وأجمله من بعيد ، وأحلاه وأحسنه من قريب ، ربعة لاتشنؤة من طول ، ولا تقتحمه عين من قصر ، غصن بين غصنين ، فهو أنضر الثلاثة منظر ، وأحسنهم قدرا ، له رفقاء يحفون به ،

إذا قال استمعوا لقوله ، وإذا أمر تبادروا لأمره، محفود محشود ، لا عابس ، ولا مفند ) واتە : پیاوێكم دی كە دیمەنی جوان و ڕێك و پێك و ، دەم و چاوی گەشاوە و ڕەوشت جوان بوو ئەوەندە ورگی نەبوو كە بۆی عەیبە بێ كە ناشیرنی بكات ئەوەندەش سەری بچووك نەبوو، جوان و پێ كەوتوو بوو ، چاوەكانی زۆر ڕەش و برژانگی چاوەكانیشی درێژبوون ، دەنگی كەمێك گربوو ، بەڵام بەناسكی ، سپیایی چاویشی زۆر سپی و پێڵوەكانی ڕەش و برۆی درێژ و باریك و هەردوو برۆی بەیەكەوە نووسابوون ، قژی سەری یەكجار ڕەش و ، ملی بەرز و درێژ ، ڕیشی پان و پڕ بوو ، گەر بێدەنگ بوایە ویقاری پێوە دیاربوو ، گەر فەرمایشتیشی بكردایە گەوهەری لەدەم دەباری ، وەك دوڕڕ و یاقووت بە شێوەیەكی جوان بهۆنێتەوە ، پیاوێكی زمان شیرن بوو، لەسەرخۆ فەرمایشتی دەفەرموو ، نە كەم گۆ و نە فرە گۆ بوو ، بەبێ زیادەڕۆی دەنگی لەهەمووان بەرزتر بوو ، لە دوورەوە لەهەموو كەس جوان تر و ، لە نزیكیشەوە لەهەموو كەس شیرین تر و چاك تر بوو ، چوار شانەیەك بوو كەلەبەر باڵا بەرزی كورتە باڵایی لەبەرچاو نەدەكەوت ، لقی گوڵێكە لەنێوان دوو لق دا ، كە ئەو لەسێ كەسەكەدا

گەشاوەترین دیمەن و چاکترین ڕێزی هەیە ، کۆمەڵە هاوڕێیەکی هەن کە دەورەی لێئەدەن ، گەر فەرمایشت بکات ئەوانە گوێ ی بۆ دەگرن و گەر فەرمانیش بکات بە پەلە ئە نجامی ئەدەن ، پیاوێکە کە هاوەڵانی خزمەتی ئەکەن و ، قەڵەباڵغی بەدەوردایە ، نە ڕوو گرژوو نە گلەیکەرە ئەبو مەعبەد وتی : بەخوا ئەوە کاکەی قوڕیشیەو ، گەر بە خزمەتی بگەیشتمایە شوێنی دەکەوتم و تا بۆشم بکرێ هەوڵی ئەوە ئەدەم . [400]

## موعجیزەی ( ٢٨٧ ) کە دەستی موبارەکی بە گوانی مەڕەکە داهێنا شیر هات پاشان بە گوانەکەی فەرموو کۆبەرەوە ئەویش کۆبوویەوە :

ئەحمەد لەئیبن مەسعودەوە هێناویەتی دەڵێت : من مەڕم دەلەوەڕاند بۆ عوقبەی کوڕی موعیت ، پێغەمبەر ﴿ ﷺ ﴾ بەلامدا هات و ئەبوبەکری لەگەڵدا بوو ، پێغەمبەر ﴿ ﷺ ﴾ فەرمووی : ﴿ یاغلام هل من لبن ؟ ﴾ واتە : غولام هیچ شیر هەیە ؟ وتم بەڵێ ، بەڵام هی خۆم نیە ، فەرمووی : ئەی مەڕێ هەیە بەران نەچووبێتە سەری ، منیش مەڕێکم هێنا پێغەمبەر ﴿ ﷺ ﴾ دەستی هێنا بەگوانیدا و شیر هات کردیە قاپێك و لێی خواردوو بەشی ئەبوبەکری دا پاشان بە گوانەکەی فەرموو : ﴿ أقلص ﴾ واتە : کۆبەرەوە ، ئەویش کۆبویەوە ، پاشان دوای ئەوە هاتم بۆلای وتم ئەی پێغەمبەری خوا پێم بڵێ ئەو قسەیە چی بوو ؟ ئەویش دەستی هێنا بەسەرمدا و فەرمووی : ئەی غولام ڕەحمەتی خوات بەرکەوێت ، چونکە تۆ زانا و فێر خوازیت ﴾ بەیهەقی بەو واتایە لێوەی هێناوە و تیایدا دەڵێت :

---

[400] شرح المواهب ١/٤١٠ – ٤١٦ البداية والنهاية : ٢/١٩٢ – ١٩٣ .

سەرە مەڕێکم هێنا و ئەویش ڕایگرت و دەستی هێنا بەگوانیدا نزایکرد ئەبوبەکریش تەشتێکی بۆ هێنا ، پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ شیرەکەی کردە ناوی بەشی ئەبوبەکری دا و دواتر خۆی شیرەکەی خواردەوە.[401]

## موعجیزەی ( ٢٨٨ ) کوندە ئاوی پیرەژنەکە و دەرکەوتنی نیشانەیەکی گەورەی پێغەمبەرایەتی :

عیمرانی کوڕی حصین - خوا لێ ی ڕازی بێ – دەڵێت : ئێمە لەگەشتێکدا لەخزمەت پێغەمبەردا ﴿ﷺ﴾ بووین ، شەو ڕەویمان دەکرد هەتا کۆتایی شەو ، خەو دایگرتین ، هیچ خەوێك ئەوەندە خۆش نیە بۆ کاروانچی ، لەخەو خەبەرمان نەبوویەوە هەتا گەرمای خۆر هەڵی سساندین ، یەکەم کەس کە لەخەو هەستا فلأنەکەس بوو پاشان فلأنە کەس ، پاشان عومەری کوڕی خەتتاب - خوا لێ ی ڕازی بێ – چوارەم کەس بوو ، پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ کاتێ دەنووست کەس خەبەری نەدەکردەوە هەتا خۆی هەڵدەستا ، چونکە نەماندەزانی لە خەوەکەیدا چی دەبینێت کاتێ عومەر هەستا و بینی چی بەسەر ئەو خەڵکە هاتووە ، پیاوێکی توند و تۆڵ و چالاکیش بوو ، تەکبیری کردوو دەنگی بەرز کردەوە ، بەردەوام تەکبیری دەکرد بەدەنگی بەرز ، هەتا پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ بەدەنگی ئەو خەبەری بوویەوە ، کاتێ خەبەری بوویەوە سکاڵأیان کرد لەخزمەتیدا ، لەوەی کە بەسەریان هاتووە ، فەرمووی : ( قەیناکا زەرەری نیە ) ئیتر ڕێکەوتن ، ڕۆیشتن دوورکەوتنەوە ، پاشان دابەزی و داوای ئاوی دەستنوێژی کرد ، بانگدرا بۆ نوێژ ، پێشنوێژی بۆ کردین ،کاتێك لە نوێژکە بوویەوە

---

[401] حدیث حسن لە ( البدایة والنهایة ج٦ ص١٠٢ ) دا هاتووە .

دەبینێت پیاوێك گۆشە گیرە و نوێژی لەگەڵ ئەوان نەکردووە ، فەرمووی : ( چی ڕێگر بووە ئەی فلان کەنوێژ لەگەڵمان نەکەیت ؟ ) وتی : تووشی لەشگرانی بووم و ئاویش نیە ، فەرمووی : ( ئەوە خۆڵ و خۆڵت بەسە ) پاشان پێغەمبەر ﴿ ﷺ ﴾ کەوتە ڕێ ئینجا خەڵکەکە سکالآیان کرد لە تینوێتی؟ دابەزی و بانگی فلانی کرد بانگی عەلی - خوا لێ ی ڕازی بێ - کرد و فەرمووی : ( بڕۆن بگەڕێن بەدوای ئاودا ) بۆی دەرچوون گەیشتن بە ئافرەتێك کە دوو کوندە ئاوی پێبوو بە سەر و شترێکەوە ، پێیان وت : کەواتە وەرە بابڕۆین ، وتی بۆ کوێ ؟ وتیان بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا ﴿ ﷺ ﴾ وتی : ئەوەی کە پێی دەڵێن صابیئی ؟ وتیان ئەوەیە کەتۆ مەبەستە ، با بڕۆین بۆ خزمەتی ، هێنایان بۆ خزمەت پێغەمبەر ﴿ ﷺ ﴾ قسەکانیان بۆ گێڕایەوە ، فەرمووی : ( لەسەر وشترەکەی دایگرن ) پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ داوای قاپێکی کرد ، دەمی کوندەکەی کردەوە و ئاوی لێ ڕۆ کرد ، ئینجا بانگی خەڵکەکەیان کرد ئاو بخۆنەوە و ئاویش هەڵگرن ، هەندێك خواردیانەوە و هەندێکیش ئاویان هەڵگرت ، دواین کەس قاپێکیان دا بەو کەسەی کە لەشی گران بوو ، فەرمووی : بچۆ ئەم ئاوە بکە بەخۆتا ) ئافرەتەکەش ڕاوەستاو سەیری دەکات کەچی دەکەن بە ئاوەکەی ، سوێند بەخوا لەڕاستیدا وامان بەرچاوکەوت کە ئێستا زۆرتری تێدایە لەوکاتەی کە هێنای ، ئینجا پێغەمبەر ﴿ ﷺ ﴾ فەرمووی : ( شتێکی بۆ کۆبەنەوە ) ئینجا هەندێ ئارد و شیر و خۆراکیان بۆ کۆکردەوە و کردیانە جلێکەوە ، خستیانە سەر پشتی وشترەکەی و جلەکەشیان خستە بەردەست ، ئەوسا فەرمووی : ( دەزانی ئێمە هیچمان لە ئاوەکەی تۆ لا نەداوە، خوای گەورە ئاوی دەرخوارداوین ) ئینجا گەڕایەوە بۆ ناو کەس و کارەکەی کە دوا کەوتبوو لە گەڕانەوەی بۆ لایان ، وتیان : چی دوای خستی ئەی فلان ؟ وتی : سەیر و سەمەرە ، دووپیاو پێم گەیشتن ، بردمیان بۆلای ئەوەی کە دەڵێن بووە بە ( صابئة ) بەو کەسە دەڵێن کە لەئاینی باب و باپیری لادەدا ) ئەویش ئاوا و ئاوای کرد ، سوێند بەخوا ئەوەیان چاوبەسی لەخەڵکی دەکرد لەنێوان ئەمە و

ئەوەدا - بەهەردوو پەنجە ئاماژەی بۆ ئاسمان و زەوی کرد- یان لەڕاستیدا ڕەوانەکراوی خوایە ، دوای ئەوە مسوڵمانەکان کاتێك هێرشیان دەبرد بۆ سەر موشریکەکانی ئەو دەور و بەرە ، نەدەچوونە سەر ئەو خێڵەی ئافرەتەکەیان تێدا بوو ، ئینجا ئافرەتەکە وتی بە قەومەکەی: وانابینم کە ئەو قەومە واتە : ( مسوڵمانەکان ) زۆرتان لێبکەن تا مسوڵمان بن ، ئەی باشە ناتانەوێ مسوڵمان بن ؟ ئەوسا بەگوێیان کردوو هەموویان مسوڵمان بوون . (402)

بەڕاستی موعجیزەیەکی زۆر گەورە و ناوداره .

## موعجیزەی ( ٢٨٩ ) مەسینەکەت بپارێزە بۆمان لەبەرئەوەی ناوبانگێکی گەورەی دەبێت :

ئەبو قەتادە - خوا لێ ی ڕازی بێ - دەڵێ پێغەمبەری خوا ﴿ ﷺ ﴾ وتاری بۆ دەداین فەرمووی : ( ئێوە بەڕێگاوەن ئەمشەوەتان ، خوا حەزکات سبەینێ دەگەن بەئاو ) خەڵکەکە دەرچوون ، کەس لای نەدەکردەوە بۆ کەس ، ئەبو قەتادە دەڵێ : لە کاتێکدا پێغەمبەری خوا ﴿ ﷺ ﴾ بە ڕێگادا دەڕۆیشت هەتا نیوەی شەو ڕۆیشت و منیش لە تەنیشتیەوە بووم دەڵێ: پێغەمبەر ﴿ ﷺ ﴾ وەنەوزی دەدا ، لاربوویەوە لەسەر وڵاغەکەی دەڵێ : منیش خێرا ڕاستم کردەوە و خەبەریشم نەکردەوە دەڵێ : ئینجا ڕۆیشت هەتا زۆربەی شەوەکە ڕۆیشت دووبارە بەسەر وڵاغەکەیەوە لاربوویەوە دەڵێ : ڕاستم کردەوە لەسەر وڵاغەکەی بەبێ ئەوەی خەبەری بکەمەوە ، ئینجا ڕۆیشت هەتا کاتی کۆتایی پارشێو ، ئەمجارەیان زۆر لاربوویەوە زیاتر

---

(402) پوختەی صەحیحی بوخاری لا پەڕە ٩٩ — ١٠١ .

لەدووجارەکەی پێشوو هەتا خەریك بوو بکەوێتە خوارەوە خێرا هاتم راستم کردەوە سەرزی بەرزکردەوە فەرمووی : ئەوە کێیە ؟ ئەبو قەتادە دەڵێ فەرمووی
لەکەیەوە ئاوا لەگەڵ مندای لە رێگادا؟ وتم : هەموو ئەمشەو لە خزمەتتدا بووم ، فەرمووی : ( خوا بتپارێزێت چۆن تۆ پارێزگاری پێغەمبەرەکەت کرد ) ئینجا فەرمووی : ( ئایا وا دەبینی ئێمە دیار نەبین لە خەڵکیەوە ؟ ) ئینجا فەرمووی : ئایا کەس دەبینی ؟ وتم : ئەوە سوارێکە ، ئینجا وتم : ئەوە سوارێکی ترە هەتا کۆبووینەوە بووینە حەوت کەس ، دەڵێ : پێغەمبەر ﴿ ﷺ ﴾ لە رێگاکە لایدا سەری خستە سەر زەوی ، ئینجا فەرمووی : ( ئاگاتان لە نوێژەکانتان بێت ) یەکەم کەس کە هەستا پێغەمبەری خوا بوو ﴿ ﷺ ﴾ خۆریش لە پشتیەوە بوو ، دەڵێ : خێرا هەموو هەستاین بە شڵەژاوی ، ئینجا فەرمووی : ( سواربن ) ئێمەش سواربووین و کەوتینە رێ هەتا خۆر بەرز بوویەوە دابەزی ، ئینجا داوای مەسینەیەکی کرد کە من پێم بوو کەمێك ئاوی تێدا بوو ، دەڵێ : سوکە دەست نوێژێکی گرت ، کەمێك ئاوی تێدا بوو ، ئینجا بە ئەبو قەتادەی فەرموو : ( مەسینەکەت بپارێزە بۆمان ئەوە ناوبانگێکی گەورەی دەبێت ) ئینجا بیلال بانگی داو پێغەمبەر ﴿ ﷺ ﴾ دوو رکات نوێژی کرد ، پاشان نوێژی بەیانی کرد ، هەروەکو رۆژانی رابردوو دەڵێ : پێغەمبەر ﴿ ﷺ ﴾ سوار بوو ، ئێمەش لەگەڵیا سوار بووین دەڵێ : هەندێکمان بە چپە بەهەندێکمان وت : ئایا کەفارەتی ئەوەی کە نوێژەکەمان دوا خستبوو دەبێ چی بێت ؟ ئینجا فەرمووی : ( ئایا من سەر مەشق نیم بۆ ئێوە ) پاشان فەرمووی : ( ئاگادار بن خەوتن نابێتە کەمتەرخەمی ، بەڵکو کەمتەرخەمی ئەوە : کەسێك نوێژێك نەکات هەتا کاتی نوێژێکی تر دێت ، هەرکەس وای کرد با هەرکاتێ بیری کەوتەوە نوێژەکە بکات ئەگەر کەوتەوە سبەینێ با لەکاتەکەی خۆیدا بیکا ) پاشان فەرمووی : ( ئەو خەڵکە چیان کرد؟ ) ئینجا فەرمووی : خەڵکی رۆژیان لێبوویەوە ، پێغەمبەرەکەیان لێ ون بوو بوو ئەبوبەکر و عومەر – خوایان لێ ی رازی بێ – وتیان :

پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ لەدواتانەوەیە ، ئەو زۆر دووناکەوێ لێتان ، خەڵکەکە وتیان : پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ لێتان پێشکەوتووە ، ئەگەر گوێڕایەڵی ئەبوبەکر و عومەر بن بەهەڵە داناچن ، قەتادە دەڵێ : زۆری پێنەچوو گەیشتین بە خەڵکەکە ، کاتێ خۆر بەرز بوویەوە هەموو شتێ گەرم بوو بوو خەڵك دەیان وت : ئەی پێغەمبەری خوا﴿ﷺ﴾ فەوتاین ، تینومانە ، فەرمووی : ( نافەوتێن ) ئینجا فەرمووی : ( جامەکەم بۆ دەربێنن ) داوای مەسینەکەی کرد ، پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ ئاوی ڕۆکردە جامەکە و ئەبو قەتادە دەیدانێ کاتێ خەڵکی مەسینەکەیان بینی کەڵەکەیان کرد لەسەری پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ فەرمووی : ( باش پڕی کەن ، هەمووتان تێر ئاو دەبن ) قەتادە دەڵێ : بەقسەیان کرد ، پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ ئاوی ڕۆکردوو منیش ئاوەکەم دەدانێ هەتا کەس نەما من و پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ نەبێ ، دەڵێ : ئینجا ئاوی تێکردوو بەمنی فەرموو : بخۆرەوە ، منیش وتم : ناخۆمەوە هەتا تۆ نەخۆیتەوە ئەی پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ فەرمووی : ( ئاو دێری خەڵکی دەبێ لەدوای هەموویان بخواتەوە ) منیش خواردمەوە ئینجا پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ خواردیەوە ، ئینجا خەڵکەکە تێر ئاو بوون و پشوویان دا ، عەبدوڵلای کوڕی ڕەباح دەڵێ : من لەمزگەوتدا ئەوە فەرموودەیەم بۆ خەڵکەکە دەگێڕایەوە عیمرانی کوڕی حوصەین وتی : وریابە ئەی گەنج بزانە چۆن ئەو فەرموودەیە دەگێڕیتەوە لەڕاستیدا من یەکێك بووم لەو کاروانەی ئەو شەوە، عەبدوڵلا دەڵێ وتم : کەواتە تۆ زاناتری بەم فەرموودەیە وتی : تۆ کێی ؟ وتم : لە ئەنصارەکانم، وتی : کەواتە تۆ بیگێڕەرەوە ،ئێوە زاناترن بە فەرموودەکەتان دەڵێ: گێڕامەوە بۆ خەڵکەکە عیمران وتی : لەو شەوەدا من لەوێ بووم واهەستم نەکردووە کە کەسێك هەبێت لەمن باشتر ئەو فەرموودەیەی لەبەر کردبێت . (403)

---

(403) پوختەی صەحیحی موسلیم لاپەڕە ١٣٨ .

بەڕاستی بەتەنها ئەو موعجیزە گەورە و ناوداره بەسە کە گـەورەترین بەڵگەیـە و وەك ڕۆژی ڕوونـاك پێغەمبەرایەتی پێغەمبەر ﴿ ﷺ ﴾ دەسەلمێنێ و ئاسـوودەیی و دڵنیـایی تـەواو دەبەخشێت بـە دڵ و دەروون .

## موعجیزەی ( ٢٩٠ ) کانیاوەکەی تەبووك بەڵگەیەکی ڕوون و ئاشکرای پێغەمبەرایەتیە :

مەعازی کوڕی جەبەل - خوا لێ ی ڕازی بێ - دەڵێ : دەرچووین لە خزمەت پێغەمبـەردا ﴿ ﷺ ﴾ سـاڵی غـەزای تـەبووك ، نوێـژەکانی کـۆدەکردەوە نیـوەڕۆ و عەسـری پێکـەوە کـرد ، مەغریب و عیشایشی پێکەوە کرد ، هـەتا ڕۆژێـك نوێژەکـەی دوا خسـت ، لـە پاشـدا دەرچـوو مەغریب و عیشـای پێکـەوە کـرد ، ئـەمجا فـەرمووی : ( ئێـوە سبەینێ – ان شـاألله تعـالی – دەگەنە سەر کانیاوی تەبووك ، ناشگەنە ئەوێ کە خـۆر بـەرز دەبێتـەوە ، هەرکـەس لـە ئێـوە چووە سەری دەست نەدا لەئاوەکەی تا خۆم دێم ) گەیشتینە سەر کانیەکەو دوو پیاومان پـێش ئێمە کەوتبوون ، ئاوەکە وەك سیرمەی کەوش باریك بوو ، کەمێ ئاوی لێ هەڵدەقولا ، مەعـاذ دەڵێ : پێغەمبەر ﴿ ﷺ ﴾ لەو دوانـەی پرسـی ( ئایـا دەسـتتان داوە لـە ئاوەکـە ؟ ) وتیـان بـەڵێ ، پێغەمبـەر ﴿ ﷺ ﴾ ئەوەنـدەی خـوا حـەزیکات قسـەی پـێ وتـن دەڵـێ : لە پاشـان خەڵکەکە بەدەسـتیان کـەم کـەم لـە کانیاوەکـەیان هەڵگۆسـت و هـەتا کۆبوویـەوە لەشتێکدا مـەعـاذ دەڵـێ : پێغەمبـەری خـوا ﴿ ﷺ ﴾ لـەو شـتەدا هـەردوو دەسـت و دەم وچـاوی شـۆرد ، لە پاشدا ئاوەکەی ڕۆکردەوە ناو کانیەکە ،کانیەکە تەقی بە ئاوێکی لافـاو ، یـان وتـی : زۆر باوکی عەلی لە گوماندایـە کامیـانی فـەرموو هـەتا خـەڵك گشـتی ئـاوی خـواردەوە ، ئـەمجا

فەرمووی : ( ئەی مەعاذ دوور نیە ئەگەر تەمەنت درێژ بوو ئەم دەڤەرە ببینیت پڕبووە لە باخ و باخات . (404)

## موعجیزەی ( ٢٩١ ) هەڵقوڵانی ئاو لەناو پەنجە پیرۆزەکانی پێغەمبەر ﴿ ﷺ ﴾ :

لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە - خوا لێ ی ڕازی بێ - دەڵێ کە پێغەمبەری خوا و ﴿ ﷺ ﴾ یارەکانی لە ( زوراء ) دا بوون، دەڵێ ( زوراء ) جێگایەکە لەمەدینە لای بازاڕ و مزگەوتدایە لە کاتێکدا لەوێ بوو بانگی کرد جامۆڵکەیەك ئاوی بۆ بهێنن لە پی خستە ناو ئاوەکە ، ئاو لەنێوان پە نجەکانی هەڵدەقولا ، هەموو یارەکانی دەستنوێژیان گرت ، ( قەتادە ) دەڵێ : وتم چەند کەس بوون ئەی باوکی حەمزە ؟ واتی ئەندازەی سێ صەد کەس دەبوون ، بەڕاستی زۆر سەیرە و جێگای سەر سوڕمانە کە بەدبەختانی سەر لێشێواو و دوور لەدین سەرمڕای بوونی ئەو موعجیزە گەورانە کەچی ڕێگەی ڕاست ناگرنە بەر و واز لەسەرکەشی و گومڕایی ناهێنن . (405)

---

(404) پوختەی صەحیحی موسلیم لاپەڕە ٧٤٣ — ٧٤٤ .

(405) پوختەی صەحیحی موسلیم لاپەڕە ٧٤٢ .

## موعجیزەی (٢٩٢) هەر کە پێغەمبەر ﴿ ﷺ ﴾ دەستی خستە ناو کوندەکەوە یەکسەر ئاو لەنێوان پەنجەکانیەوە وەك کانی هەڵدەقولا :

لە صەحیحی بوخاری و موسلیمدا چەسپاوە کە لەسالیمی کوڕی ئەبولجوعد لە جابیری کوڕی عەبدوڵلاوە دەگێڕێتەوە و دەڵێ : لەڕۆژی حودەیبییەدا خەڵك زۆریان تینوو بوو ، پێغەمبەریش ﴿ ﷺ ﴾ کوندەیەك ئاوی لەبەر دەستدا بوو دەستنوێژی لێگرت ، ئینجا خەڵکەکە هەموو بەرەو ڕووی پێغەمبەر ﴿ ﷺ ﴾ ڕۆیشتن ئەویش فەرمووی : ( چی ڕوویداوە ؟ ) وتیان : ئاومان لانیە چ بۆ دەست نوێژ چ بۆ خواردنەوە مەگەر ئەوەی بەردەستت ، پێغەمبەریش﴿ ﷺ ﴾ دەستی خستە ناو کوندەکەوە یەکسەر ئاوی لەنێوان پە نجەکانیەوە وەك کانی هەڵقولا ئێمەش تێرمان لێخواردەوە و دەستنوێژمان لێگرت ، سالم دەڵێت: لە جابیرم پرسی : چەند کەس بوون ؟ لە وڵامدا وتی : ئەگەر سەد هەزار کەسیش بوینایە بەشی دەکردین . هەزار و پێنج سەد کەس بووین .[406]

( الله أكبر ) لەو موعجیزە گەورە و ناوداره بەڕاستی دەبوو ئەوانەی کە لەوپەڕی گومان و دوودڵی دان و دوورن لە ئیسلام کە ئەو موعجیزەیان بەرچاو دەکەوێ دەبوو بەتەواوی دڵنیا بن و گومان و دوودڵی لاچێ لە ناو دڵەکانیان .

---

(406) صحيح رواه البخاري و مسلم .

## موعجیزەی ( ٢٩٣ ) دەستی پیرۆزی لە تەشتەکە هەڵگرت هێشتا هەر پڕبوو :

صەحیحی بوخاری و موسلیم و صەحیحەکانی تر لە غەزای ( بواط ) دا دەگێڕنەوە کە جابیر وتوویەتی: پێغەمبەر ﴿ ﷺ ﴾ بەمنی فەرموو : ( ناد بوضوء ) واتە : داوای ئاوی دەست نوێژ لە خەڵك بکە ، عەرزم کرد : ئاو دەست ناکەوێ ، پێغەمبەریش ﴿ ﷺ ﴾ داوای ئاوێکی زۆر کەمی کرد ، بۆیان هێناو دەستی خستە ناوی و شتێکی لەبەر خۆیەوە فەرموو نازانم چی بوو پاشان فەرمووی : ( ناد بجفنة الركب ) واتە : داوا بکە تەشتێك بهێنن ، منیش هێنام و لەبەردەستیدا دامنا جابیر دەڵێ : پێغەمبەر ﴿ ﷺ ﴾ دەستی خستە ناو تەشتەکەوە و پەنجەکانی تێدا بلأوکردەوە و ئینجا جابیر ئاوەکەی کرد بەسەر دەستی پێغەمبەردا ﴿ ﷺ ﴾ و پێغەمبەریش ﴿ ﷺ ﴾ فەرمووی : ( بسم الله ) جابیر دەڵێ : دەمبینی ئاو لەنێوان پەنجە پیرۆزەکانیەوە هەڵدەقولا هەتا تەشتەکەی پڕ کرد ، ئینجا فەرمانی دا خەڵکەکە بێن ئاو ببەن ، ئەوانیش تا تێر ئاو بوون لێیان خواردەوە ، منیش وتم : ئایا کەس نەماوە پێویستی بە ئاو بێت ؟ ئینجا پێغەمبەر ﴿ ﷺ ﴾ دەستی لەتەشتەکە هەڵگرت هێشتا هەر پڕبوو.(407)

---

(407) صحيح رواه مسلم في حديث طويل .

## موعجیزەی (٢٩٤) بیره ئاوەکەی حودەیبییە و ڕوودانی موعجیزەیەکی گەورە :

ئیمامی بوخاری لە ( بەرڕ ) و سەلەمەی کوڕی ئەکوەعەوە و کتێبە صەحیحەکانی تریش لە چەند ڕێیەکی ترەوە دەگێڕنەوە کە ئەو هاوەڵانە دەڵێن : لە ڕۆژی حودەیبییەدا هەزار و چوارسەد کەس دەبووین حودەیبییەش بیرێکە هەڵمان گۆزی و دڵۆپێک ئاومان تێدا نەهێشت ئینجا پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ لەسەر لێواری بیرەکە دانیشت و داوای ئاوی کرد ، بۆیان هێنا پاشان دەمی پیرۆزی بە ئاوەکە تەڕکردوو ئینجا کردیەوە ناو بیرەکە ئێمەش زۆرمان پێنەچوو ئاومان لێ هەڵگۆزی بەجۆرێ کە خۆمان و وڵاخەکانمان تێراوبووین .[408] ( بەرڕ ) دەڵێ : پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ فەرمانی دا دۆڵچەیەك ئاوی بۆ بهێنن ، ئەویش ئاوی دەمی پیرۆزی خۆی تێکردوو دووعای بەسەردا خوێند پاشان دۆڵچە ئاوەکەی کردە ناو بیرەکەوە ئیتر بیرەکە تەقیەوە و تا لێواری پڕ بوو لەناو خەڵکەکەش تێریان لێخواردەوە و وڵاخەکانیشیان لێ ئاودا .

بەڕاستی ئەوە موعجیزەیەکی ئەوەندە گەورەیە کە وەك ڕۆژی ڕووناك بە بێ گومان و دوو دڵی پێغەمبەرایەتی پێغەمبەری ئیسلام ﴿ﷺ﴾ دەسەلمێنێ ، هەزاران دروود بۆ گیانی پاکی ئەم پێغەمبەرە پایەدارە خاوەنی موعجیزاتی گەورە و ناوادر .

---

[408] صحيح رواه البخاري ومسلم وأحمد .

## موعجیزەی ( ٢٩٥ ) لەسەر سوپاکەش نەبێ بەولاوە نەباری :

ئیبن خوزەیمە فەرموودەکەی ئیمامی عومەر - خوا لێ ی ڕازی بێ - لەبارەی ( جیش العسرة ) وە دەگێڕێتەوە و باسی ئەوە دەکات کە ئەوەندە تینوێتی تەنەگی پێهەڵچنیبوون پیاوی وا هەبوو لەناچاریدا وشترەکەی سەردەبڕی و ئاوەکەی ناو گەدەی دەخواردەوە ، لەوکاتەدا ئەبوبەکر - خوا لێ ی ڕازی بێ - داوای لە پێغەمبەر ﴿ ﷺ ﴾ کرد دووعا بکات پێغەمبەریش ﴿ ﷺ ﴾ دەستەکانی بەرز کردەوە و داینەنان تا هەور ڕووی ئاسمانی گرت و ئەوەندە باری تا دەفرەکانیان لێ پڕکرد ، لەسەر سوپاکەش نەبێ بەولاوە نەباری . (409)

## موعجیزەی ( ٢٩٦ ) ئەوانەی دەست نوێژیان گرت لە ئاوەکە خەملاندم بە حەفتا تا هەشتا کەس :

ئەنەس - خوا لێ ی ڕازی بێ- دەڵێت : پێغەمبەر ﴿ ﷺ ﴾ داوای دەفرێك ئاوی کرد قاپێکی دەم پانیان بۆ هێنا کەمێك ئاوی تێدا بوو ، پەنجەی خستە ناو ئاوەکە ، منیش سەیرم کرد لەنێوان پەنجەکانیەوە ئاو هەڵدەقولا ، ئەوانەی دەست نوێژیان گرت لەو ئاوە خەملاندم بە حەفتا تا هەشتا کەس . (410)

---

(409) حديث صحيح رواه البزار والطبراني وابن خزيمة وابن حبان والحاكم والبيهقي .

(410) پوختەی صەحیحی بوخاری لا پەڕە ٧٨ .

## موعجیزەی ( ٢٩٧ ) پەڵە هەورێك هاتوو تێراوی کردن پاشان لەباران بارین کەوت :

لە غەزایەکی پێغەمبەردا﴿ ﷺ﴾ خەڵکەکە تینوویان بوو ، ئیمامی عومەریش - خوا لێ ی ڕازی بێ- داوای لە پێغەمبەر ﴿ ﷺ﴾ کرد دووعا بکات ، ئەویش دووعای کرد پاشان پەڵە هەورێك هات و تێراوی کردن و پێویستی نەهێشتن ، پاشان لەباران کەوت وەك بڵێی هەورەکە فەرمانی پێدرابوو تەنها ئەو سوپایە تێراو بکات .[411]

بەڕاستی موعجیزەیەکی گەورەیە .

## موعجیزەی (٢٩٨ ) فەرمووی ئادەی وەرن بۆ دەست نوێژگرتن و بەرەکەت لە خواوە :

ئەبو نەعیم لە ( دلائل ، ١٤٤ ) لەئیبن مەسعودەوە هێناویەتی دەڵێت: لەگەڵ پێغەمبەر ﴿ ﷺ﴾ لە سەفەرێکدا بووین کە کاتی نوێژ هات و تەنها شتێکی کەممان پێبوو لەناو پێغەمبەر ﴿ ﷺ﴾ داوای بڕێ ئاوی کردوو کردیە ناو تەشتێك و دەستی خستە ناوی ئاو لە نێوان پەنجەکانیەوە هەڵدەقوڵا ، پاشان هاواری کردوو فەرمووی : ( الا هلم الی الوضوء والبرکة من الله ) واتە : ( ئادەی وەرن بۆ دەست نوێژگرتن و بەرەکەت لە خواوە ) خەڵکی هاتن و دەستنوێژیان گرت و منیش دەست پێشخەریم دەکرد بۆ ئاوەکە و دەمکردە ناو سکم لەبەر فەرمایشتی ( والبرکة من الله ) [412]

---

[411] رواه البیهقي والحاکم وصحیحه

[412] بوخاری بەهەمان شێوە لێوەی هێناوەوە لە ( البدایة والنهایة ج٦ ، ص٩٧ ) دا هاتووە .

## موعجیزەی( ٢٩٩ )نیشانەیەکی گەورەی پێغەمبەرایەتی لەبارەی ئاوەوە:

ئەنەس - خوا لێ ی ڕازی بێ – دەڵێت : کاتی نوێژ هات هەرکەس لە مزگەوتەوە نزیک بووین هەموو هەستان چوون بۆ ماڵەوە بۆ دەستنوێژ شۆردن چەند کەسێك مانـەوە ، دەفرێکی بەردینیان هێنا بۆ پێغەمبەر ﴿ ﷺ﴾ کە ئاوی تێدا بوو ، دەستی خستە ناو ، بەلام ئەوەندە بچووك بوو نەیدەتوانی لە پی دەستی لەناویدا بنێت ، خەڵکەکە هەموویان دەستنوێژیان لـەو ئاوە شۆرد وتیان : چەند کەس بوون ؟ وتی : زیاتر لە هەشتا کـەس دەبـوون .(413) بەڕاستی موعجیزەیەکی گەورەیە سوپاس بۆ خوای گەورە وە درووود بۆ گیانی پاکی پێغەمبەرەکەی ﴿ﷺ﴾ .

## موعجیزەی (٣٠٠) قاپە پێستەکەی بەردەستی پێغەمبەر (ﷺ) هەزار و پێنج سەد کەس ئاویان لێ خواردەوە و دەستنوێژیان لێگرت :

بوخاری لە جابری کوڕی عەبدوڵلاوە ( خوایان لێ ڕازی بێ ) هێناویەتی دەڵێت : خەڵکی ڕۆژی هەیینی تینوبوون و پێغەمبەر ( ﷺ ) قاپە پێستەیەکی لەبەر دەستدا بوو دەست نوێژی دەگرت خەڵکی بەرە و ڕووی هەڵپەیان بوو پێغەمبەر ( ﷺ ) فەرمووی : چیتانە ؟ وتیان ئاومان نییە بۆ دەست نوێژو خواردنەوە جگە لەوەی لەبەر دەستتدایە پێغەمبەر ( ﷺ ) دەستی خستە ناو ئاوەکە و ئاویش لە نێو پە نجەکانیەوە وەك کانیاو دەتەقی ئێمەش ئاومان

---

(413) پوختەی صەحیحی بوخاری لاپەڕە ٧٧ .

خواردەوە و دەست نوێژمان گرت وتم : چەند کەس دەبوون ؟ وتی : ئەگەر سەد هەزاریش بووینایە بەشی دەکردین ئێمە پانزە سەدی بووین [٤١٤]

الله أکبر لەو موعجیزە گەورە و بەناو بانگە سوپاس و ستایشی بێ پایان بۆ خوای گەورە وە درووود بۆ گیانی پاکی پێغەمبەری پایەداری ئیسلام ( ﷺ ) .

**واخر دعوانا ان الحمد لله رب العالمين**

**وصلى الله على حبيبنا محمد وعلى آله وصحبه وسلم**

(٤١٤) موسلیم هێناویەتی لە ( البداية والنهاية ج٦ ص٩٦ ) دا وا هاتووە ئەبوو نەعیم لە (الدلائل ص١٤٤ ) و ئیبن سەعد ( ج٢ ص٩٨ ) بەو واتایە لێوەی هێناوە

# سەرچاوەکان

١ـ قورئانی پیرۆز .

٢ـ پوختەی تەفسیری قورئان / مامۆستا موحەممەد بامۆکی .

٣ـ پوختە صەحیحی بوخاری / وەرگێڕانی لیژنەیەك .

٤ـ پوختەی صەحیحی موسلیم / تألیف زکی الدین عبدالعظیم عبدالتوی المنذری / وەرگێڕانی لیژنەیەك .

٥ـ التاج الجامع للاصول فی احادیث الرسول ( ﷺ ) داندراوی مامۆستا شێخ مەنصور علی ناصف / وەرگێڕانی نوری فارس حەمە خان چاپی چوارەم بەیروت ـ لوبنان .

٦ـ مختصر صحیح البخاري / دانراوی أبی العباس زین الدین الزبیدی / وەرگێڕانی نوری فارس حەمە خان .

٧ـ معجزات ودلائل النبوة سیدالانباء والمرسلین ( ﷺ )/ تألیف یوسف محمد فارح یوسف.

٨ـ السیرة النبویة والمعجزات / للقاضی الشیخ محمد بن أحمد كنعان .

٩ـ معجزات الرسول ( ﷺ ) / الدكتور مصطفی مراد كلیة الدعوة جامیعة الأزهر .

١٠- موسوعة معجزات النبي (ﷺ) / امام الدعاة فضيلة الشيخ محمد متولى الشعراوي .

١١- صحيح معجزات النبي (ﷺ) /أبي عمر محمد عبدالملك الزغبي .

١٢- حياة السعداء / أعدها أبو اسلام صالح بن طه عبدالواحيد .

١٣- الشفا بتعريف حقوق المصطفى/للقاضي عياض أبي الفضل عياض بن موسى بن عياض.

١٤- دلائل النبوة / بقلم سعيد بن عبدالقادر باشنفر .

١٥- زاد المعاد في هدى خير العباد / ابن القيم الجوزية محقق على منهج العلامة الشيخ محمد ناصرالدين الالبانى.

١٦- الصحيح المسند من دلائل النبوة / تأليف أبى عبدالرحمن مقبل بن هادى .

١٧- الروضة البهية فى معجزات النبي (ﷺ) والشمائل المحمد ية / اعداد الدكتور أحمد مصطفى متولى .

١٨- دلائل النبوة فى ضوء السنة / الدكتور أحمد محمود أحمد شيمي.

١٩- ژیانی ئازیزمان (ﷺ) / نووسینی مامۆستا حەبیب موحەممەد سەعید .

٢٠- حياة الصحابة كاندهلوي / تەحقیقی فەرموودەکان شێخ موحەممەد ناصرالدين ئەلبانی / وەرگێڕانی نیهاد جەلال .

٢١ـ موعجیزات ئەحمەدی / بەدیع و ززەمان سەعیدی نوورسی وەرگێڕانی فاروق ڕەسوڵ یەحیا.

٢٢ـ نوسراوەکانی ئەندازیار عوسمان موحەممەد ڕەشید .

٢٣ـ کۆیاسەکانی میحراب / مامۆستا شەماڵ عەبدوررەحمان موفتی .

## لە گەڵ چەندین سەرچاوەی تر

# ناوەرۆك




خوێنەری بەڕێز :

لەم کتێبەدا ٣٠٠ موعجیزە لە موعجیزە گەورەو بەناوبانگەکانی پێغەمبەری ئیسلام (ﷺ) خراونەتەڕوو لە فەرموودە صەحیحەکاندا لە چەندین بواری جۆراوجۆردا کە هەریەکێك لەو موعجیزانە خۆی لەخۆیدا گەورەترین بەڵگەو نیشانەیە لەسەر ڕاست و دروستی پیپێغەمبەرایەتی ئەم پێغەمبەرە پایەدارە(ﷺ) جا هیوادارم ئەم موعجیزانە زیاتر ببنە مایەی دڵخۆش بوون و پتەوبوونی بڕوای بڕواداران و بەڵگەیەکی زۆر گەورەش بن بۆ ئەو کەسانەی کە لە ڕێبازی ئەو پێغەمبەرە(ﷺ) دوورن ببنە هۆی ڕەواندنەوەی گومانی ناو دڵەکانیان و ئاشنابوونیان بە ڕێبازی سەرفرازی و بەختەوەری ئیسلام.



نرخی ( ٧٠٠٠) دینارە

ژمارەی سپاردن ( ٦٩٢ )